لەم ژمارەیەدا: ـ




رۆشنبیری نوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی یە
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
دەری دەکات

سەرەکی نووسین
مصلح جەلالی
●
سکرتیری نووسین
مختار فائق عبدالقادر

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية/ ساحة الخلاني بغداد
تەلەفون 8875795 پێنج خەتە

هونەرمەند محمد عارف نەخشەی بەرگی دەرەوەی کێشاوە
دەرهێنانی هونەری: عبدالقادر علی مردان

چەقۆکەش و کۆنە ساواکی و پاشماوەی دەرەبەگ و پیاو خراپان تێیدا کۆبونەوە. .

**لەشکری پاسداران پێویست بە لێدوان ناکات لە سەری، ئەوەندەی کە لە زاری ئەمو ئەو لە بارەیانەوە بیستراوە یان بەرچاو کەوتووە بەسە بۆ ناسینی ڕەووشت و ماهیەتی دڕندەیەتیو دژی خەڵکی ئەو لەشکرە.**

ڕیژیمی ئاخوندی یەك لە دوای یەك کەوتە شەلکوت کردن و شەلم کوێرم ناپاریزم، چوبەگژ تەواوی ڕیکخراوو کۆڕو کۆمەڵ و تاقمە سیاسی یەکانی ئێراندا، تاکو کار گەیشتە ئەورادەیە خەڵك بە ناچاری چەکیان لێ هەلگرتن و بەرەو رویان بەنەوە. . بە جورەك کە لە زوربەی ناوچەکانی ئێراندا بە گشتی و کوردستانی ئێران بە تایبەتی چەندان ڕاپەڕین و شورش دەستی پێکرد کە ئەو سەری دیار نیە.

دیسانەوە بە سەرکوتکردنی خەڵکەوە نەوەستان، تەنانەت کەوتنە پەلامار دانی شارو شاروچکەو لادێو کێڵگەو مەزراکان و بیانووی ئاشکرایان بە خەڵکی بێ دیفاع دەگرت. . لەگەل توندو تیژی باری ڕیژێمدا بەرەی ئەپوزیسیۆنی خەڵك بەهیز تر دەبو، ئەمانە هەموو لە لایەك لە لایەکی تریشەوە دادگا نیظامیو پاسداری یەکانی ڕیژێم کەوتنە هەلواسینی خەڵك و کوشتن وگرتن و زیندان کردنی ئەو کەسانەی کە بە نێوی نیشتمان پەرستی یەوە کاریان دەکرد. . بە هەزاران ئەفسەرو دەرەجەدارو پزیشك و ئەندازیارو نوسەرو ڕوشنفیکرو کارگەرو جوتیارو خەڵکی هەمە جورەی تریان بە تاوانی سەرپێچی کردن لە ڕیژیم و کودتا ساز کردنەوە تیرباران دەکرد. . بە هەزاران منداڵیان وەبەر دایك دەبری، هەزاران مەمکی ئافرەتیان بڕیو لاشەکانیان بە دزی کەسوکارە کانیانەوە لە نێو سیاچاڵەکاندا دەشاردەوەو سەرنیگونیان دەکردن. زیندانی ئەڤین و مەیدانی بەناو ئینقیلاب دو شاهیدی موعتەبەری ئەم ڕوداوانەن.

ئەوەی خاڵخاڵی کوشتی کوژرا، ئەوەی لە دەستی وی دەربازبو گیرودەی دەستی پاسدارو بەسیج وجاش و کرێگرتەکانی تری ڕیژیم بو. . هەرکەسە بۆخۆی سوڵتانێك بو حوکمی بەسەر دەوروبەری خۆیدا دەکرد، کەسێك سۆری کەسێکی دی نەدەخوێندەوە. .

کارخانەکان بە زۆری وێران بوون، زوربەی قوتابخانەکان داخران، بە سەدان هەزار کارگەر بێ ئیش و کار مانەوە، ئابوری ولات بە تەواوی دوچاری ئالۆزیو شکستی دارایی بوو، لە سەری هەرکۆڵانێکدا پاسگایەکی پاسداریان بەسیج یان جاش وکرێگرتەی تریان قوت کردووە. پاسدار دەستی بۆهەموکاروبارێك درێژ دەکرد، دەسکاریێ واجباتی نیوهەمودایەرەکانی ڕیژیمیان دەکرد. . تا کارگەیشتە ئەورادەیە لەسەر قەراخی خیابانەکان ئافرەتیان تەمبێ دەکرد. . گەرانی کوڕو کچ پێکەوە، سەرکوتکردنی ئافرەت، جل وبەرگی ئەلموّدە، گۆرانی دڵداری، فلیمی کۆمەلایەتیو عاطفی، ئالەتی موسیقا، کەرەسەی یاری کردن وەکو شەترنج وتاولەو دومینە، هەموجۆرە خواردنەوەیەك، فۆرمی جل وبەرگی وولاتان «ڕۆژهەلات بێ یان ڕۆژ ئاوا». . . ئەمانەو چەندان شتی تری بەمجۆرە لە تەواوی شارو شاروچکەکانی ولاتدا ـ لەو شوێنانەی کە پاسدارەکان دەستەلاتیان تێیدا هەیە ـ بە ڕەسمیەت قەدەغە کرا.

هەر دادگایەك، یان هەر پاسگایەکی پاسداران لە سەری هەر کۆڵانێکدا، یان لەهەر شوێنێکدا هەبن، بۆ خۆیان دەولەتێك بون لەنێو ڕیژیمێکی دواکەوتوانەدا دەستیان دەوەشاند. . حوکم کەوتە دەست هەزاران ئاخوندی بێ تەجروبەو ناشارەزا. وەزعی ولات بە جورەك خراپ بو کە لە باسکردن نایەت.

**ئێمە نامانەوێ لەم وتارە بەر باخەلیەدا لە هەموورو کارە دواکەوتوییەکانی نێو دەزگاو دایەرەکانی دەولەت بکۆڵینەوە، بەڵکو تەنیا چەند ڕوداوێکی بچووکی ناوچەیی باس دەکەین کە لە لای خەڵکی ئێران شاریاوە نیەو دەمانەوی هەندەرانیش بەوجورم و تاوانانەی ڕیژێمی ئاخوندی تارادەیەك شارەزابن.**

من خۆم لە سەرەتـای هاتنـە سەرکـاری ریـژێمی ئاخـونـدی یەوە قوتـابی دانشگا بوم لە بەشی ئەندازیاری دەمخـوێنـد، دو هاواڵی تریشم کە لە بەشی کشتـوکـاڵی دانشگا بون رۆژێك لەناكاو پاسدار یەخەیان گرتین کە بە زۆر بمـانکـەنـە بەسیـج و بمان نێرن بۆ یەکێك لە جەبهە نارەواکـانی شەڕی نێـوان ئێـران و عیراق . . ئێمەش وەکو هەزاران هەزاری تر ئەم کارەمـــان بە کارێـــکـی نارەواو نا عادیـــلانـــە زانی ، لەبـەر ئەوەی لە دانشگـا هەڵاتین ولە یەکێك لە گەڕەکـەکـانی تارانـدا بە هۆی چەند دۆست و برادەرێکەوە ئۆتاقێکمان گرت و سەرنجی وەزعی وڵاتمان دەدا . .

ماوەیـەك چاوەڕوانی باش بونی باری وەزعمان دەکرد، کە دڵنیا بوین تاکو ریژێمی ئاخوندی لەوڵاتدا بمێنێ باری ناو خۆی وڵات لەوە شێـواوتر دەبێ ، ئینجـا لەگەل یەکێك لە هاواڵـەکـانم گەڕانیکی پر لە سەرنجمـان بە هەنـدێـك لە ناوچـەکانی ئێراندا کرد، بە تایبەتی لە کوردستان و ئەوەی بە چاو دەمان بینی یان لە خەڵك دەمان بیست لای خۆمان یادداشتمان دەکردو وەکو خەبەر نیگارێکی رۆژنامە نوسی هەندێك روداوی سەیرمان لە دەفتەری بەر باخەڵەکەماندا نوسی یـەوە کە سێ رواڵـەتی ناڵـەباری ریژێمی ئاخوندی ئێـران لە روی کۆمـەڵایـەتی و ئابـوری و سیـاسی یـەوە دەر دەبـــرن . . لەم نامـــیلکـــە بچـــوکـــەدا تەنیـــا بەشـــە کۆمەڵایەتی یەکەی دەخەینە پێش چاو ئەگەر بۆمان کرا ئەوا بەشـە ئابـوری و سیـاسی یـەکەشی یەك لە دوای یەك بڵاو دەکـەینـەوە. پێشـەکی سوپـاسی هەموخوێندەوارانی ئەم وتارە دەکەین .

**● شەوێکیـان دەستـەیەك پاسدار هەڵدەکوتنە سەر بەشی ناوخۆیی کولیجی کشتـوکـاڵ لە تاران دەست دەکـەن بە تەفتیش و پشکنینی قوتابی یەکان . . دو قوتابی هاواڵم کە نیـوێـان خوسرەوی ئەمینی و عبدالرحمانی شەرەفیابی بو هەر یەکـەیـان نامەیەکی بە کوردی نوسراویان لەکن گیرا کە لە خزم و کەس و کارانیـانـەوە بۆیـان هاتبـو، هەر ئەو شەوە بردیـــانن بۆ پاسگـــایـــەکی پاســداران و سبـەینی لە دادگای نا نظامی پاسراراندا به مەرگ حوکم دران .**

●بازرگانێکی هاواڵم بۆی گێرامەوە کوتی :
لەگـەل هاتنـە سەرکـاری ریژێمی خومەینی دا دو کورم لە دانشگا دەیان خوێند ، ماوەیەك لە دانشگا دەرکران ، پاش ئەو ماوەیـە بە نێـوی دەستـەی موجاهیدینەوە گیران و پاش ماوەیـــەك بەرەڵـلا کران ، زۆری پێ نەچـوشەوێکیـان دو ژاندارم لەگەل دەستەیەك پاسداردا وە ژ ور کەوتن ، داوای کورەکـانیـان دەکـرد، ئێمـەش لە پشتـە بانـەوە وە دەرمان کردن ، هەر جۆرەك بو توانیمان لە وەلاتی ئێران دەربازیان بکـەین ، زۆری نەخایاند پاش چەند رۆژێك دەستەیەکی دی لە نیـوەڕۆیـەکدا وە ژ ور کەوتن ، هەموکون و قوژ بنی ماڵـەکـەیان پشکنی هیچی قەدەغەیان بۆنەدوزرایەوە ، دو کچم لەو کاتـەدا لە قوتابخانە دەگەرانەوە ، هەردوکیان باڵ بەست کردن و لەگەل خۆیانا بردنیانن بۆ زیندانی ئەڤین ، پێش چەنـد رۆژێـك هەواڵمـان زانی کە یەکێکیان لە ژێر ئازارو ئەشکـــەنجـەدا مردوەو ئەویتـریـان هێشتـا شوکـور سەلامـەتـە . هەمـوی مانگێکی لێ وەر نەگەرا لە دایەرەی سەبـت داوا کرام دوخـانـــوی گەورەم هەبــون دەستیـــان بەســـەرا گیـــراو کرانـە پاسگـــای پاســراران و بەسیـج . . ئیستـاش هەر روژە نەروژەك لە لایـەن پاسرارانەوە دێن بە شوێنما پێم دەلین : ئەگەر کورەکانت نەگەرێنەوە بۆوەلات ئەوا دەست بەســەر هەمـو ماڵ و ملکـەکانتا دەگرین . . بە بیانوی ئەوەوە گوایە کورەکانم لە دەرەوەی وڵات تەبلیغات دەکەن پولێکی زۆریان لێ سەندم .

● لە یەکێك لە میوانخانەکانی سەر روخی خیابانی «ناصر خوسـرەو» بوم ، میـوانخـانـەکـە زۆر شپرزەبوو ، زوربەی ئوتـاقـەکـانی نیـوە وێران بون ، چەند نهومێکی بە تەواوی چۆڵ بوبـو، لە مودیـری ئیـدارەی میوانخانەکەم پرسی : ئەم میـــوانخـانـەیـە بەوگەورەیی و فراوانی یـەولەوشوێنـە قەرەبـاڵغـەدا بۆچی بەوجۆرە وێران بووە؟ کوتی : خاوەنی ئەم میـوانخـانـەیـە کاراژ یکی وچەند خانوی تری هەیە ، کاتی خۆی ژنێکی گۆرانی بێـژ ی مارە کردوە کە گۆرانی دڵـداری لە رادیـودا کوتـوە ، لەسـەر ئەوە ژنـەکـەی گیـراو

خۆیشی رایکـرد بۆ دەرەوە، ئیستا هەمو مڵك و ماڵ و خانو بەرەکـانی بۆتـە هینی دەوڵـەت و دەستیان بەسەرا گیراوە، بۆیە ئەمەش بەو جۆرە وێران بووە بێ خاوەنە.

● هاواڵێکم بۆی باس کردم کوتی:

مانگی رەمـەزانی ساڵی پارەکـە لە ئوتوبوسێکدا بوم لە تەوریـزەوە بۆ تاران دەگـەرامەوە، شوفێرەکە لە ماشینەکەدا نەواری دڵـداری و هەڵپـەرکێی لێ دەدا، تومـەس دو پاسدار لە نێو ماشینەکەدان ئاگایان لەم گۆرانی و بەزمەیە، کە گەیشتینـە یەکێـك لە نوختـەی تەفتیش سەر رێگـاکـە پاسدارەکان شوفێرەکەیان دابەزانەو دەستیگریان کرد، هەر چەنـد هاوارمـان کرد کە بەرەڵـلای بکـەن نەیـانکرد، ئەو شەوە تا سبـەینی نیوەرۆ دوا لەو نوختەی تەفتیشە وە گیریان هینـاین، زیـاد لەوەش دەستیـان کرد بە پشکینی ساك و کیسەکانی ناو ماشینەکەو ئینجا هەمومانیان گێرایەوە بۆ تەوریز.

**● کاتێـك راپـەرینی کوردستـانی ئیـران دەستی پێکـرد ریـژیم لە هەر شارێکـدا بەرگیری لێ بکرابایە شارەکەی وێـران دەکـرد، لە شاری سنـەو سەقـز و مەهـابادو چەند شارۆچکـەیـەکی تردا زیـاد لە چوار هەزار کەسی بێ دیفـاعیـان کوشت و بە زنجیـری تانگەکان دەیانکردن بە ژێرەوە. جگە لەوەش لە دەرەوەی شارەکان لە نزیك هەر ئاواییـەك تەقـەیـان لە ستـونەکان ئەرتەش بکردبایە ئەو ناوەیـان بە قومپـارە دائـەبێـژاو هەرچی کەسێکی لاویـان بگرتبایە دەیان کوشت و ئەوانەش پیرەمیرد بونایە زیندانی دەکـران، تەنـانـەت لە زۆر شوێن و جێگـادا ژنـانیـان دەستەجەمعی زیندانی دەکرد.**

● مـاشینێکی ئەرتـەش لە شاری بانـە بەرێ دەکـەوێت ئازوقـە بۆ سەنگـەرەکـانی کێـوی «ئـاردبـەبـا» ببـات، لە کوڵانێکدا سەلکێك سیب زەمینی لی دەکەوێتە خوارەوە، منـداڵێـك هەر لەوێـدا دەمـوودەس سیب زەمینی یـەکـە هەڵدەگری و فرێی دەداتەوە بۆ ناو ماشینەکە، سوارەکانی ناو ماشینـەکـە وا دەزانن نارنجـۆکیـان بۆ فرێ دەدەن دەمودەس دەکەونە دەستەرێژ کردن بەناو خەڵکەکەدا چەند ژ ن و منـداڵێـك کە لە کوڵانـەکـەدا دەبـن زۆرزیـان دەکوژرێن و هەندیکیشیان لێ بریندار دەبێت.

ـ شوانێـك دەدۆزرێتـەوەکـە پارەی عیـراقی پێ بـوو. . عەجەباڵە کوێیهیناوە.

کابـرایـەکی سەقـزی گیـراکـە گوایـە پیـاوێکی عیـراقی میـوانیبـوە. . لەوانـەیـە پرسیارێك پەیدابێ. . ئایا ئەو پیاوە عیراقییە چیئەکرد لە سەقز؟

**● لە رستـورانێك لە سنە رەسمی یەکێك لە ئایەتوڵلاکان بە دیـوارەکـەوە دەبێت، لایـەکی رەسمەکە بەر دەبێتەوە، پاسدار بەمە دەزانن کابرای خاوەن رستوران دەگرن پاش ئەوەی چەنـد شەو لە زینـدانی پاسداران دەمینیتەوە پارەو پوڵێکی زیادی لێ دەستینن و تا ئیستا بێ سەرو شوێنە.**

● لە دەرگـای یەکێـك لە مقـەری پاسـدارەکـان لە تاران کابـرایـەکیـان پێـوەند کردبو، بە زنجیر بەستبویانەوە، هەر کەس بەلایدا بچوبا دەبوا رەجمی بکردبایە، لە یەکێکمان پرسـی ئەو کابـرایـە چی کردوە، کوتـی: ئەوە دوکـانی عەکـاسی (ستـودیو)ی هەیە، وێنەی کیژ ولاتی بە سەری قوتییەوە گرتوە بۆ قوتابخانە.

**● نامـدار غولام ناوێـکیـان لە مەیـدانـی ئینقیـلاب چوارمێخە کێشا بو، هەرکەس بەوێدا دەرۆیشت دەبوا تفێکی لێ کردیـایـە. یەکێـك لە پاسـدارەکـان کوتی: نامـدار غولام چوار شوشـە ئابجـو (بیرە) لە دوکانەکەیدا گیـراوە، سبحـەینی تیرەباران دەکرێ، کێ قەرزو قوڵەی لایەتی قەواڵەکانی بداتە دادگای پاسداران تاکو لێی وەر بگرنەوە.**

● کابرایەکیان لە دادگای پاسداران بە مەرگ مەحکوم کرد بێ ئەوەی هیـچ بەڵگـەو شایـەتێکی لەسەر بێت، مودیری دادگـا کوتی: ئێمە هەر دەتکوژین ئەگەر تاوانبار بێت ئەوا سزای خۆت وەرگـرتـوە، ئەگـەر بێ تاوانـیش بێت ئەوا دەچێتـە بەهـەشت لە هەمـوو گیـرمەو کێشەیەکی قیامەت رزگارت دەبیت.

**● ئافرەتێکی رەشپوشم دیت لە مەیدانی «تجریش» هەمو روژان تا ئێـوارە لەبن دارتـەلێکی دەگریا، ئەقڵی تێك چو**

**بو، رۆژێـك كوتم دایــه ئەوە چ دەكـەی لێـرە؟ بۆچ وا دەگــریت؟ كوتی: حبیب الله‌ی كورم ئا لێـرە تیـرەبـاران كرا، كوتم لەســەر چی؟ كوتی: داوایــان لێكــرد ببتـە بەسیـج و نەبـو. ئیتـر بێ سێ‌و دو كردنـەوە دایـانـە بەر دەستدریژو كوشتیان.**

● له بەردەم دادگـای ژماره «4»ی پاسدارانـدا دوپاسدارم دیت دەستی لاوێكیان كەلەبچە كردبو، پێ دەچو لە دادگا دەهـاتنـە دەرێ‌و دادگـا بریـاری بەرەڵـلا كردنی لاوەكەی دابـو. زۆر هەوڵیـان دا كەڵـەبچـەكـە لە دەستی بكـەنەوە نەدەكـرایەوە. لەو كاتەدا پاسدارەكانی هاورێ یان لە نێو ماشینـەكـەوە بانگیـان كردن، ئەمـانیش یەكێكیان بە پەلە نیـزەی تفـەنگـەكەی توند داوەشان ودەستی كابرای بری‌و كە لە بچـەكــەی لێ دەرهینـاو سواری ماشینـەكـە بون، كابــرایــەكی سەوزە فروش لەویـدا بوكوتی: كورە خولاَ غەزەبتـان لێ بگرێ ئەوە دەستی ئەو لاوەتان بۆچی بری؟ لە وەلامدا تەقەیان لە كابرای سەوزە فروش كرد ئەویشیان بریندار كرد.

**● له وتــوویــژێكی چاپــەمــەنیــانــەدا بە یەكێـك لە ئایـەتـوڵلاكانیان كوت جەناب سێ گیر و گرفتی گەورە لە وڵاتەدا هەیە وەكو:**

**برسێتی، بێكاری، نەخۆشی..**

**زۆر لە سەر خۆ جەنـابی نا ئایـەتـوڵـلاووتی: ئەمانە ئاسـانن، چارەسـەر كردنی ئەمـانە كارێكی گران نیە.. برسی‌یـەكـان هەمـو زینـدانی بكـەن تاكـو لە زیندان تێر بخـۆن، بێكـارەكـان هەمـویـان بنێـر ن بۆ جەبهـەكـانی جەنگ، نەخوشەكانیش بەریز تیرەباران بكەن.. یەكێك لە هەواڵنوسەكانی چاپەمەنی كوتی:**

**ئەی جەناب چارەسەری دیكە نیە؟ ئایەتوڵلا ووتی! ئیمە چارەسەری رادیكالی‌یانە دەكەین.**

● مەلایــەك تەمــەنـی 85 ساڵ دەبێـت لە گونــدیكی بچكـولانـەی دەوروبـەری شاری بانـە، پاسـداروجاش دەیگـرن، لە یەكێـك لە خیابانەكانی شاری بانە لەبەرچاو خەڵكێكی زۆردا پێ‌ی دەڵێن: مەلا حەمەدەمین ئەگەر پێ لە تاوانــی خۆت دەنــیێ‌ی كە موســڵمــان نیـت ئەوا ناتكــوژین.. مەلا حەمـەدەمین دەڵێت من موسڵمـانم، هەر لەوێدا تیرەبارانی دەكەن و دەیكوژن.

**● ستــونــێــكــی زۆر لە شاری بانــەوە دەرۆشـت بۆ سەردەشت لە رێگـا لە چەنـد لایەكەوە بەری لێ دەگیراو تەقــەی لێ دەكــرا، لەمبـەرو ئەو بەری جادەكـە چەنـد ئاوایـیـەكی خنجیـلانە هەبو سەربازو پاسدارەكان بە هەر ئاواییــەك دەگــەیشتنی دەمـودەس دەیـان سوتـانن.. وا رێكـەوت گەیشتنـە ئاوایی «قـوخـان» كە لەســەر روخی جادەكـە بو، خانوەكانی نیزیك جادەكەیان سوتاندو چوار خانـو كە لە پشت ئاواییــەوە بوو خەڵكـەكانی رایان كردبو نەیـان سوتـانن.. دوابـەدوای ستـونـەكـەدا سەرهەنگی ستـونـەكە كاتێك چاوی بە خانوە نەسوتاوەكان دەكەوێت تورە دەبیــت، دەڵـیــت: چەنــد جارم پێ گوتـن هیــچ خانـویەك مەهێڵنەوە هەمویان دەبێ بسوتێن، هەر لەویدا فەرمــانی سوتـانـدنی ئەو چەنـد خانـوە پاشمـاوەیـە دەر دەكات و دەمودەس دەیان سوتێنن.**

● لە نوختــەی تەفـتـیشی قەراخ شاری «دیــوانــدەرە» كابرایەكی لادەیی دەگرن جوتێك پێڵاوی لاستیكی باتای پێ‌دەبێت، هەرچــەنــد هاوار دەكــات دەڵێت بۆخۆمم سەنـدوە دەڵێن باشـە پێڵاوە تازەكان بكەرە پێت وكۆنەكان بەجێ بهێڵە.. كابـرا بۆكورێكی خۆی سەندبو، هەرچە دەكــات ناچێتــە پێ‌ی، ناچــار راستی دەلیت، دەڵی بۆ كورەكـەمم سەنـدوە، كابـرا بەرەڵـلا ناكـەن دەڵێن دەبێت كورەكـەت بێت بۆئێـرە ئەوپێـلاوانـە لەپێ بكات، چەند رۆژێـك كابـرا لە زینـدانی پاسـداران دەهێڵینەوە، ناچار كورەكـەی دەچێت بۆلای كە دەگـاتـە بەرەوە پاسـدارەكان دەیگــرن ودەی نێـرن بۆشاری سەقـز لەوێ پاش چەنـد مانگێـك زینـدانی دەینێرن بۆرەزائیە «ورمیە» پاش ساڵ و نیوێك بە زامن بەرەڵلای دەكەن و سەدوچل هەزار تومانی جەزا لێ دەستێنن.

**● شەوێـك دەستـەیەك پاسدار و بەسیج هەڵدەكوتنە سەر ئاوایی «دادانە» لە نێزیك شاری سنە، خەڵكی ئاوایی كۆ**

دەکەنەوەو ناو نوسیان دەکەن، کابرایەك لەو کاتەدا لەماڵ نابێت کوڕێکی چواردە ساڵانی دەبێت کوڕەکەی دەگرن و دەیبەن بۆ زیندانی پاسداران لە شاری سنە بە نیۆی دژی ئینقلاب دەدرێتە قەڵەم، کاتێك بابی لە سەفەر دەگەڕیتەوە شوێنی دەکەوێت بۆ شاری سنە، پێی دەڵێن لە ئوستانی رەزائیەیە، دەچێت بۆ رەزائیە، پێی دەڵێن گەڕاوەتەوە بۆ سنە. . کە دێتەوە سنە پێی دەڵێن ناردومانە بۆ هەمەدان، لەوێ پێی دەڵێن لە سوپای پاسدرانی کرماشان زیندانی کراوە، دەچێت بۆ ئەوێ دەڵێن نیۆی چ بو؟

دەڵێت غەفوری رحیمیان، دەڵێن ئەگەر بەو نیۆە بووە بە دویدا مەگەڕێ. .

● شەوێکی زستان لە ئوتاقێك بوم لە ئوتێل «هایت» لە نهۆمی چواردە کە زۆر لە زیندانی ئەڤینەوە نیزیکە، لە تاریك و رونی بەری بەیاندا دو دەستدرێژی گەورەم بەر گوێ کەوت کە لە زیندانی ئەڤینەوە تەقە دەکرا، بە یەکێك لە شاگردەکانی ئوتێلەکەم کوت: ئەوە چ بو؟

کوتی: هیچ نیە، ئەوە هەمو شەوێك هەیە کوتم: دەبا بزانم. . کوتی: هەمو شەو لەم کاتەدا لە زیندانی ئەڤین خەڵك تیرەباران دەکەن، کەوتینە بەیانی خەبەرمان پێ گەیشت کە ئەو شەوە حەڤدە کچی تەمەن 14 ـ 22 ساڵانیان لە زیندانی ئەڤین بە تاوانی ئەوەی دژی ئینقلابن تیرە باران کراون. . یەکێك لە میوانەکانی ئوتێلەکە هەر لەویدا گوتی: من کوڕێك ودو کچم لە ئەڤین تیرەباران کران، تا ئیستا لاشەکانیان پێ نەداومەتەوە. . یەکێك لە شاگردەکانی ئوتێلەکە گوتی:

من هەفتەی رابوردو بابم لە ئەڤین تیرەباران کرا.

● لە پادگان «هوردوگا»ی مەهاباەدەوە ناو شاری مەهابادیان دایە بەر تۆپ، بێ دەست پاراستن هەمو گەرەکەکانیان قومپارە باران کرد وایان لێکرد خانو نەمابو گولەتۆپێکی وەبەر نەکەوێت، خەڵکی لە ژێر زەمینیەکاندا خۆیان دەشاردەوە، زۆر کەسی بە ماڵ و خێزانەوە رایانکرد بۆ لادێکان دەرەوەی شار، دوکان و بازار نەما، ئیدارەکانی دەوڵەت لەکار وەستان. . خیابانەکان وێران بون، چەندان ماشین و ئوتوبوس و تراکتور شکان بەسەر یەکدا، خەڵکی شار کۆمەڵێکیان رێك خست کە بچن بۆ لای سەرهەنگ و تێی بگەیەنن کە شارەکە نیوە وێران بووە بەڵکو ئیتر واز لەم گولە تۆپ بارانە بهێنن رۆژی دووەم تۆپ بارانەکە راوەستا، خەڵکی بە فرسەتیان زانی رۆیشتن بۆ لای سەرهەنگ و پێیان گوت نیوەی شارکە وێران بووە، سەرهەنگ کە ئەمەی بیست تورە بو گوتی: چۆرە نیوەی وێران بووە؟ من وا دەزانم هەموی وێران بوە بۆیە تۆپ بارانەکەم راوەستانەوە هەر لەوێدا فەرمانی دا دەست بکەنەوە بە تۆپ بارانی شارە دو رۆژی تر درێژەی کێشا تاکو سەرهەنگ دڵی ئاوی خواردەوە.

● رۆژێك هەر لە شاری مەهاباد، پاسداروجاش و بەسیج کەوتنە ناو شارەوە، شەل و کوێرم ناپارێزم کەوتنە وێزەی خەڵك و 59 کەسی بێ گوناهیان لە شارەکەدا کوشت.

● کابرایەکی نانەوا لە سەقز سێ کوڕی دەبێت لە نانەواخانەکەدا کار دەکەن.

شەوێکیان ئیعلامیەیەك بەسەر روکاری دەرەوەی دوکانەکەی دادەکوتن، بەیانی پاسداران دەی بینن کابراو هەر سێ کوڕەکەی دەگرن و بێ سەرو شوێن دەیان بەن پاش ماوەیەك هەواڵیان هاتەوە کە دوانیان حوکم دراون و یەکێکیان کوژراوەو ئەوی تریان بێ سەرو شوێنە.

● لە ناوچەی بۆکان لەنیزیك ئاوایی «سەراو سەرچاوە» پیرەمێردێك وژنەکەی درەوی گەنمیان دەکرد، لەو کاتەدا ستونێکی ئەرتەش و پاسداران لە شەرێکدا لە نیزیك بۆکانەوە لەگەڵ کوردەکاندا تێك شکابون بە هەڵاتووی دەگەڕانەوە بەرەو سەقز، کە گەیشتنە لای کابران پیرەمێردە و ژنەکەی هەر لە جێدا هەردوکیان کوشتن . . .

● لە سەر جادەی نێوان رەزائیەو مەهاباد لە قەراخ بەحری خوێکە دا دەستەیەك پاسدار کابرایەکی لادێی دەگرن تەنەکەیەك نەوتی بە کۆڵەوە دەبێت و دەیەوێت

بیباتەوە بۆ ماڵەوە، دوای پشکنین و دەست کردن بە باخەڵەکانیا هەر بە تەنەکە نەوتەکەوە ئاگری تێ بەردەدەن و دەیسوتێنن، کە بو بە قەرەبروت ئینجا لاشە سوتاوەکەی فرێ دەدەنە ناو بەحری خوێ کەوە.

● هەر لەو دەوروبەرەدا دەبێت کابرایەکی سۆفی لادێیی دەگرن هەندیك قەندو چای بە کۆڵەوە دەبێ ئاگر لە ریشی بەر دەدەن و کاتێك ریشی دەسوتێ بە ئاگرەکەی جگەرە کانیان دا دەگرسێنن

● لە هەر ناوچە یان هەر ئاواییەك شەر لەگەل پاسداران و جاش و بەسیج و ئەرتەش دا بکرابایە، فەورەن هەلیکۆپتەر دئەهات و بێ جیاوازی کردن مەڕو ئاژەڵ و دەشتەوانەکانی ئاواییەکەی ئەدایە بەر رەکبارو موشەك، تەنانەت لە چەندان شوێن دا بە هۆی ئاگری هەلیکۆپتەرە کانەوە ئاگر کەوتوتەوەو چەندان دەشت و دەغل و کێڵگەو مەزراو باخ و ئاوایی سوتاوون.

● پاسدارێك بۆ کابرایەکی گێرابۆوە کوتبووی: ئێمە لە زیندانەکانی ئەڤین وپاسداران، ئەوکچە موجاهیدانەی کە زیندانی دەکرێن بەر لەوەی بیانکوژ ن بەچەند رۆژێك مەمکەکانیان دەبرن و لەبەر هەوای سارد دایان دەنێن بۆ ئەوەی ئیعتیراف بکەن ئینجا دەیانکوژ ن هەروەها کوتبوی: بە دەگمەن هەیە لە هەفتەیەکدا چەندان کیژ وڵە نەکوژ ین وە یان بە نیوە زیندویی زیندە بە چاڵیان نەکەین.. دیسان کوتبوی لاشەی کچە کوژ راوەکان نادرێنەوە بە کەسو کاریان.

● لە سەر رێگان پیرانشەهر و رەزائیە جوتیارێك ئەپشکنن رەسمی خزمێکی بە چەکەوە لە گیرفاندا دەبێت، چەند رۆژێك لە پیرانشەهر دەی هێڵنەوە و دەیخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە پاش ماوەکە دەیبەن بۆ شاری رەزائیە، لەوێ لە زیندانی پاسداران دو هەفتە دەمێنەیتەوە، ئازارێکی زۆری دەدەن دوایی دەی نێرن بۆ دادگای پاسدارانی تەورێز دو پاسدار لەگەڵی دەرۆن، کاتێك بەرەو دادگا دەرۆن پاسدارەکان دەیانەوێ لە شوێنێك دای بنێن و پاش تەواو بونی کارەکەیان سەری لێ بدەنەوەو ئینجا بچن بو دادگا، بیر لەوە دەکەنەوە ئەگەر بە ساغی بەجێی بهێڵن رادەکات، ئەگەر بیبەن بۆ دادگا لەوێ ناچار دەبێت تا دادگا تەواو دەبێت لای بمێننەوە، دەڵێن باشتر وایە لاقێکی بە نیزەی تفەنگەکانمان بشکێنین بۆ ئەوەی تاکو دێینەوە لە جێگای خۆی بێت و نەتوانیت را بکات.. یەکێکیان دەڵێت با تفەنگێکی بە لاقانیەوە بنێن ئەویتریان دەڵێت نا بەو جورە نابێت تا هێزی تیا دەبێت نیزەی تفەنگەکەی بە پشتی لاقیدا دا دەکوتێت و لە بەری پێیەوە دێتە دەرێ، ئینجا پێی دەڵێت ئا لێرە بۆ خۆت دانیشە تا دێینەوە کنت.. پاش ماوەیەك دێنەوە سەری تەماشا دەکەن وەزعی زۆر پەریشانە بەو جورە دەیبەن بۆ دادگا، لە پاسدارەکان دەپرسن بۆچی لاقی ئەم کابرایە شکاوە، دەڵێن ئەوە ویستی لە دەستمان هەڵ بێت و تەقەمان لێکرد.. دادگا لەسەر ئەو راکردنەی حوکمی زیندانی دەدات.

● رەوە جاشێك و دەستەیەك پاسدار دەچنە دێی «ناوە» وردەواڵە فرۆشێك لە قەراخ ئاوایی دەبێت کە دەیان بینێ رادەکات و لە ترسا خۆ دەشارێتەوە، جاش و پاسدار دەکەونە شوێنی، لەناو بێشە چنارێکدا دەی دۆزنەووو دەیگرن.. کۆڵە وردەواڵەکەی دەپشکنن دەستەیەك صابونی عیراقی و دو دەستە شقارتەی تێدا دەبیت پاش لێدانێکی زۆر هەردو باسکی دەبەستن و دەیبەنەوە بۆ باسگای پاسداران و دەڵێن ئەم کابرایە دژ ی ئینقلابەو لە شەردا گرتومانە، هەر بەو تاوانەوە دەدرێت بە دادگای پاسداران و فەرمان کوشتنی دەردەچێت و تیرە باران دەکرێ.

● لە نهۆمی چوارەمی ئەپارتمانێکدا لە نزیك مەیدانی تۆپخانەی کۆنەوە کە ئیستا پێی دەڵێن مەیدانی خومەینی لە تاران دەستەیەك پاسدار دەست دەکەن بە پشکنینی نهۆمەکانی ئەپارتمانەکە، لە ژورێکی چوڵدا کە خاوەنەکەی لە کار دەبێت دەرگای ژورەکە دەشکێنن دەچنە ژورەوە تەختەیەکی یاری تاوڵی و چەند داشێکی یاری شەترنج دەدوزنەوە، بێ ئەوەی رابوەستێ تاکو

خاوەنی ژورەکـە دێتەوە، هەمو کەل و پەل و پێخەفەکانی ژورەکە لە ناوەراستی ژورەکەدا کۆ دەکەنەوەو نەوتی پێدا دەرێژن و ئاوری تێ بەر دەدەن لەو کاتەدا لە ناکاو کابرای خاوەن ئوتاق دێتەوە دەست دەکات بە هاوار کردن یەکێك لە پاسـدارکـان کابـرا روت و قوت دەکاتەوەو ئاور بە قژە سەرییەوە دەنێت، کابرا هەر ئەوەندەی پێ دەکرێ لەناو ئازاری گیـانی لە پەنجـەرەیـەکـەوە خۆی فرێ دەداتـە خوارەوەو دەمرێ.

●سـەرۆکی پاسـدارانی ناوچـەیـەك لە تاران رۆژێکییـان دەچێتـە کارگـەیـەکی قوتـوە پەنیرەوە، لە ناو کارگەرەکاندا چەنـد کارگـەرێکی ئافـرەت دەبن رۆژانە کاریان دەکرد، سەرۆکی پاسـداران ئافـرەتـان بە سەری روتـەوە دەبینێ فەرمـانـی گرتنیـان دەدات و دەیـانبـەن بۆ یەکێـك لە پاسگاکانی پاسداران، لەوێ چەند رۆژێك دەیان هێڵنەوە ئینجا دەیان دەن بە دادگان نیظامی هەر یەکەیان بۆ ماوەی سێ ساڵ زیندانی دەکرێن. سەرۆکی کارگەکەش تەمبێ دەکەن کە بۆچی رێگای بە کارگەری ئافرەت داوە بەسەری روتـەوە لە کارگـەکەیا کار بکەن. ● رۆژێك مەفرەزەیەکی پاسدارو بەسیج لە دامێنی چیای «ئەلبورز» دەگەران، لە سەیـرانگـایـەکـدا چەند لاوێکی دەستە جەمعییان دیت خەریکی سەیـران بون، یەکـدو پارچە ئالەتی مۆسیقایان پێ دەبێت، خاوەن ئالـەتـەکـان دەگـرن و زینـدانییـان دەکـەن و ئەوانی تریش شەلکـوتیلێـدان دەکەن. . پاش ماوەیـەك زینـدانی هەریـەکـە لەو زیندانییانە بە پولێکی زۆر بەرەڵلا دەکەن.

● دەستـەیەك پاسدار خۆ دەکەن بە چیشتخانەیەکدا پاش نەختێـك گەران بەناو چێشتخانەکەدا خاوەنی چێشتخانەو کارگـەرەکـانی دەگـرن بە بیـانـوی ئەوەی گوایـە ئەو مریشکانەی لەو چێشتخانەیەدا دەرخواردی خەڵك دەدرێ لە دەرەوەی وڵات هاتـون و بە رێـگـای ئیسـلامی سەر نەبـراون. . کابـرای خاوەن چێشتخـانـە دەدەنە . دادگاو دادگارەکانیش بە زامن بەرەڵلا دەکەن و چێشتخانەکەش بۆ ماوەی ساڵێك دادەخەن.

● ئاخـونـدێك دەچێتە کیتێبخانەیەك بەرامبەر بە دانشگای تاران، پاش هەنـدێـك گەران بەنـاو بەشـەکـانـی کیتێبخـانـەکـەدا چاوی بە چەنـد کتێبێکی پیشکـەوتـوانە دەکـەوێ لەگـەل چەند گۆڤارێکدا کە رەسمی ئافرەت بە بەرگ هەنـدێـك لە گۆڤـارە کانـەوە دەبێت، دەمودەس بە تەلـەفـۆن سەرۆکی پاسـداری ناوچـەکـە ئاگادار دەکات گوایە بیرو باوەری ژاراوی لە دەرەوە هێنراوە بۆ ناو خۆی وڵات. .

ئەوەنـدەی پێ ناچێت مەفـرەزەیـەکی پاسـدار بە ژورێ دەکـەوون ئەوەنـدەی بۆیـان دەکـرێ کتێب و قاقـەزو پێـداویستی نوسین و گۆڤـارو رۆژنـامـە بە باوەش فرێ دەدەنـە دەرەوەو لەسـەر روخی خیـابـانەکە ئاوری تێ بەر دەدەن. . پاش زەرەرو زیانێکی زۆر لێدان لە کیتێبخانەکە خاوەنـەکـەی باڵ بەست دەکـەن و بە شیـوەیـەکی زۆر ناشیـرین دەیبـەن بۆ زینـدانی پاسـداران و دەرگـای کتێبخـانەکە مۆر دەکەن. . پاش محاکەمە کردنی خاوەن کیتێبخـانـەکـە بە زامن بەرەڵـلا دەکـەن و ئیجـازەی کیتێبخانەکەی لێ دەستێننەوە.

● لە ترمینـاڵ چاوەروانی ئوتـوبوسی هەمەدانمان دەکرد، خەڵکێکی زۆر لە دەوروبەری ماشینـەکـان کۆبوبـونەوە، هەر کەسـە بۆ لایـەك دەرۆشت. . لە ناکـاو خەڵکـەکـە شڵەژا. . چەنـد پاسدارێك کەوتبونە شوێن لاوێکی بەلە باریکـە، هەنـدێـك بەنـاو خەڵکـەکەدا سورانەیانەوە تاکو ناچـار خۆی کرد بە ئوتـاقێکی ترمینـاڵەکەداو دەرگایان لێ گرت و دەسگیر کرا لێدانێکی زۆرو زەبەندیان لێدا نەمان دەزانـی ئەو کارە چ بو کراو چی قەومـاوە، یەکـێـك لە پاسـدارەکـان بە بڵنـدگـۆی ترمیناڵەکە بانگی خەڵکەکەی کرد کوتی: ئەم کابـرایـە لەگـەڵ ئافرەتێکدا قسەی دەکردو پێ دەکەنی، پێدەچێ کارێکی خراپی لەژێر سەردا بێت، ئێـوارە سەعـات 17 لە مەیـدانی ئینقـلاب تەمبێ دەکرێ ئەتوانن بێن بۆ تەماشا کردنی. . ئەمەی گوت و لاوەکەیان لەنێو ماشینێکی سەر کراوەدا بەرەو پاسگانی پاسداران برد.

● رەوە پاسدارێك دەچنە ئاوایی «میك و باینجان» و دەست دەكەن بە پشكینی ماڵە جوتیارەكان و داوای شوناسنامە لە خەڵكی ئاوایی دەكەن . . قەوانە فیشەكێك بە دەست منداڵی ماڵێكەوە دەبینن، باوكی منداڵەكە دەگرن و داوای ئەو تفەنگەی لێ دەكەن ئەو قەوانە فیشەكەی پێ تەقێندراوە، هەرچەند كابرا لێیان دەپاڕێتەوە و سوێند دەخوات كە هیچ جۆرە تفەنگێك شك نابات بڕوای پێ ناكەن، یەكێك لە پاسدارەكان تا هێزی تێدا دەبێت قوناغە تفەنگێك لە سینگی كابرا دەدات و كابرا لەسەر گازی پشت دەخات . . خەڵكی ئاوایی پاكانە بۆ كابرا دەكەن كە هەرگیز چەكی نەبووە و هیچ جورە تفەنگێكی بەكار نەهیناوە . . كوڕێكی كابرا كە لە تەمەنی 16 ساڵیدا دەبێت دەیگرن و باڵ بەستی دەكەن و لەگەل خۆیانا دەیبەن بۆ سەقز پاش ساڵ و نیوێك زیندانی تفەنگێك بە باوكی كوڕەكە دەكرن و ئینجا كوڕەكە بە زامن بەرەڵلا دەكەن .

● هەندێك كوڕوكاڵی ئاوایی «یاكوب ئاوا» لەبەر دیواری مزگەوتی دێكەدا لەبەر خۆرەتاوەكە كۆ دەبنەوە، هەر یەكە باسێك دەگێڕێتەوە، لە پاسگایەكی پاسدارانەوە دیار دەبن، گولەتۆپێكی قومپارەیان بۆ هەڵدەدەن دەكەوێتە ناویانەوە شەش كەسیان لێ دەكوژیت و یازدەش بریندار دەكات، خەڵكی ئاوایی كۆدەبنەوەو دەچنە لای ئەفسەری پاسگاكەو سكاڵای خۆیانی بۆدەكەن، لە وەڵامدا ئەفسەری پاسگاكە دەڵیت: ئەگەر بریندارە كانمان تەسلیم نەكەن ئاواییەكەتان بە تۆپ وێران تر دەكەین . . خەڵكی بە ناچاری برینداركان ذنین بۆپاسگای پاسداران ئەوانیش دەیانخەنە ناو ماشێنێكەوە دەیبەك بۆ هوردوگاكەیان و دەڵێن ئەمانە هەمویان دژی ئینقیلابن و لە شەڕدا دەستگیرمان كردوون، پاش ئەوە هەر بەوتاوانە دەیاندەنە دادگای نیظامی و هەمویان تیرەباران دەكەن، بێ ئەوەی لاشەكانیان بدەنەوە بە كەسوكاریان .

● ئاخوندێك دەچێتە بیمارستانی «خانەوادە لە تاران، پاش گەڕانێك زۆر بە ناو قاوشەكانی بیمارستانەكەدا زوربەی نەخوشەكان لە هوڵێكی گەورە كۆ دەكاتەوەو قسەیان بۆ دەكات، پاش قسە كردنێك زۆر داوایان لێ دەكات هەركەس بە سەر هاتی ژیانی خومەنیی نەزانێ بمینێتەوەو ئەوانی تر بچنەوە جێگان خۆیان و لەسەر قەرەوێڵە كانیان راكشێن . . بەشێكی زۆریان كە ژیانی خومەینی نازانن لە هوڵەكەدا . . دەمێنێتەوە جەنابی ئاخوندیش!

فەرمان بە پارسدارە پاسەوانەكانی بیمارستانەكە دەدات كە هەمویان بكەنە دەرەوەو پێیان دەلیت: هەركەس تا شارەزای بەسەرهاتی ژیانی خومەینی نەبێت رێگای نادرێت جارێكی دی بێتەوە بۆ ئەم بیمارستانە . . . بەو جورە زیاتر لە سەد كەس لەو نەخوشانە لە بیمارستانەكە دەكاتە دەرەوە .

● رەوە پاسدارێك لە ماشێنێكدا دەبی دەگەنە شاروچكەی «قربە» دادەبەزن ، دەچنە دوكانێكەوە رەسمێك دكتور محەمەدی مصدق بە دیواری دوكانەكەوە دەبێت، بەكێك لە پاسدارەكان دەپرسێ خاوەنی ئەو دوكانە كێ یە؟

كابرایەك لەوی دەبێت دەڵێت: لیرە نیە، كاری هەیە ئێوارە ذتیەوە . . ئەوانیش پەلەی رۆشتینی دەكەن كابرای میوانی دوكانەكە دەگرن و لەگەل خۆیان دەیبەن بۆ هەمەدان . . هەرچەند كابرا هاوار دەكا دەڵێت: من هیچ كارێكم بەسەر ئەو رەسمەو ئەو دوكانەوە نیە پیێ دەڵین: ئێمە تۆ لەگەل خۆمان دەبەین و زیندانیت دەكەین هەركات كابرای خاوەن دوكان هاتەوە با بێت بۆزیندانی پاسداران لە هەمەدان ئەو كاتە تۆ بەرەڵلا دەكەین . كابرا چەند مانگێك لە زیندانی دەمینێتەوە دوای ئەوە بە زامن بەرەڵلای دەكەن .

● چەند ئاخوندو پاسدارێك بە قوتابخانەكاندا دەگەڕێن لە تەورێز بۆ ئەوەی ئەو قوتابیانە بنووسن كە دەیانەوێ ببنە بەسیج . . دەچنە قوتابخانەیەكی رەهنماییەوە قوتابیەكان نێوی خۆیان نانوسن و دەڵێن: ئێمە نامانەوێ ببنیە بەسیج و كارمان بەسەر ئەم

مەسەلەیەوە نیە ئاخوندو پاسدار دەیکەنە دەمە قالەو تورە دەبن و ئینجا دەچنە دەرەوە، بۆ سبەنێ بولدزێر دێنێو سەرتا سەری قوتابخانەکە بە بولدزێر وێران دەکەن . .
هەر وەها لە قوتابخانەیەکی دەبیرستانیشدا چەند کەسێك کە نایانەوێ نێوی خۆیان بنووسن بە بیانوی دژی ئینقیلابەوە دەگرن و دەیان نێرن بۆ زیندانە تاریکەکانی تاران .

● لە گەرەکێکی شاری «سەلماس» زەماوەندێك دەکرێت، لە ئاهەنگی زەماوەنەکەدا کورو کچ پێکەوە سەما دەکەن لەو کاتەدا مەفرەزەیەکی بەسیج وپاسدار بەوێدا تێدەپەرن کە چاویان بەو ئاهەنگە دەکەوێت نارنجوکێکیان بۆ هەڵدەدەن، کاتێك دەتەقێتەوە چەند کەسێکیان لێ بریندار دەکات، پاسدارەکان بەوەشەوە ناوەستن خاوەن زەماوەندەکە دەگرن وچەند مانگێك لەم شاور لەو شار زیندانی دەکەن و ئەوجار بەرەڵلای دەکەن .

● لەو کاتەدا کە ئێران لادێکانی ناوچەی مەریوانی بەزۆر بە جوتیارەکان چۆڵ دەکرد چەند ماڵە جوتیارێك توانای رۆیشتنیان نەبو لە ئاوایی «گاگل» مابونەوە، بە یانیەك لە گەردو گوڵی بەیاندا چەند بولدزێریکی پاسداران کردیان بەناو ئاواییدا، بێ ئەوەی ماوەی ئەوە بە خەڵك بدەن کەلوپەل و ئاژاڵە کانیان لە خانوەکانا بکەنە دەرەوە دەستیان کرد بە روخاندنی خانوەکان .

بەسەر کەل وپەل و ئاژەڵەکاندا، یەکێك لە پاسدارەکان ئاوری لە خانویەك بەردا بەر لەوەی کەلوپەلەکانی ناوی بگوێزنەوە، خەڵکی ماڵەکە رایان کردە دەرەوە، منداڵێك لە بێشکەیەکدا بەجێ دەمێنێ، دایکی منداڵەکە دەقیژێنێو خۆی دەکات بە ناو ئاورەکەدا و منداڵ و بێشکەکە دێنێتە دەرەوە، پاسداریکی تر تورەلییەوە بەتورەییەوە
منداڵ و بێشکەکە لە دەست ژنەکە وەر دەگرێ لە پەنجەرەی زۆرە سوتاوەکەوە فرێی دەداتەوە نێو ئاگرەکە . . ژنەکە بێ پەروا دەقیژێنی و خۆی دەدات بەسەر زەویەکەداو دەمودەس گیانی دەر دەچێت . . باوکی منداڵەکەش پەلاماری پاسدارەکە دەدات و دەیەوێ بیکوژێ بەڵام پاسدارەکان بە گەلەکۆمە دەستڕێژیری لێ دەکەن و دەیکوژن . . ئەو رۆژە بارانێکی زۆر قایم دەبارێ هەر بەو بارانە ئەو خەڵکە ماڵ سوتاوانە ئاوارەی ناوچە دورەکانی دەوروبەری مەریوان دەکەن .

● لە نێزیك ئاوایی «قەمچیان» لەسەر رێگای نێوان سەرشیوی مەریوان و «بەسام وسوتە» بۆمبێك لەژێر ماشینێکی ئەرتەشی دا دەتەقێتەوە سەرانی. ماشینەکە دەکوژێت . . پاسدارو ئەرتەش و بەسیجەکان وەکو گەلە گورگك پەلاماری ئاوایی «قەمچیان» دەدەن و زیاتر لە 11 ژن و پیاوو منداڵ دەگرن و هەر لە شوێنی تەقینەوەی بومبەکەدا دەیانکوژن . . تەرمەکان لە گڵەجانێکدا بە سەر یەکدا دەخەن و گڵەجانەکە بە سەریاندا دەروخێنن . . .

● ماشینێکی پر لە پاسدار لە «میاندواو»ەوە دەچون بۆ «مەهاباد» ئەمبەرو ئەوبەری رێگا گەلێك باخ و کێڵگەو ئاوەدانی تێدایە، کە دەگەنە نێزیك شاری مەهاباد دەستەیەك کوران و کیژان لەنێو باخێکدا کاریان دەکرد لە رۆخی جادەکەوە، خەریکی کار کردن بون، یەکێك لە پاسدارەکان نارنجوکێکی دەستی دەخاتە ناویانەوە، کیژێکی تەمەن 17 ساڵان و دو منداڵی 12 ـ 15 ساڵانی بریندار کرد . . بەوەشەوە نەوەستان دەستەیەك کورو کیژی دێ خەریکی بژارو کاری ناو دەغڵ و دان بون هەندێك تەقەیان لەوانیش کرد، دەستەی دووەم خۆیان لەناو شیوو پەسیوی زەویەکەدا شاردەوە . . ئینجا پاسدارەکان بە شەرمە زارییەوە بەرەو مەهابادێرا رۆیشتن .

● رەوە پاسدارێك لە رێگای نێوان «دیواندەرە سەقز» دەچنە قاوەخانەیەکەوە، گەلێك بیانوی هەمەجور خاوەنی قاوەخانەکە دەگرن . . پاش ئیسراحەت و نان خواردن لە جیاتی ئەوەی پولی نان خواردنەکە خاوەنەکە بدەن دەکەونە بیانوپێ گرتنی، یەکێك لە پاسدارەکان پێی دەڵێ : کورە کەتمان دەوێ دژی ئینقیلابە، کابرا سوێند دەخوات دەڵێ من لە عومرم تا ئێستا ژنم نەهێناوە ئیتر کورم لەکوێ

بو؟ یەکێکی دیکـەیـان دەڵێت: تفـەنگـەکـەت لە کوێ شاردوتـەوە بۆمـان بهێنـە، کابـرا دەڵێ لە هەمـوژ یـانم دا تفەنگم نەبووەو نیمە.. یەکێکی دیکەیان دەڵێت ئەتو هەمو رۆژ لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی تەبلیغات دەکەی‌و شەوانە بە دزی‌یەوە لەسەر روی دیوارەکان شتی خراپ لە دژی دەوڵـەت دەنوسیت.. کابرا دەڵێ جەناب باوەرت هەبێت کە من هیچ خوێندەواری نازانم سەوادم نیە... یەکێکی دیکـەیـان دەڵێت: ئەمشەوئەوتاقمـە چەکـدارە کێ بون هاتن لەلای تۆنیـوە شەونانیـان خوارد.. کابـرا دەڵێت جەنـاب من هەمـورۆژ هەر سەر لە ئێواریّ دەچمەوە بۆناو ئاوایی چاخـانـەکـەم شەوانـە چۆڵ دەبێت.. یەکێکی دیکـەیـان دەڵێت براکـەت لە کوێ‌یە؟ ئەویش دەڵێت من برام نیـە.. ئینجا سەر دەستەکەیان تورە دەبێ‌و لێ‌ی دێتە پێشەوە بە هەمو هێزێ قونـاغە تفە نگێکی لە تەپڵی سەری دەدات و هەمـو سەروچاوی خوێنـاوی دەکـات و پێ‌ی دەڵـێ ئیـدی ئەمـە تەواوە..؟ ئینـجـا هەمـو سواری ماشینـەکـەیـان دەبنـەوەو دەرۆن و کابـراش بە زەویـدا دەکەوێت.. بۆسبەینێ خەڵکی ئاوایی بەزەییان پێدا دێتە وەو دەیبـەن بۆبیمـارستـان لە رەزائیـە، لە بیمـارستـان لێپرسراران تەحقیقی لێ دەکات و دەڵێت ئەمە چ کارەیە؟ بۆچی وای لێ هاتـوە؟ خەڵکەکە لە هەوەڵەوە ناوێرن بڵێن پاسـدار وایـان لێکـردوە.. چەنـد جارێك پرسیاریان لێ دەکەن ئینجا بە ناچاری مەسەلەکە دەگێرنەوە، لێپرسراوی پارسـداران تورە دەبێ دەڵێ وا دیـارە ئێـوە تەشقەڵە دەکەن ئەم کابرایە دژی ئینقیلابەولە شەردا بریندار بووە، کابرای برینـدار دەنێـرێ بۆدادگـای پاسـداران و ئەوانیش چەنـد رۆژێك زیندانی دەکەن..

● شەوێك دەستەیەك پاسدار لە شاری بانە دەچنە ناو بانقەکەوە، لەگەل پاسەوانەکانی بانقەکەدا پێکەوە بانقەکە دەبـرن پێنـج ملیـۆن تومانی تیدا دەبێت لەگەل کۆمەڵێك خشڵی زێـر.. بۆسبـەینێ هەر هەمـان دەستـە پاسـدار دەکـەونە پشکنینی مەسەلەکەو لەو گەرەکەدا کە بانقەکەی تێـدایـە خەڵکێکی زۆر دەگـرن و ئەمکـارە دەخـەنـە پێ‌یـان.. پاش بگـرەو بێنـەیـەکی زۆرو ئازاردانی خەڵکـەکـە، خەڵکی شار بە ناچـاری بە دزی‌یەوە کۆ دەبنـەوەو لە نێـو خۆیـانـدا پێنـج ملیـۆن تومـان پۆل کۆ دەکـەنـەوەو دەیبەن بۆجەنابی سەرۆکی پاسداران و لێ‌ی دەپـارێنـەوە کە ئەو خەڵکـە بێ گونـاحەی لەسەر ئەمکارە گیـراوە بەرەڵـلای بکەن.. ئەویش دەڵێت: بەرەڵلا بون نیـە، بەڵام لەبـەر تەکـلیـفـی ئێـوە لەم روژانـەدا پەروەنـدەکـانیـان دەنێرین بۆدادگای بە نیو ئینقیلاب.. زۆری پێ ناچێت دەدرێن بە دادگـاو هەریـەکە سزایەکی توند دەدرێن.

● لە سەر شیـوی مەریـوان کۆمـەڵێـك خەڵکی ئاوایی «هەنجیران» دارەمەیتێك دەبەن بۆگورستانی «پیریونس»، لەسەر گۆرەکە قەرەباڵغی دەکەن.. لەوکاتەدا دو فرۆکەی هەلیـکـۆپتـەری جەنگی بە ئاسمـانی ئەوشوێنـەدا تێـدەپەرن، چاویان بەوخەڵك وقەرەباڵغی‌یە دەکەوێت، دو دەستـرێـژ یان تێ دەکەن.. هەر لەوشوێنەدا ئافرەتێك دەکـوژرێت و منداڵێك و دوزەلامیش بریندار دەبن.. لە ترسی پاسـداران ناوێرن بریندارەکان بەرن بۆبیمارستانی دەوڵـەتی، یەکێکیـان کە برینـەکـەی سوك دەبێت چاك دەبێتـەوە، ئەوی دیکـەیـان لەبـەر کاریگەرێتی برینەکەی ئیفیلج دەبێت..

●کـابـرایـەکی زینـدانی پاش ماوەیـەکی زۆر حەپسی‌و لێـدان بەرەڵلا دەکرێ، بۆهاواڵەکانی دەگێرێتەوە دەڵێ: گەورە ترین سەمـەرە لە زینـدانـەکانی ریژیم دا ئەوەیە، ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ تیر بارانیان بکەن شەوێك بەر لەوەی بیـانکوژن بە ترومپا هەمو خوێنەکانیان دەر دێنن و دەیکـەنـە شوشـەوە و دەی نێـرن بۆبیمـارستـانـەکـانی ئەرتـەش، ئەو کەسـانـەش کە لە زیندان بەرەڵلا دەکرێن نیـوەی خوێنەکەیان لێ دەر دێنن ئینجا بەرەڵلای دەکەن، هەروەهـا کوتبـوی ئەمن خۆم یەکێکم لەو کەسـانـەی کە نیوەی خوێنەکەمیان دەرهینا ئینجا بەرەڵلا کرام.

● پیـرەمێـردێـك گێـرایـەوە كوتبوی: دوكیژم لە زیندانی ئەڤین تیـرەبـاران كران، ئینجا كوتبوی شەرم لەوەدایە هەر كیـژێـك تیـربـاران بكـەن بەر لەوی بیكـوژن دەسكاری دەكـەن گوایـە بە پێی بیـروڕای ئەوان كەلە كیژی دەرچو ئیدی ناچتە بەهەشت. .

**● لە ناوچـەی مەریـوان كابـرایـەك بەنێـوی حەمە عەلی قوربـان عەلی مەشهـوربـە (قیـاس) لەگـەل شەش كیلۆ خورمـا دەگـرن، چوار مانـگ زیندانی دەكەن دوای ئەوە جەنـابی ئایـەتـولـلای «كـرمـانی» دەچێت بۆ زیندان كە چاوی بە زینـدانیەكان بكەوێت. . كاتێك قوربان عەلی دەبینێ پێی دەڵێ جەنـابی ئایـەتـوڵلا من بێ گوناحم. . لەســەر شەش كیلۆ خورمـا گیـراوم. . ئەویش فەرمـان دەدات تیـر بارانی بكـەن لێی دەپـرسن جەنابی ئایەتوڵلا بۆچی لەســەر خورمــا خەڵكی دەگـرن مەگـەر خورمـا قاچـاغـە؟ لە وەڵامدا كوتبوی مەترسی ئەوەی لێ دەكرێ بكرێتە شەراب.**

● رۆژێكیـان جەنابی ئایەتوڵلای «لاجیوەردی» سەرۆكی دادگـای بەنێـو ئینقیـلاب كوتبوی: هەر تاوانبارێك ئەگەر پەروەندەی نەبێت دەبێت لەسەر پەروەندەی یەكێكی دیكە سزا بدرێت. . بۆ ئەوەی خەڵـك لەو كارانـە دور بكەونەوە كە دادگا خەتی بەسەردا كێشاوون.

**فەرهەنگۆكێكی بچكۆلانەمان بۆ هەندێك**
**لە زاراوەكان دروست كرد**

| | | | |
|---|---|---|---|
| **ئەرتەش** | سوپا | **ئینقیلاب** | شۆرش |
| **ماشین** | ئۆتۆبێل | **تجریش** | گۆرەپانێكە لە تاران |
| **بەسیج** | متطوع | **هایت** | میوانخانەیەكە لە تاران |
| **پاسدار** | حەرەس خومەینی | **ئەڤین** | زیندانە تۆقینەرەكەی ریژیمە |
| **پوڵ** | پارە | **سەرهەنگ** | ئامیر فەوج |
| **بیمارستان** | نەخۆشخانە | **ئوتاق** | ژوری خانو |
| **خاڵخاڵی** | سەرۆكی پێشوی دادگای ریژیم | **ئیعلامیە** | بەیاننامە |
| **نەوار** | شریتی تەسجیل | **ستوك** | لەشكر |
| **پاسگا** | بارەگا، مەقەر | **ئەپارتمان** | باڵە خانە |
| **دانشگا** | زانكۆ | **ئەلبورز** | چیایەكە لە پشت تارانەوە |
| **موجاهید** | ئەندامی رێكخراوی موجاهیدی | **ترمیناڵ** | نەقلیات |
| **ناصرخوسرەو** | ناوی شەقامێكە لەتاران | **خانەوادە** | خەستەخانەیەكە لە تاران |
| **ئوتوبوس** | ئۆتۆمبێلە گەورەكان | **رەهنومایی** | ناوەندی |
| **ساك** | جانتا | **دەبیرستان** | ئامانەوەی ـ دواناوەندی |
| **قومپارە** | هاوان | **كرمانی** | ئایەتوڵلایەكە |
| **رستۆران** | چێشتخانە | **لاجیوەردی** | سەرۆكی دادگای ریژیمە |
| **ئاردبەبا** | كیۆێكە لای شاری بانە | | |

# تیروپشکێ لە دەنگسازی

مسعود محمد

ڕۆژی دووەمی جەژنی قوربـانی رابـوردوو، دۆستـە بەڕێزەکـانم د. کەمـال مەزهەر و د. ئاورەحمانی حاجی مارف سەریان لێدام. لە لاڕێیەکی ئاخاوتنەوە تاسەیەکی دەروونم سەرکەل کرد وگوتم. لەو جودایی بیروڕای نێوان د. ئاورەحمـان و مندا هەیە لە بارەی هێندی لاباسی سەر بە فۆنـەتیـك، کە دەکێشێتـەوە بۆلای ڕێنووسیش زۆر دڵ ناراحەتم. هەردوویان گوتیان دەربرینی بیروڕای جودا کە بنـیـات نەرو ڕوون کەرەوە بێ چالاکـی پـیـرۆزو سوودبـەخشـە. هەڵبـەت منیش لەو باوەڕەدام کە پێویستە بیـروڕا سەر وەدەر بنـێ بۆبەر بیستن و دیتن، بە هەمـوو عومـریشم پشتگـریم کردووە لە ئازادیی بیـروبـاوەر هەر نەبێ لەبـەر ئەوەی بەزۆری خۆم لە بارێکـدا دیتـووە یەکی لەسـەر ئازادیی بیـرو باوەڕ کەوتبێ بەڵام ئەگـەر بلوێ و بشێ خاوەن ڕایـەکـان لەسـەر یەك باوەڕ کۆببنـەوە دەتوانن سوودی ڕوون کردنـەوە و بنیـات نان پێکـەوە بگـەیـەننـە خەڵق، چەنـد سوودیدیکـەش بخـەنـە پاڵ ئەودووەوە یەکیـان کەم کردنـەوەی ئەرك و کاتـە. دووەمیـان سوود وەرگـرتـنـە لە ئەرك ،کاتـی پاشـەکـەوت کراو لە مەیـدانی دیکـەدا. سێیـەمیـان چەپـارە دانی ئاپـۆرەی خوێنـەرانـە لە سەرسـوڕکێی نێـوان بیـروڕای جودادا. چوارەمیـان سەرنـج ڕاگـرتنێکی خۆمە لە کێشەی جودایی بیـروڕا بەولای هەنگـاوی تێخوێندنەوەی سوود وزیانەوە دەروات دەچـێـتـە ڕادەی ئەوەی بڵێـم تەن ساغـی وخۆ بەدەست نەخـۆشیەوە نەدان ڕاستییەکی وەها بنەڕەتییە پێی ناوێ بەراووردی بکـەم لەگـەڵ دۆزینـەوەی دەرمـان بۆ نەخـۆش. گەڕان بەدوا دەرمـاندا ناچارییەکی ڕەزاگرانە لە نەخـۆشییـەوە بە ملمـانـدا دێت؛ هەرگیـز ناشێ حەز بە نەخـۆشی بکـەین هەر چونکە دواتر بۆدەرمان دەگەڕێین.

من لە کولانەیەکی هاراوتر لە زمان و باسەکانیانەوە نیگام بۆ کێشەی جودایی بیروڕا دەکشێ وەك لە ڕووداوی ڕۆژانە و دەنگـوبـاسی مێـژ ووش دەدیتـرێ لێـك تۆران و ترازانی خەڵق خۆش جڵەوتـرە لە تەبـایی و ڕەبـایی یـان. چەندین هۆی بایـەخـداری یەك بوون دەپێچـرێتـەوە بەرانبەر یەك هۆی کەم بایـەخی لێـك ترازان. بەدەوری خۆتدا بنۆرە و بپـرسـە بۆچی ئەو خەلقوڵڵایە وەها دەستەویەخەی یەکدی دەبن کە دەبوو لە ئاست هەڕەشەی ترسناکدا وەکوو دەستە برابن.

ئەم تێبینیـە پێشـەکیـانـەم بۆیـە بووکە بزانرێ من لە مەسـەلـەی جودایی بیـروڕادا بەسـەر بابـەتێکی تازەدا ناکـەوم: پێشـتـر تێـوەی ڕامـاووم و بە زۆر لادا هەڵم گێـڕاوەتـەوە، ڕەنگـە بەرەو دۆزینـەوەی بنـەمـای خۆش جڵەویی لێـك نزازانیشـەوە ماوەم بڕیبێ وپتر لەو کەسەی سەرنجی نەدابێتێ خۆمم زاڵ کردبێ بەسەر بڕیارە نافرەجایەکانیدا.

دوو ڕۆژ دوای ئەو سەردانە ژمارە (9)ی گۆڤاری بەیانم چەنـگ کەوت و دیتم گوتـارێکی د. ئاورەحمـانی تێدایە لەژێر سەرەناوی (چەند وشەیەك دەربارەی وتاری «لەگەڵ دەنگسـازی کوردیـدا») بەسەر بیروڕاکانی مندا دێتەوە کە پێشتـر لە ژمـارە (95)ی ساڵی (1983)ی ڕۆشنبیـری نوێـدا بڵاوکرابـوونـەوە بە دەوری نووسـیـنـێـکـی د. ئاورەحمـانـدا دەخـولانـەوە لە واینشدا گوتبووم ناراحەتم بەدەست جودایی ی بیـروڕا لە نێوانماندا. کە سەرەتاکانی

گوتارە تازەکەی د. ئاورەحمانم خوێندەوە یەکسەر قسەکەی یەك دوو رۆژ پێشتری خۆمم بەبیردا هاتەوە و دەرلەحزە بریارم دا کۆنە قەناعەتەکەم لە پووچاندنەوەی کاری سەلبی‌ی جودایی بیرورا بەگەر بێنم وبە نیازی مشتومالْ دانی رووپەرەی بێ‌گەردی برایەتیمان پاکانەیەك بۆ نووسینەکەی خۆم بکەم لەبەر تیشکی ئەم نیازەدا خەریکی روون کردنەوەی ئەو شوێنانەی کۆنە گوتارەکەم دەبم کە بەخت یاریدەی نەدان بەشێوەیەکی وەها راگوێزرێنە ناو گوتارەکەی د. ئاورەحمان کە ئیتر لە منەوە روون کردنەوەیان پێ نەوێ لەگەڵ ئەوە و بە دەوری ئەویشدا تێبینیەکی خزمەتی بابەت بکات بە کاغەزی دەسپێرم.

لە کۆتایی ستوونی یەکەم و سەرەتای ستوونی دووەمی گوتارەکەی د. ئاورەحمان، لاپەرە (62) رەخنەیەکی من لە دەستووری دەق گرتووی بە هەڵ و مەرجی ناو کتێبان و بریاری یەکجارەکی‌ی بەرنامان نیواونیوراگوێزراوە و لەسەری نووسراوە. بۆ ئەوەی تەواوی هەڵوەستم روون بێ ئەم یەك دوو دێرەش دەخرێنەوە سەر قسەکانی ئەو شوێنەم. «وەیا لە بارێکی دیکەدا بەشێکی ئەو هەڵانەی گەشتی بێ‌رابەر بە مرۆڤی وەکو منی دەکات بە رۆشنایی ئەو دەستوورانە ساغ بکرێنەوە» من مەترسی‌ی دەستووری قەرار دادە و گەشتی بێ‌رابەر، وێکرا لە حیسابمدا بوون، پارانەوەشم بۆ گەشتی بێ‌رابەر لەوەوە دێت کە بیرورای ئەو تەرز گەشتە، بەعادەت، دەبرێتەوە بۆبەر رووناکایی دەستووری ناو کتێبان.

لە ئاست ئەو وەرام و بەسەردا چوونە وانەی کە د. ئاورەحمان لە ستوونی سێیەمی گوتارەکەیدا دەیانخاتە روو دەبێ بزانرێ هەرچی رایەکی من لە وێدا وەرامی درابێتەوە بە ئەسڵ لە نووسینەکەمدا رووی لە رابەرە فۆنۆلۆجیستەکانی ئەوروپا بووە. لەو باسانەدا کە شێوەی عومومییان هەیە موناقەشەی سەرچاوەکانیان دەکرێ. بە نموونە، کە داروین بیرورای خۆی لە بارەی گیان لەبەران دەردەبرێ یەخەگیری باوەڕی ناو کتێبە ئاسمانیەکان دەبێ نەك تاك تاکی ئیمانداران. من کە دەڵێم هەمزە فۆنیمە و کەسرە موختەلەسە پێداویستی دەنگسازییە ئەگەر بە بڵندا نۆرینیشم لەسەر حیساب بکرێ هەر رووبەرووی رابەرەکانی فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی دەبم. لە کوردەواریدا کەس پێش دەستی لەو بابەتەدا نەکردووە تا ببێتە رابەری مامۆستاکانی ئەوروپا، کە دەنگیشمان نابیستن. بە هەموو باوەڕمەوە وەهام زانیوە د. ئاورەحمان لە خوێندن وەیا گوێ‌بیست بوونی تۆژینەوەی فۆنەتیکی‌ی و فۆنۆلۆجی‌ی ئەوروپا هاتۆتە سەر ئەو رایەی کە لە بارەی هەمزە و کەسرە موختەلەسەوەی دەنووسێ پتریش بیرم بۆ ئۆە دەچوو کە بە خوێندن پێی گەیشتووە قەت بە دڵمدا نەدەهات کەسی وڵاتی خۆمان کە هێشتا تەقەی فۆینم و فۆنەتیکی تێدا زۆر بەرز نەبۆتەوە لە پلەی خوێندن وەیا دوای خوێندنیش، بێ سۆسە کردنی سرکەوکورکەی ئەوروپا، گەیشتبێتە بیرورایەك کە هەر نەبێ بە رواڵەت عەکسی هەست و پێزانینە بە تایبەتی لە کێشەی هەمزەدا. پرسیارەکانی سەر بەزمان و دەنگیش وەکوو باسی کیمیا و فیزیا نین بە بەڵگەی مادی بۆ ئەو رابەرانە ساغ بووبێتەوە. دەنگناسی، فەلسەفە، رێزمان، مێژوو، کۆمەڵایەتی بەتێکرایی میتافیزیك . . . . بەندنین بە ئەزمووگە (مختبر) تەنانەت کۆمپیوتەریشیان تێدا بەکار بێت بریارەکان لە هەست و هۆشەوە دەردەچن لە مەیدانی دەنگی زمانی کوردیشدا رابەری غەیری کورد ناتوانێ وەکوو کوردێکی سەرنجدەر بچێتە ناو شیرازە و رایەڵی زمانەکەوە. ئەو نموونانەی لە گوتاری ئێمەماناندا دێنەوە درەنگ بە خەیاڵی بێگانەدا دێت یان هەر نایەت.

لە ستوونی دووەمی لاپەرە (63) ئەم قسەیەم خراوەتە نێوان دوو کەوانەوە «ئەوەندی بزانم دەنگ ناسان لە بارەی فۆنیم نەبوونی دەنگ دووابن هەر ئەوەندەیە کە د. ئاورەحمان لە گوتارەکەی دا باسی کردووە» بەدوا ئەوەدا دەنووسێ «ئەو چەند دێرەکەمەی من تنۆکێکە لە دەریایەك.»

هەڵبەت من ناشێ مەبەستم ئەوە بووبێ کە لە قسەکەی

د. ئاورەحمان دەفامرێتەوە چونکە هیچیشم نەخوێندبێ و لێـك نەدابێتـەوە عومـرەکـەم لێی ناوەشێتـەوە شتی وەهـا سەراویلکـەی هەزارم مەبەست بووبێ. منێکی ئەلفوبێ فێـر بوویم چۆن وەهـام لێ رەچـاو دەکرێ! مەبەستم، لە زەمینـەی داسـەپـانـدنی ناساندن و سنوور دانان بۆ واتای فۆنیم شتێکم نەبیستـــووە و نەخـــوێنـــدووتـــەوە دژی ئەو راگەیاندنە بێ کە نووسینەکەی د. ئاورەحمان بەدەستییەوە دەدا قامـوسیش دوو دێـری کورتی بە تەعـریف هێناوە بۆ فۆنیم. کە دەگوترێ یان کە من دەڵێم زەوی ئەستێرەیەکی بچــووکـە بە دەوری رۆژدا دەخـولێتـەوە نەهـاتـووم بڵێم زانستی جیـۆلـۆجی و فەلـەك و بایـۆلـۆجی هەزار کتێبیـان لەسـەر دانـەنـدراوە د. ئاورەحمـان خۆیشی نەیـویستووە چی دیکە لەو دەریایەوە هەڵێنجێ لەبەر بێ لزومی.

هەر لەو ستوونەدا بەسەر قسەیەکمدا دێتەوە کە گوتوومە بەشێکی کۆنسنـــانتی کپ لەوانـــەن بە بردنـە ژووره وەی هەواش پەیدا بین ئنجا دەڵێ «بەراستی ئەم تاقی کردنەوە نوێیـەی مامـۆستـا مەسعـوود بە هیـچ چەشنێـك لەگـەڵ فەرمـانی فۆنـەتکیـدا ناگـونجێ.» من لە دوا ئەوەی تاقی کردنـەوەکـەم باس کردووە گوتوومە: «لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تەرزە دەنگانە کە برای دەنگی سروشتیشن هیج کامێکیان نابنە فۆنیم چونکە ناتوانێ دەنگی دیکە بەدوا خوایدا بهێنێ و وشـە دروست بکـات، جگـە لەوەی کە هەرگیـز ناتوانێ ئاوازە پەیـدا بکـات چونکـە ئاوازە لە پیکی قورگـەوە بەرەو دەرەوە دەردەچـێت، هەر بۆیـــەیشـــە ئاوازەدار بەرەو ناوەوە پەیدا نابێ». خوێنەر دەبینێ من نرخی ئەو دەنگانەم زانیوە بە عەکسی هێمـای قسـەکانی د. ئاورەحمان و ئەو هێندە قسـەیـەم کە رای گـویستووە بۆ ناوگوتارەکەی. ئنجا ئەگەر لزوم نەبێ بگوترێ دەنگن (هـ) کە بەرەو ناوەوە پەیدا دەبێ فۆنیم نییە دەبێتە عەیب لەو رابەرە زلانەی فۆنۆلۆجی پێمان بڵێن فیکە و لرخە فۆنیم نین. لە کدوولەی تەریشدا کەس بە تەمـا نەبـوە بڵێ ئەمـانـە فۆنیمن، نەك هەر فۆنیم نین، بەڵکـــو کەس بە خەیـــاڵیـدا نابێ بڵێ دەنگی زمـانین. تەعریفی فۆنیم و دەنگی زمانی بەسن بۆ ناساندنیان یاخود هەر نەبێ لرخە و فیکە و کۆکە لە خەیاڵان بتەکێنێتەوە.

کە باسی لرخـە و فیکـە هاتـە ناوەوە تەجـرەبەکەی من دەبێتە هەنگاوێکی روونکەرەوەتر چونکە هەر نەبێ دەنگی (هـ، ت، ف)ی بەرەو ناوەوە لەدەنگی ئاخـاوتن دەکەن، سەرنـج دانیشم لەو راستییـە کە ئاوازە لەو دەنگـانـە پەیدا نابێ ورد پێویەکە بە سوودی دەنگ سازی تەواو دەبێ. وا ئیستا دەڵێم رستەی (بە برای خۆم بڵێم) تاقی بکەوە لەگەڵ خۆتـــدا لە رێ بردنـــە ژووری هەواوە گوێـت لە شتـێکی مەفهووم دەبێ، بەڵام نە بە ئاخاوتن حیساب دەکرێ و نە دەنگـەکـاینشی فۆنیم وەیـا دەنگی زمـانین. تێ بینی دیکە زۆرن وەکـــوو (قســـەی تووتی، ئەو دەنگـەی لە میـاوەی پشـیـلەدا بە «میـــاو» دەچێ، دەنگێکی حیلەی ماین کە بانگهێشتی جانـوەکـەی دەکـاتـەوە لەو شوێنەی قورگییەوە دەردەچـــێ کە دەنـــگـــی «ح» لە قورگـی بنـیـــادەمـــەوە دەردەچێ)هـەمـوویـان لە فیکە و لرخە شیاوتری قسە لێوە کردنن. پسپـۆری زۆر شارەزای مۆنتـاژی دەنـگ دەتوانێ لەو دەنگـانـە وشە پێکەوە بنێ. لە قەوانێکی کۆنی (سامی شوا) کە بە کەمـانچـە، لە ژێـر عنـوانی (العاصفة ـ غرق المسـافـرين ـ آلام واحزان موسيقى) پری کردبۆوە گوێت لە یەك دووشـەی مەفهـووم دەبـووکە بە کەمـانچـەکەی درکـانـدبـوونی. هەڵبـەت ئەمـانە هیچیان نە ئاخاوتنن و نەفـۆنیم و نە دەنگی زمـانی، مەگـەر تەعـریفێکی تازە لەو بابـەتـانە دەرچێت و بیانگرێتەوە. لەوەوە رێم دەبێ وەرامی پرسیـاری د. ئاورەحمـان بدەمـەوە کە دەڵێ: «مـرۆڤ بۆ عەکسی واقیـع بوەستێ سەرەرای ئەوەش خۆی بۆ هەناسە سواز بکات. ئەگەر فۆنۆلۆجیستەکان ئەو جۆرە قسانەیان بکردایە دەبوو هەڵوێستی ماموستا مەسعوود چی بوایە؟».

لە وەرامی ئەو پرسیارانەدا دەڵێم من بۆ سەپاندنی واقیع هاتم عەکسی واقیـع وەستـام نەك بۆ لەقـانـدنی. زاناکان هەناسە راگرتنیان تاقی کردەوە تاکو بزانن گیانلەبەر چەند دەقیقـە بێ هەناسە هەڵێنان دەژیت خۆ ئەوانیش عەکسی واقیـع رۆییشتن. دێن حاڵـەتی بێ کێشی پەیـدا دەکـەن عەکسی هەمـوو یاسـا و دەستـووری ماددە. ئنجا ئەگەر

بگوترێ ئەم تاقی کردنەوانە بۆپاراستنی ژیان وگەشتی نێو ئەستێرانە منیش دەڵێم تاقی کردنەوەکەی من زرە دەنگەکان دەخاتە پاڵ فیکە و لرخە و مڵچەی زمانەوە هەتا کەلەبەرێکی ئەوان بگرێ لە مەیدانی دەنگناسی و دەنگ سازیدا. ئەمما ئەگەر فۆنۆلۆجیستەکان قسەی وەهایان بکردایە [رەنگە کردبێتیشیان وئێمە نەمانبیستبێ] دەمگوت: دەك زارخۆش فۆنۆلۆجیست کە زمانت لە لرخە و فیکە هەڵئەنگاوت بۆ بەرەژوورتر، چ ڕێگەی‌دیکەش شك نابەم پێیدا برۆم.

لە بارەی بیرورام بەرانبە مامۆستا رابەرەکان کە لە گوتارەدا وەها لێك دراوەتەوە گۆیا من قەدریان نازانم، لێرەدا دەڵێمەوە من دژی رابەرێکم ڕێ بە قوتابی نەدات بیرورای خۆی هەبێ. مامۆستا هەقیەتی و واجیبیەتی رای خۆی بە قوتابیەکانی بڵێتەوە، پێوستیشە لەسەر قوتابی رای مامۆستای بزانێ، لەوە بەولاوە بێ ئینسافییە لە مامۆستاوە دەنگی قوتابی چاوساغ و بیرتیژ خەفە بکات. گریمان من مامۆستای دەرسی فۆنۆلۆجیم و لە سوختەکانم نەسەلماند بڵێن هەمزە فۆنیم نییە و ساڵەوساڵ لە ئەزموون خستمن هەتا لە فێرگە دەرکران ئاخۆ لێم رازین؟ چ ئینسافێکم بەکار هێناوە؟ مامۆستایەك بە هەرەشەی نومرە شکاندن سەر بە قوتابی دابنوێنێ بۆ ئارەزۆی خۆی، کە دەسەلاتی دنیایی هەبوو بە پێی سنووری ئەو دەسەلاتە لە خراپە زیاد دەکات د. ئاورەحمان کە لە ستوونی دووەمی گوتارەکەیدا دەڵێ «بەڵام وەنەبێ بەو چراخانە وراستە شەقامەدا کوێرانە مل بنێم، بەڵکو باش سەرنجی لێ دەدەم و ڕای خۆمم زۆرە. ئەگەر وا نەبوایە هەڵبەت چەند جار ڕەخنەم لە رابەران و مامۆستایانم قەناتی کورد و چەرکەزی بەکۆ و کەریمی ئەیوبی وئی. ئا سمیر نۆڤا نەدەگرت.» ئەم قسانە ڕاستن، بەڵام چەند سەرنجێکی لێوە هەڵدەستێ.

1 ـ من نەمگوتوە د. ئاورەحمان لە ئاست رابەرەکانیدا چاو نووقاو بووە ناشزانم چۆنی قوتابیەتی ی بەسەر برد لە زەمینەی ڕەت کردنەوەی ڕای مامۆستاکانی.

2 ـ هەموو قوتابییەك ئەو لەخۆ بوردووە نییە بەگژ ڕای مامۆستاکەیدا بچێتەوە.

3 ـ د. ئاورەحمان لە دوای دەرچوونی ئەو بیروڕایانەی دەربری کتێبەکەی کە ئەوان ڕایانەی تێدان لە 1976 لە بەغدا چاپ کرا.

4 ـ ئەگەر قوتابی ناچار بوو لە ئوتروحەدا بیرورای مامۆستای بچەسپێنێ دواتر زەحمەتە لێی پاشگەز بێتەوە. چونکە شەهادەکەی بێ سووك دەبێ

5 ـ ڕاهاتنی قوتابی بۆ ماوەی (15 ـ 20) ساڵ بە گوتنەوەی بێ ڕەخنەی بیرورای سەلمێندراو گەلێك مۆم لە میشکیدا دەکوژێنێتەوە. هاورێیی منداڵ لەگەڵ هاوزای خۆیدا بە تەئسیرە چ جایی لە سایەی دەسەلاتی مامۆستایدا.

6 ـ بەسترانەوەی گوزەران و چارەنووسی خوێندکار بە بەرنامەی سەلمێندراوی ئینجیلی بەرەو نەزۆکی‌ی فکرییەوەی دەبات بەتایبەتی لەو مەیدانە هەستیارانەدا کە پێوەندییان بە فەلسەفەی ژیانەوە هەیە.

7 ـ کە ڕێگە لە بیری سەربەخۆ بەسترا چاپخانەی ئەوتۆش نامێنێ بتوانێ بیری سەر بەخۆ لە چاپ بدات و بلاوی بکاتەوە.

8 ـ نەك قوتابی بەڵکو مامۆستای زانکۆ لەسەر بیری ئازاد دووچاری وەستاندنی «ترقیەی علمی» بوو د. ئاورەحمان خۆی لەمە ئاگادارە.

مەسەلەی پاشگەز کردنەوەی گالیلیۆ لە بیرە رووناکەکانی بە هەرەشەی دادگای کەنیشتە هی لەبیر کردن نییە، سووتاندن و حەبس کردنی فلان و فلانیش لە بیر ئازادانی کۆن و نوێ هەر وەها. مامۆستایەکی بە هەرەشەی نومرە شکاندن قوتابیەکانی بتۆقێنێ دادگایەکی بچووکی کەنیشتەی بەر لە (500) ساڵە. لە خۆرایی نەبوو برنارد شۆ ئامۆژگاریی قوتابی زانکۆکانی بریتانیای کرد کە هۆشی خۆیان تەسلیم بە مامۆستاکانیان نەکەن. وا بزانم لەمەوبەر قوتابیی ئینگلیز فێر دەکرا بڵێتەوە ئیمپراتۆریەتی بریتانیا خەریکی خزمەتی مرۆڤایەتییە. ئازادیی

بیروباوەڕ بەر لەهەموو شتێك ڕێ دانە بە لایەنی بێهێز بۆ خۆ ڕوون کردنــەوە، هەرچی لایــەنی بەهێـزە خۆی ڕێ بەخــۆی دەدات پێشم مەڵێنــەوە مامـۆستـا قەنـاتی و ئەو بەڕێـزانــەی ناویان بردرا لەوانەن ڕێی بیری ئازاد بە قوتابی دەدەن. دەشێ ئەوان باغەڵ فەراح بن بەڵام کێ بەرباری ئەومتمـانــەیـە دەبێ لای مامـۆستـایـەکی دیکـە ئەگـەر لە سەرەتـاوە ئازادیی بیـرورا نەبـووبێتە دەستوور. دەشێ، چونکـە تەجـرەبـەی من لەو هەرێمـەی ئازادیی تەعبیر و سەپـانـدنی بین درێـژتـر و هەمـە چەشنەتر بێ لەوجیلەی بەدوا منـدا هات من دڵگـەرمـانـەتـر لێـوەی دەدوێم تاکوو تەپوتۆزیم گەیاندە مەیدانی فۆنەتیك. ببەخشن.

لە ستـوونی یەکـەمی لاپـەرە (67) دا د. ئاورەحمـان چەنـدین نمـوونـەی هێنـاوەتەوە لەووشانەی دەنگی (هـ) کەوتـۆتـە ناوتوێـژ یانەوە. ئەووشانە هەندێکیان نموونەی دروستن وەك.. بەهــرە، بەهـار نهێنی.. بەڵام لێـرەدا مەسـەلـەکـە پێـویستی بە ڕوون کردنـەوەیـەکی نەفـەس درێژ ی زۆر لایەن هەیە..

أ ـ لە ستــوونـی یەکــەمـی لاپــەرە (30) ژمــارە (95) ڕۆشنبیـری نوێ گوتـوومە «دەنگی (هـ) لەبەری سۆران و تێکـڕای کوردستــانـی خوارووادا بەدەگمــەن نەبێ لە ناوتــوێـژ ی وشــەدا نەهـاتـوە وەك (نهـۆم، سەر بهـوردی..)هــەر چەنـد بە تەواوی لە زاری کرمـانجی سەروودا دەنگی (هـ)م بەتـاقی نەکـردۆتـەوە بەڵام وا بزانم لەوێدا دەنگی (هـ) هەم بەوەستـاوی و هەم لەنـاوتـوێژ ی وشەدا دێت لە کرمـانجی سەروودا مەیلێـك هەیـە بۆ وەستاندنی دەنگی بەرایی وشـە تەنانەت (لە) دەکرێ بە (ل) ئەمەش تا ڕادەیەك لەو دەستوورانەی دەنگسازیدا بەدەر دەداتەوە».

دیارە من چیم گوتووە. (1) دەنگی (هـ) لە کرمانجی خوارووادا بە دەگمـەن دەکەوێتە ناوتوێژ ی وشەوە. (2) لە کرمـانجی سەروودا هەم بە وەستـاوی لەبـەرایی وشـەوە و هەم لە ناوتــوێــژ ی وشـەدا دێت. لە نمـوونـەکـانی د. ئاورەحمان ئەو بەشەیان لە بنەڕەترا لزومی نییە کە دەیەوێ ئیسپـاتی هاتنی دەنگی (هـ) بەوەستاوی لە بەرایی وشەدا بکــات چونکـە هەمـوویـان بەکـار هێنـانی کرمـانجیی سەروون منیش دانم بەوەدا هێناوە. دواتریش بۆیان دەگەڕێمەوە.

وەك بە لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ، کەم بوونی دەنگی (هـ) لە ناوتوێژ و بزر بوونی لە کۆتایی ی وشەی کوردیدا دیارترە تا زمـانی فارسی.. هەمـوو وشـەی وەکوو (ئاگاهـ، پناهـ، راهـ، دەهـ، دیـە...! لە زمـانی کوردیـدا (ئـاگا پەنا، ڕێ، دە..). دەتــوانین بڵێین لە کوردیــدا دەنگی (هـ) بارتـەقـای هەمـزە بە کۆتایی وشەوە نەماوە فارسیش لە چاو پەهلەوی و هەخـامـەنشی و ئاڤێستـا (هـ)ی کەم بۆتەوە بە نمـوونـە لە پەهلەوی پاشگـری ناوی مەعنا (یهـ) بووە لە فارسی و لە کوردیدا بۆتە (ی) وشە هەبوە لە پەهلەویدا بە (هـ) دەستی پێکردووە لە فارسیدا دۆراندووەتی وەك..

هان أن.
هرم خرم.
هماناك مانند.
هوسکارت سگالید.
هچ از.
هنگار انگار.
هندیشیت اندیشید.
هندوهـ انروهـ.
هندرز اندرز.
هنداخت انداخت.

بنـوارە واژەنـامـەی کۆتایی کتێبی کارنامە اردشیر بابکان، بهرام فرەوشی.

دیـراسـەیەکی تەواوی دەنگی (هـ) لە کوردیدا بکرێ چاکتـر بۆمـان دەردەخات کە تێبردنی لەناوتوێژ ی وشەدا دیاردەیەکی مێژ ووی ی و بنجییە لە کۆتایی وشەشدا وەك نەبــووبێ وەهـای لێ بەسـەر هاتـووە. بەشێـك لەو نموونانەی د. ئاورەحمان هێنابوونیەوە وەك (بانگ هێشتن، نەهات، نەهێشتن، ناهەموار، بێهوودە، بێهۆش

نەشـارەزا، بگـرە شارەزاش، لە نغـوردەکە بر ناکات. خۆ
تێ نەگـەیـاندنیش لە کێشەکە مەنتیقی تێدا نامێنێ چونکە
لە سەرەتاوە ژ یاندنەوەی ئەو (ی)ە لە رێی رێزمان زانییەوە
هاتـە ناوەوە، چ رەوای هەقـە زانینەکە هەر هەتا پێنجیەك و
شەشیەکی رێگاکە تیشك بهاوێ؟

لەم موناسەبەیەدا دەڵێم، جارێکیان گوترابوو (یازدەم، دوازدەم . . . ) کە من پێـرەوی لێ دەکـەم هەڵـەیـە، دەبێ بنـووسـرێ: یازدەیـەم، دوازدەیـەم ئەم رەخنـەیـەش پێنجیـەکی رێگەی بریوە چونکە کێشەکە هەر بەدوا یازدە و پازدە و نۆزدەدا نایەت:

وشـەی (سـەر، دووسـەر) بزوێنی فەتحـەی بەدوا نایـەت. کە (لـە)ی جەری کەوتـە پێش دەگـوترێ: (لە دووسـەرەوە) واتـە (ەوە)ی بەدوادا هات. کەواتـە بۆ (پـەنجـەرە) دەبێ (یەوە) زیاد بکرێ وەك (یەم) بۆ (یازدە) زیاد کرا:

یازدەیەم

لە دوو پەنجەرەیەوە

وشەی (کوڕ) کە ئەداتی تەعریفی بە دوادا هات دەبێتە (کـوڕەکـە) واتـە (ەکـە)ی بۆ دێت. ئەویش بە قیـاس لە (یازدەیەم) داوا دەکات ئەو فەتحەیەی بۆ بپارێزرێ و بگونجێ:

یازدە یەم

برایەکەم

زۆربـەی کوردیش وەهـا دەڵێ تەنهـا ئەو لەهجـەیـەی دەڵێ (یـازدەیـەم) پێـرەوی لە دەستـووری خۆی ناکات و دەڵێ (براکەم).

کورد دەڵـێ: دەشـتـاو دەشـت، دزاو دز، دەسـتـاو دەست. بەپێی دەستـووری پاراستنی فەتحـەی کۆتـایی (یازدە) دەبێ ئەم ئەلفەی (او)یش بپارێزرێ و بگونجێ:

چیا یاو چیا نەك چیاوچیا

دەریایاو دەریا نەك دەریاو دەریا

من کە دێم دەنـووسم (یازدەم، دوازدەم . . ) ئاگاداری ئەو دەستـووراتـەم بۆیـە رێ بە خۆم دەدەم تا ئەو رۆژەی بریـارێکی چاوسـاغـانـەی شارەزایـانـە لە هەمـوو رووی کێشـەکـە دەدرێ رێگـایـەك بگـرمـە بەر کە لە سەرجەمی دەستوورەکانی ئەو کێشەیەی لا نەدابێ.

بەراست، کە دەنووسرێ: دووهەم، سێهەم، نۆهەم، دەهـەم . . . نۆزدەهـەم دەستـوورێکی فارسی بەکـار دەهێنـرێ. بەهـەمـەحـاڵ دووەم نۆیـەم، یازدەیـەم . . . نۆزدەیەم کوردیترە یانی لە بارترە. لەو ناوچانەی کە وەکوو من دەڵێن (یـازدەم) تەنهـا لەو وشـانـەدا کە بریتین لە یەك کۆنسـنـانت و یەك بزوێن، لەو حاڵـەتانەدا (ی)ەك دەهێنن بۆ پاراستنی بزوێنەکە و دەڵێن:

دەیەم

شەیەکە

گایەکە

لە ئاست (دوو)دا پێـویست نابینن بەو (ی)ە وواوەکـە خورد دەکـەنـەوە دەڵێن (دووەم). لەهجەش هەیە دەڵێ: (دوویـەم، لە زوویـەکەوە، بەم روویەدا هات . . . ). لە (سی)شـدا ئەو (ی)ە نایـەت بەزیـادەوە بەڵکـوو (ی)ی وشـەکـەی (سی) خورد دەکـرێتـەوە بە (کسـرة + ی کونسنانت) و دەگوترێ (سییەم).

قسەیەکی دواییمم ماوە:

فۆنـەتیك ناسی و فۆنۆلۆجی لەوەدا بایەخ وەرناگرن فێرمان بکـەن فلانـە دەنـگ لە لوتـەوە و ئەوی‌دیکـەیان لە گوێوە دەردێ چونکە دەنگەکان بێ خوێندن و فۆنەتیك دەردێن و لەوەتـەی مرۆڤیش هەیـە بە دروستی دەری بریـوون. چ قازانـج بەکـەس ناگات بگوترێ لە بەرایی نوونی چاوگدا قورسـایی هەیـە چونکـە ئەم قورسـاییـیـە لە (نـووستن، نووستم، کردت، دڵت، دڵم، کولکن، جلك . . . ) وبە کۆتـایی صەدان و هەزاران وشـەوە هەیـە نەك هەر نوونی چاوگ ئێمـە بە دۆزینـەوەی قورسایی سەر نوونی چاوگ و پاشگـری (ن) و (ك) لە (کـولکن، جلك)دا نابێ وەهـا دانێین شیـری مووسـامـان دۆزیـوەتەوە چونکە ئەم کەسرە موختـەلـەسـەیـە لە کۆنی هەرە کۆنـەوە دۆزراوتـەوە. فۆنـەتیك زان و فۆنۆلۆجیستی کورد لەسەریەتی ئەو هەڵانە

ئاشکرا بکات کە زەق زەق لە چاو دەچەقن . کەسرە موختەلەسە لە ڕێنووسی ئیستاکەماندا بەرچاو نییە : دەمەتەقە لەو بابەتە دەبێتە بابەتی ئەکادیمی تا ئەو ڕۆژەی پیتی لاتینی لە نووسینی کوردیدا بەکار دێت . گریمان هەموو دنیا سەلماندی، قورسایی بەرایی نوونی چاوگ و ڕاناوی کەسەکان . . . دەبێ نیگاری بۆ دانبدرێ خۆ هەر مومکین نییە ئەو نیگارە پەیدا بکرێ ئەوپەڕی ئیمکان لەو ڕێگەیەدا ئەوەیە بچینەوە بۆ پێشنیازەکەی مامۆستا وەهبی ، باوەڕیش ناکەم کەس بەدوا پێشنیازی ئەوتۆیی بکەوێ ئێمە با جارێ یەخەی ئەو هەڵە ئاشکرایانە بگرین کە زەق زەق لە چاو دەچەقن . فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی ئەگەر هەر فێری زانیارییە سەراوییەکانی وەکوو: ئاوازەدار، لێوی، پووکی، انفجاری . . . مان بکات وەك ئەو کەسەمان لێ دێ بزانێ بەردی سەر تەختەدامە ببزێوێ بەڵام چۆغەدار و ئاڵتی داش و مەیموون ئۆیینی فێر نەبێ و نەتوانێ بەردێك بگەیەنێتە خانەی دامە، وەیا کەسێك فێری ئەلفوبێ ببێت و نەزانێ نامە بنووسێ، وەیا کەسێك دەم لە کێش و قافیە بدات و نەتوانێ شیعر هەڵبەستێ . ئەو تەرزە زانیارە سەرەتایی یانە لە فۆنەتیکدا نەزۆك دەمێننەوە ئەگەر گەشتی بەرەو ناوەوەی زمان نەکەن . دەبێ دەستووری وەهایان تێدا بدۆزینەوە بشێ هەڵەی وتە وەیا تەعبیرمان بۆ ساغ بکاتەوە . ئێمە ئەگەر پێ داگرین لەسەر (یانزە، دوانزە، سیانزە، شانزە، حەڤدە) چ دادمان نادا چەند سەرنج دەرێك لە ڕێی فۆنەتیکەوە وەیا لە خۆوە زانی بێتی ، سوانی دەنگی (د) لەو وشانەدا نوونی بۆ چواریان هێناوە و (ڤ)شی بۆ یەکیان هێناوە . زانینەکە پێویستە ، بەڵام پێرەوی لێ کردنی فەرمانی سەرشانە ، بە تایبەتی چونکە بەشی زۆری کورد وتە ڕاستەکان دەبێژن : یازدە، دوازدە، سێزدە، حەڤدە . دەبێ بزانین شکاندنەوەی (ی) تیژی درێژ لە ئیشارەت کردن و کۆ کردن و باری ئەوتۆییدا دەیکاتە (کورتە بزوێنی کەسرە + «ی» کۆنسنانت) ئیتر وەك کە دەڵێین (دارا برسییە، ئەم کورسییە شکاوە) دەبێ بڵێم (کورسییەکان، ئیتالییەکان) نەك (برسێکان، ئیتالێکان) .

لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەم هەڵەیە بەسەر دەرگەی هەموو دایەرەکانیدا لە چاوان دەچەقێ کە لێیان نووسراوە (ئەمینداریێتی) لە جیاتی (ئەمینداریيەتی) . بەعادەتی دەستووری کورت بێژی زۆربەی کورد لەو تەرزە وشانەدا دەڵێن (ئیتالیەکان، ئەمینداریەتی) بەڵام دەڵێن (برسییەتی) نەك (برسیەتی) . چ بڵێی (برسییەتی کافرە)و چ بڵێی (من برسیمە، دارا برسییەتی) فەرق ناکا لە ڕووی شکاندنەوەی (ی) درێژی تیر. بە نموونە، دەگوترێ (هەر ئەم پیاوە خزم و کەسیەتی)و ناگوترێ (کەسییەتی) بەڵام دەگوترێ (خزمییەتی)و دەشگوترێ (خزمیەتی) . بە هەمەحاڵ (کەسیەتی، خزمیەتی) بەر یاسای دەنگسازی و کورت بێژی دەکەون بەڵام (ئەمینداریێتی، برسێتی، ئیتالێکان . . ) پێوەندییان تەنها بە زاری ناوچەیی یەوە هەیە نەك بە دەستووراتی ڕەسەنی هەمەکی ی کوردییەوە . هەر ئەو زارەی دەڵێ (ئیتالێکان) ناچارە لە بنای وەصفدا بڵێ (ئیتالیە زیرەکەکان، برسییە ڕووتەکان) . دەبێ فۆنەتیك ناس بە خەڵق ڕابگەیەنێ (تێدا، جودا) ڕاستن و بەسەر زاری زۆربەی کوردەوەشن چ ئینساف لەوەدا نییە ئاخێوەری ڕانیە ناچار بێ لە نووسیندا ڕاستە شەقامی کوردی لەو وشانەدا بەجێ بهێڵێ بۆ (تیا، تیایا، جیا) . ئەگەر پسپۆری باسی فۆنۆلۆجی بەدەنگ نەیەت نووسەری ئاسایی نەك هەر ناوێرێ بەدەنگ بێت، بگرە جۆرێك بایی بوونیش لە خۆیدا هەست دەکات کە دەبینێ قەڵەمەکەی لەو جۆرە هەڵەی پەرەسەندوودا دەگێرێ و خەریکە بە خۆی بڵێ : ئەوە ئەزم لە بانان دەبەزم . لە وشەی وەکوو (نۆیژ، توێ، کوێر، سوێر)دا نووسەران بە پێی لەهجەی شاری سلێمانی و بەشێکی دیکەی کوردستانی خواروو دەیانەوێ (دیفتۆنگ)ی نێوان (وێ) بەسەر نووسینی ئەدەبیماندا بسەپێنن . بە بەڵگەی بێ کەلەبەر ئیسپات بووە و دەبێ کە دیفتۆنگەکە ناوچەیی یە نەك کوردی ڕەسەن، وابزانم د. ئاورحمانیش پشتگیری لەو بەڵگانە کرد. نالی لە شیعردا شێوە ڕەسەنەکەی بەکار

هێناوە:

هەر جۆگە وو جێگایە کەوا سوور و سوێربێ
جێی جۆشەشی گریانی منە خوێ نە ڕژاوە

وشەی (سوێر) ئەگەر دیفتۆنگی تێدا بێ کێشی مصرەعەکە لەنگ دەبێ:

بولبول کە گەرمی نەغمەیە ئاگر دەکاتەوە
غونچە حەزینە جەرگ و دڵی بۆ دەکا توێ

وشەی (توێ) ئەگەر دیفتونگدار بێ هەم شیعرەکە لەنگ دەکات و هەم ناشبێتە قافیەی (هوردوێ، گوڵی بوێ... هتد) لە قەصیدەکەدا.

ئەمانە نموونەن بۆ دەست نیشان کردنی ڕێبازی فۆنەتیك و ئەرکی سەر شانی فۆنەتیك زان، کەچی بەداخەوە دەبینم خاوەن شەهادەی بەرزی زمان کە خۆیشی شیرمژ ی ئەو زارە ناوچەیی یە نییە لە جیاتی (دەڕۆم) دەنووسێ (ئەڕۆم). من دژ ی (ئەڕۆم)نیم، بەڵام نابێ خۆی بەسەر (دەڕۆم)دا زاڵ بکات کە ڕێبازی ڕەسەن و زووربەی کوردە.

د. ئاورەحمان لە بنی دڵیەوە بە پەرۆشە بۆ زمانی کوردی، هەموو هێزی لەش و هۆشیشی بەو بەخشیوە تا ئەوەی لە هیچ بابەتێکی دیکە قەڵەم ناگێرێ. بە ڕۆژ خەریکیەتی بە شەویش خەونی پێوە دەبینێ. لەو شەنگ و تاقەتەیدا، بە باوەڕم لیێ دەوەشێتەوە دەست بۆ هەر لایەنێکی (زمان) ببات بەرهەمی لێ پەیدا بکات. بەولای خەبەردار کردنی نووسەران لە هەڵەی باو، ڕێبازێکی دیکە هەیە چاپوك سوارێکی خۆتەرخان کردووی بەپەرۆشی وەکوو ئەو دڵسۆزەی گەرەکە هاتوچۆی تێدا بکات ئەویش بەستنەوەی کوردی ئێستاکەمانە بە هی کۆنینە. زمانی کوردی لە دوای مادەکانەوە و لەزەمانی مادیش نووسینی نەبووەویا لێی بەجێ نەماوە پێ بەپێی ڕۆژگار و گۆڕانی باری ئاخاوتن و نووسین دەقی ڕەسەن و سەرچاوەی ڕوونی لەهجەکانی لێ بناسرێتە. هەر ئەم فەلاکەتەیشە بووە هۆی نەبوونی زمانێکی ئەدەبی ی کوردی کە هەموو ئاخێوەری کورد تێی بگات. ئێمە کە نەتوانین مێژ وو هەڵگێرینەوە بۆ ئەوەی لە نووکەوە قاڵبی ئەدەبی بۆ هەموو کورد زمان ڕەنگرێژ بکەین، ڕەنگە بتوانین ڕایەڵە پساوەکانی پێوەندیی ئێستاکەی زمانەکەمان بە ئاڤێستاوە گرێ بدەین وەیا هەر نەبێ بە شێوەی پسپسۆکیش بێ ئەوەندەی مومکینە لەو ڕیشاڵە کەرتَ بوانە بەیەکدە بگەیەنینەوە. دەزانم موشکیلە زۆرە لەو کاردەدا گەورەتریشیان ئەوەیە کە دوای سووتاندنی نامە زەردەشتییەکان لە سەردەمی ئەسکەندەری مەکەۆنیدا زارەوزار ئاڤێستا و گاتەکان... گەیشتنە پەهلەوی، شێوە نووسینی هزڤارشیش دەستی گیرا لە شیواندنی ئەوەی پارێزرابوو، هەڵسوکەوتی زەمانی ساسانیەکانیش لە نووسینەوەی دووبارەی ئەو نامانە کاری سەلبی کرد (هەرچەند لایەنی ئیجابیشی هەبوە، لێرەدا جێی لێ دوانی نابێتەوە).

لەگەڵ ئەمانە هەموویدا کارەکە خۆ بۆتەرخان کردن دەهێنێ، ڕێبازیشی کوێر نەبۆتەوە: وەختی خۆی لە ساڵی 971 ـ 972 کۆڕی زانیاری کورد ئەم فەرمانەی لە قەبەڵ ئەندامێکی تەرخانی کۆڕ کرد بەڵام داخم ناچێ هیچی لێ شین نەبووە لە تاکە گوتارێکی کورت بەولاوە. گوتارەکەش، ڕاستییەکەی بایەخدارە بەڵام دوورە لە گەیشتن بە ئامانج. حاجی قادر و نالی بە من سپێردران: ئێستاکە لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە صەد جاران خۆزی بەوەی تەکلیفەکە پێچەوانە بوایە و لایەنە زمانیەکە بۆ من مابایەوە.. هەل لەدەست نەچووە، من نا، د. ئاورەحمان لە بارێکدایە بتوانێ خەست خەست هۆشی خۆی بە دەستەچرای زانستی تازەوە بە ناو تاریکایی ڕابوردووی زمانی کوردی پیرۆزدا بخولێنێتەوە.. سەرچاوە چەنگ دەکەون.. لە لەهجەکانی کوردیدا زۆر خڵتەی ڕاگەیێن و ڕوون کەرەوە

هەن . . . قۆڵ وباسکی لێ هەڵماڵە، کۆڕی زانیاری عیراق و دەستەی کوردیش، بێگومان، پاڵ پشتیت دەکەن، کوردێکی بشتوانێ نەوت بخاتە چراتەوە نابێ دریغی بکات . . ئەوسا حەز دەکەی کارێك بە هەمزە بکە ناوی خۆی لە بیر بچێتەوە .

پوختەیەکی زێدە کورتی هەندێ خاڵی سەرەکی ی ئەم گوتارە لەم چەند بەندەدا دەبێتە پاڵاوتە :

1 ـ هەبوونی کەسرە موختەلەسە لە وشەدا بەندە بە داخوازی ی بەستنەوەی! فۆنیمی وەستاو بە فۆنیمی دوایەوە لە باری تایبەتیدا . بە نەمانی داخوازییەکە، کەسرە موختەلەسە دەشێ نەمێنێ و زۆر جارانیش دەبێ نەمێنێ .

2 ـ هێز Stress دێتە سەر کەسرە موختەلەسەی مەوجود لە وشەدا، ئەگەر وجودی بەند بێ بە هێزەوە بایەخی (دەنگ)یشی نامێنێ چونکە بریتی دەبێ لە هێزەکە خۆی .

3 ـ هەبوونی کەسرە موختەلەسە و هاتن و چوونی لە هیچ بارێکدا دەخلی بەسەر واتاوە نییە . هەرگیزاو هەرگیز تێداچوونی ئەو دەنگە تەئسیر لە واتا ناکا بەوپێیە، موستەحیلە نرخی فۆنیمی هەبێ . دانانی نیگاربۆی دەبێتە هۆی خۆش خوێنی نووسراو نەك دان هێنان بە فۆنیم بوونی ئەو دەنگە .

4 ـ فۆنیم بوونی دەنگ و فۆنیم نەبوونی لە حاڵاتی ڕیزمانیدا تاقی ناکرێتەوە، لە عەینی وشەدا تاقی دەکرێتەوە چونکە سوان و گۆڕانی دەنگ لە بارە جوداکانی ڕێزماندا دەستوورەکانی ڕێزمان ساغ دەکاتەوە نەك (هویە)ی دەنگ .

5 ـ هەمزە و دەنگی (هـ) لە چاو هەموو دەنگەکانی دیکە تایبەتی و چۆنایەتی دەگمەنیان هەیە هۆیەکەش دەچێتەوە بۆ نزیکایی دەروویان لە پیکی قورگ و ژێ دەنگەکانەوە . هاتنیان لە بەرایی وشەوە بە ڤاوڵەوە و تێچوونیان بۆ ڤاوڵی ئەلف و یێ و بەیەکدی گۆڕانەوەیان بەڵگەیە بۆ چالاکییان و خزمایەتی ی نێوانیان .

6 ـ وا دییارە فۆنیمی هەمزە یەکێکە لەوانەی لە گشت زمانەکاندا هەبێت، فۆنیم بوونیشی لە رادەی بەدیهییەدایە : هەر زمانێکی هەمزەی لێ بسرێتەوە کاول دەبێ کەچی بە سرینەوەی (ث، ن، ض، ط، ظ، پ، چ، ژ، گ، ڤ، ص، ڵ، ق، ح، خ، ع، غ) کە بریتین لە 17 فۆنیم هەموو زمانێك کاول نابێ .

7 ـ تایبەتیەتی دەنگی هەمزە وهێ وەها دەکات لە زۆر زماناندا ڤاوڵ بە دوایاندا بێت نەك ڤاوڵ لە هیچە ئەو دەنگانە بە ساختە دەخاتە پێش خۆیەوە . موستەحیلە میللەتان بەر لە هەزاران هەزار ساڵ بیریان لەوە کردبێتەوە کە وا بۆ خاتری ڤاوڵ لە بەرایی وشەوە بێت دەنگێکی ساختە هەڵبەستن و بیخەنە پێشیەوە . هەزاران هەزار وشە هەن فۆنیمی پێشەوەیان ڤاوڵی بەدوادا دێت، چ قەیدی دەکرد لە جیاتی (ئەز، ئێمە، ئەنگوست . . .)یش بیانگوتبایە (شەز، شێمە، شەنگوست . . .)؟ خۆ هەمزە ناعوور نییە پەکی ئاو بەرز کردنەوەی پێ بکەوێ، چونکە کەسرە موختەلەسە بەچکەی ناچارییە بە هەڵستانی ناچارییەکە تێ دەچێت .

# پەرەسەندنی مێژوویی واتای ووشەو دەوری لە دەوڵەمەند کردنی زماندا

# لێکسیکۆلۆگیا

## Lexicologie

دکتۆرە : نەسرین فەخری

**بە لێکۆڵینەوەی واتای ووشەکان و سەرچاوەی ئەو واتایانەو جیاوازییان لەو زمانەدا بە پێی کات و وچەرخ و ئەو نەتەوانەی قسەی پێدەکەن و مردنی هەندێکیان و دروست بوونی واتای نوێو هۆجیاوازەکانیو ئەنجامی ئەو رووداوانە لە زمانداو ئەو یاسایانەی پەیرەوی دەکەن و لە سەری دەرۆن . . بە گشت ئەوانە لە زانستی زماندا دەگوترێت . . لێکیسکۆلوگیا ـ Lexicologie : زانستی ووشە لە زماندا . . . کەواتە ئەم بەشە لقێکی سەربەخۆیە لە زانستەدا ئەمەش گرنگی ووشە دەردەخات، بۆیە ئێمەش پێویستە بەوچاوە سەیری بکەین و لە دەروازەیەوە بچینە ناو ئەم باسەوەو لێی بکۆڵینەوە.**

کەرەسەی زمان ووشەیە، بۆیە بۆ لە زمان گەیشتن پێویستە باش لە ووشە بگەین و بزانین کە زوربەی ووشەکان بەم جۆرە نەبوووەو بەم شێوەیەش نەهاتوونەتە کایەوە، بەڵکو هەر یەکە جەند پلەو قۆناغێکی بریوە تاگەیشتۆتە ئەمرۆی چ لە زیادبوون و فراوانیدا چ لە گۆرین و ئاڵوگۆر بەسەردا هاتن ، چونکە ووشە وەك گیانلەبەر لە بوون و زاوزێو پەرەسەندن و بڵاوبوونەوە دایە جۆرەها ئاڵ و گۆر بەسەر رووالەت و ناوەرۆکیدا دێت هەر ووشەیە بەپێی پێویستیو بەپێی دەورو توانای بۆیە نابێت سەرپێیو بە رووتی سەیری رووالەتە دیاروواتا باوو ناسراوەکەی بکەین بەڵکو لەو مێژووەوە تیی بروانین کە بە لە دایك بوونی ووشەکە دەست پێدەکات تا دەگاتە ئەمرۆو تا توانام دەشکێت بەسەریدا لە بەسەرهاتی ووردبینەوەو پەیوەندیی دوورو نزیکی بە بنجی ئەو ووشەیەوە دەست نیشان بکەین . . ، کەواتە لە هەر شوێنێکدا ئەو رووالەتەمان بەدیکرد بوەستین لە عاستیو وورد وورد لەگەڵیدا بەرەو ناوەوە برۆین تا ئەو قوولبوونەوە دەمان گەیێنێتە سەر ئەو راستییەی هەولی ـ بۆدەدەین ، نەك تەنیا ووردە جیاوازییەك وامان لێ بکات بە ووشەی لەیەك جیاواز دایان بنێین چونکە ووشە لقوپۆپی لە دەیەها رستەو ئیدیۆمدا بڵاو دەکاتەوەو بە پێی ئەو بەکارهێنانە ، کەم یان زۆر لە یەکتری دوور دەکەونەوە تا لەو سنوورەش دەچنە دەرەوە بۆ کارکردنە سەر رێزمانیش ئەمیش بەدەوری خۆی کار دەکاتە سەر فراوانیی زمان و رێگە ـ خۆش کردن بۆدەربرینی هەست و مەبەست بە گەلێك شێوەی دیارو نادیار . . .

بە کورتی زمان و ووشەی زمان ئاوێنەی راستەقینەی کۆمەڵ و مرۆڤن بە هەموو هەست و نەستێکیانەوە . . . بۆ ئەمە هەر خۆت سەرنجی ووشە بدە بە تەنیاو پاشان تێی وورد ببەوە لەپاڵ یەك و لە جۆرەها رستەداو مرۆڤی تێدا بخوێنەوە تا دەبێت بەو زنجیرەی پێی دەڵێن «زمان گرنگترین نیشانەی نەتەوەیە» . .

جا ئێمە ئەگەر بەو شێوەیە دوای هەندێك ووشە بکەوین دەبینی زۆربەیان فەرهەنگۆك بۆ خۆیان دروست

دەکەن تا دەگاتە سەربەخۆیی هەندێکیان کە سەرنج ڕاکێشەرانە ڕووی ئەو دیوی پەرەسەندنی ووشەو واتاکانیەتی لە ناوخۆیاندا . . . بۆیە کاری زمانەوان پاش کۆکردنەوەی ووشەکان لە هەر ووشەیە بکۆڵێتەوەو ئەو ئاڵوگۆڕەی بەسەریدا هاتووە لە ڕوواڵەت و لە واتادا بیخاتە ڕوو لەگەڵ هۆکانی و پلەی کۆنی و تازەییشی دەست ـ نیشان بکات لەو زمانەدا یان لە زمانە نزیکەکان لێیەوە گەر هەبوو ، ئەگەر هاتوو بێگانە بوو بزانێت چۆن و بۆ هاتە ئەو زمانەوەو بە چ دەستکارییەکەوە . . . یان ئەگەر هاتوو ئەو ووشەیە لە کارکەوتبوو بزانین بۆ لە کەیێکەوە ، بەمە هەر ووشەیە مێژووی خۆی تۆمار دەکات و لاپەڕەی ژیانی خۆی دەپارێزێت و هەر لەمەش فەرهەنگ دێتە کایەوەو بە هۆی فەرهەنگۆکی تایبەتیی هەر ووشەیە بۆخۆی . . .
هەر ئەم هەنگاونانە مێژوویە خۆی ڕامان دەکێشێت بۆ گەڕان بە دوای ووشەکانی زماندا لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە ، بەمەش دەزانین کامیان باووگشتیی وکامیان تایبەتیە بە چینێك یان کۆمەڵە کەسێك . . . چونکە گفتوگۆکەر بە هەر زمانێك بێت کە شتێکی تازەی دۆزییەوە ناچار دەبێت ناوی لێ بنێت واتە ، دەگەڕێت بە دوای ئەو ناوەدا ، جا لێرەدا یان پەنا دەبەنە بەر گەنجینەی ئەو ووشانەی هەیە لەو زمانەدا ئەگەر گونجا ئەمەش دەبێتە هۆی واتا گۆڕینی ووشەکە یان بە هۆی گۆڕینی ئەو شتانەی هەن یان بە هۆی دەرکەوتنی شتی نوێ بۆیە لێکۆڵینەوەی هۆی گۆڕینی واتای ووشەکان زۆر پێویستە ، چونکە هەڵبژاردنی واتا بە شێوەیێکی ڕاست و دروست ئاسان نییە ، هەروەها ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر دەنگەکاندا دێن
سەرنجدان و وەستانێکی باشیان دەوێت چونکە هەنگاوێکی گرنگن لە پەرەسەندنی زمانداو لێکدانەوەیان بەپێی زانستی زمان دەستمان دەخاتە سەر ئەو یاسایانەی کە پەیڕەوی دەکەن لەو زمانەدا .
جا ووشە هەیە چەند واتایێکی هەیە کە لەو واتایە بوونەتەوە بەمەش هاوواتاو دژ واتاو ووشەی خاوەن چەند واتا پەیدا دەبێت ئەمەش بێگومان بەرە بەرەو بەپێی پێویستی . جار هەیە ئەو ووشەیە دەگوێزرێتەوە سەر واتایێکی دوور کە هیچ پەیوەندیێك نەبێت لە نێوانیاندا واتە سەرەو ڕێز دەبێت و سەرسورمانێك پەیدا دەکات بەلام تیشکی زانستی زمان ڕووناکی دەخاتە سەر هەر کەلێنێك و لەسەرسوڕمان و پرسیاری بێ وەلام ڕزگارمان دەکات . . .
بۆ درێژە نەدان بەم باسە بەتایبەتی ئەم پێشەکییە وا بە باش دەزانین کە لێرەدا بەمە بوەستین و هەنگاوی دووەم بنێین بەرەو ناوەڕۆکی باسەکە بە نموونەوە بۆ ئەوەی ئەو نموونەو ناوەڕۆکە خۆی خۆی ڕوون بکاتەوەو بمان گەیێنێت بەوەی دەمانەوێت پێی بگەین .
جا لێرەدا ووشەی (دەست)مان هەڵبژارد بۆ نموونە با دوای کەوین لە زمانەکە مانداو بزانین چەندو چۆن بەکاردێت و چی دەگەیێنێت وچی لێ دروست کراوەو چ ئاڵوگۆڕێك بەسەر ڕوواڵەت و ناوەڕۆکیدا هاتووە تا بەوپێیە بگەیتە سەر دەوری ووشە لە زمانداو پەرەسەندنی مێژوویی ئەو ووشەیەو هەر ووشەیەکی تر ئەگەر بەم جۆرە دوای بکەوین و لێکی بدەینەوە . . .

**« دەست »**

**1 ـ دەست** : ناوەو واتاکەی دیارەو ڕوواڵەتیشی سادەیە .
بۆ نموونە : بە دەستی ڕاست دەنووسێت بەلام دەتوانێت بە دەستی چەپیشی بنووسێت ئەگەر ناچار بوو ، بەلام دروومان بە دەستی چەپ باشتر دەکات . .
دەست لە ووشەی دارێژ ڕاودا

**2 ـ دەستە** : دەست + ە = دەستە
وەك = دەستەیەك قەڵەم ، دەستەجل لەیەکەمدا بە واتای کۆمەڵێك ، لە دووەمدا بە واتای قاتێك . . . بە واتای یەکەمی وەك کوردی لە عەرەبیشدا بەکاردێت ، واتە چۆتە زمانی خەڵکەوە .

**3 ـ دەسك** : دەست - (دەنگی ـ ت ـ کە قرتاوە ، یان قووت دراوە + ك ـ (ik) = دەسك : دەستی شت نەك گیانلەبەر ، بۆ نموونە : دەسکی دەسکەوانەکە دیار نییە .
لێرەدا ـ بۆ جوداکردنەوەی دەستی گیانلەبەر ، لە دەستی شتی تر . . . چۆتە ئەم وێنەیەوە ، هەروەها لەبەر پەیوەندی نێوانی هەردوولا لەووەوە وەرگیراوە بۆ ئەم .

**4 ـ دەسکە** : دووبارە دەس نەك - دەست + كە = دەسكە لێرەدا بەواتای : چەپکە (باقە)، وەك : دەسکە گولێکم برد بۆ هاورێکەم . . واتای نوێ

**5 ـ دەزگا** : دەست - ت = دەس : س ـ ز = دەز + گا = دەزگا . . . گۆڕین لە رووالەتدا ، لەگەڵ واتای نوێ . . . ناوی شوێن . .

**6 ـ دەسرۆكە** : دەست - ت = دەس + ۆ + كە (پاشگرە) بەواتای نوێ ، بە ناوی پارچەجلێکی کودییە = دەسماڵ . . .

**7 ـ دەسکەوان** : دەسك + ە + وان (پاشگر) ێکی ناوییە لە کوردییدا و بەگشتی واتای خاوەن دەگەیێنێت . . بگەڕێرەوە بۆ : دەسك ، دەسکە . ، لەئاسن و دار دروست دەکرێت و بچووکەو وردە شتی تێدا دەکوترێت

**8 ـ دەستوور** : دەست + وور (پاشگر) ێکی ناوییە . . بە واتای . . یاسا ، . ژێم . . . ئەوەی پەیرەو دەکرێت لە کارو کردەی دەوڵەت و کۆمەڵدا . .

لە عەرەبیدا بەکاردێت . . بە واتای (رێپێدان)یش دێت ، زیاتر لە ناوخەڵکدا بە تایبەتی بۆ داوای لێبوردن لە (جنۆکە)و ئەمەش کاری ئایینەو هەموو دەیزانین . . .

**9 ـ دەسرازە** : دەس ، دەسرازە ، دەسرازەی بێشکە، ئەو بەنە چنراوو رەنگاو رەنگەیە کە دەکرێت بە بێشکەوەو منداڵی پێ دەپێچرێتەوە . . .

## لەگەڵ نموونەی تردا
## دەست لە ووشەی لێکدراودا

**1 ـ دەسماڵ** : دەست - ت = دەس + ماڵ = دەسماڵ ، ناوی ئەو پارچە جلەیە سێ گۆشەیەو ئافرەتی کورد لەسەر جلەوە دەیدات لەسەر شانیدا . . . واتای نوێ . .

**2 ـ دەسر** : خۆی (دەستەسر)ە ، پێکهاتووە لە : دەست + (e,o) پیتی پێوەند + سر (رەگی چاوگ وفرمانی سرین - تێپەڕە) . . .

بووە بە : دەسەسر ، پاشان بە (دەسر) ناوی ئەوپارچە قوماشە بچووك وچوارگۆشەیەیە کە سپی یان رەنگاو رەنگەو بۆ دەست سرین بەکاردێت

**3 ـ دەزگیران** : دزگیران = دەست - س = دەس ـ ز = دەز + گیران (چاوك و فرمان) = چاوکی لێکدراو ، واتای نوێ واتە گوڕرانی رووالەت و ناوەڕۆك ، هیچ پەیوەندێکی بە ئەسڵی واتاکەوە نەماوە (پەیوەندێیکی ـ معنوی ـ یە)

**4 ـ دەسنووس** : دەس + نووس (رەگ - بۆ چاوك وفرمان)ی (نووسین) = دەسنووس : ناوی لێکدراو، بەو شتە دەگوترێت کە نووسراوە یان نووسراوەتەوە بە دەست ، واتە تۆمارنەکراوە ، دەسنووس = دەسخەت (مخطوط) چاپ نەکراو . .

**5 ـ دەستەمۆ** : دەستەمۆ - بۆ ئاژەڵێکی ماڵی کراوە ، پشیلەیەکی دەستە - مۆیە - ماڵییە - واتای نوێ‌و ناوی لێکدراوە . .

دەستە مۆکردن ـ ماڵی کردن ـ چاوکی لێکدراو .

**6 ـ دەسخەرۆ** : دەسخەرۆ فێڵباز دەسخەرۆکردن دەست برین ، فێڵ لێ کردن . . یەکەم ناوی لێکدراو دووەم چاوکی لێکدراوو واتای نوێ . . .

**7 ـ دەسنوێژ** : دەس + نوێژ = دەسنوێژ ناوی لێکدراوو واتای نوێ : ئامادەیی بۆ نوێژ کردن . . . دەسنوێژ ی هەیە یان نییە . . (وضوء)

**8 ـ دەسنوێژ شتن** : چاوکی لێکدراوو واتای نوێ . . .

**9 ـ دەستە خوشك** : دەستە خوشك : ناوی لێکدراوەو واتاکەی نوێیە دەستە خوشك : هاوڕێی کچ . . .

کورد دەڵێت : (دەستە خوشکی) بە تەمای (دەستەبرا) لە جێگای خۆی ئەمێنێتەوە . . .

**10 ـ دەستار** : دەستار : لە (دەست هارین)ەوە هاتووە لە : دەست + هار (رەگی چاوگی وفرمان)ی هارین)و هار بووە - بە ار ـ (ar) بۆ ئاسانی ، دەستار . . ناوەو بۆ ئەو شتەیە کە لە بەردە هەشە لە دارە ، دەغڵ و دان و ساوەرو گەنم و شتی پێ دەهارن ، واتە هارین بە دەست.

**11 ـ دەستیار** : دەستار.

**12 ـ دەسکەوتن** : دەست + کەوتن = دەستکەوتن : چاوکی لێکدراوە بۆ نموونە : هیچم دەست نەکەوت . دەسکەوت ناوی لێکدراوە ـ قازانج ، ئەم کارە دەستکەوتی باشە .

**13 ـ دەست قەدان** : هەوڵی ئیش کردن وان (هەوڵ دان) چاوکی لێکدراوو واتای نوێ . . .
**14 ـ دەست هەڵ دان** : دەست + پێشگــری (هــەڵ) + دان ، چاوکی لێکــدراوو واتــای نوێ ، یەعنی : دەست پیَکردن . . قۆڵ لیَ هەلمالینە
**15 ـ دەست پیَکردن** : هاومەبەستی : (دەست هەڵدان)ە
**16 ـ دەست گرتن** : چاوکی لێکــدراو ، واتـــای نوێ : یارمەتیدان ، هاریکاریکردن .
**17 ـ دەست بەســەر** : دەست + ئامـرازی (بە) + سەر = دەست بەســەر ناوو ئاوەڵنـاوی لێکـدداوو واتای نوێ = لە ژێر چاودیری . بۆ کەسێك بە کاردێت کە شتێکی کردبێت بۆیـە میـری لە چاوغافڵی ناکات . . . تا ماوەیێك تالیَی دڵنیا دەبێت .
**18 ـ دەستـەبـەرە** : واتە ئەو شتەی بەدەست دەبرێت یان بەدەست هەڵ دەگرێت
ئەمـە زیـاتـر کرێکـار بەکاری دەهێنێت لە کارکردندا ، بە دووکەسیش هەڵی دەگرن وەکو دارە مەیت کە دوو سەری هەیە (نقاڵە) . . .
**19 ـ دەستکرد** : دەست + کرد (بناغەی چاوکی کردن) = دەستکرد : ناوی لێکدراو ، واتە دروست کراو.
**20 ـ ئاو دەست** : ناوی لێکدراو ، شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن ، ناوی شوێنە . .
**21 ـ دەسمـایـە** : دەسکەوت ، ئەوەی هەیە بەدەستەوە ، یان لەبەر دەستدایە ، واتە : سەرمایە .
**22 ـ لە دەست دەرچوون** : چاوکی لێکدراو ، بووەش بە : لە دەس دەرچوون : واتا لە کیس چوون ، زایەکردن ، بەسەر چوون تێپەر بوون .
لە دەستم چوو بە خوا هەرگیز نایێتەوە
لەگەڵ گەلێك نموونەی تردا

## دەست لە « جووتە ووشە »دا

**1 ـ دەستە دەستە** : واتە کۆمەڵ کۆمەڵ یەك لە دوای یەك
**2 ـ دەست وبـرد** : وایـە یەکسـەر (حالاَ) ، وەری گرت و گەیـانـدی ، بەم دەست وەری گرت بەویـان گەیـاندی ، دوای نەخست ،
**3 ـ دەم ودەست** : واتــە دەست وبــرد ، هاومــەبـەستی یەکترین ، یەکسەر دەم لێرەدا مەبەستی کاتە ، وەختە واتە لەهەمان کاتدا جیَبەجیَی کرد ، گەیاندی . .

**4 ـ دەستاو دەست** : دەست و دەست ، دەگە یێنێت وەك دوو نمـــوونــەکــەی سەرەوە واتــە «دەست و برد» و «دەم و دەست» بە یاریـدەی پیتی پێـوەنـدی (و) هەمـان ووشە کە دووبارە بۆتەوە پێکەوە بەستراون .
ئەمەش بە شتێك دەگوترێت کە بە دەست چەند کەسێکدا تێپـەرێت ، دەڵێن : دەستـاو دەست کراوە ، واتــە دەستی چەنــد کەسێکی دیـوە ، هەروەهـا «دەستـاو دەست» بەو شتــەش دەگــوتــرێت کە خۆت وەری بگــریت و خۆت بێگـەیینیت واتـە ئەو دەستـەی شتـەکەی وەرگرت هەر ئەو گەیاندی
**5 ـ دەست وبازوو** : واتە دەست و مەچەك ، قۆڵ . .
**6 ـ دەست وپـل** : یان دەس وپـل بەلادانی دەنگی (ت) واتـە دەست و پەلی دەست بۆ نمـوونە دەست وپلت باش بشۆ پێش نان خواردن .
**7 ـ دەستـەو دایـەرە** : دەستـە ، دە ستـە دەستە ، دەستەو دایەرە . . . ئەمە تەنیا بۆ سەرنجدانی ووشەی «دەستە» کە لە هەر ـ سێکـدا کۆمـەڵ دەگـەیینێت بەلاَم هەر یەکەس بۆ مەبــەستی تایبـەتیی و لە شوێنی خوێـدا بەکـاردێت . . . دەستـەو دایـەرە = دامو دەزگا ؛ هەروەها «ماڵ وحاڵ»یش دەگـرێتـەوە ، بۆ نموونە خوایە ئەم دەستەو دایەرەیە ئاوەدان کەیت ، واتە ئەم ماڵ وحاڵە . . .
**8 ـ دەستەو دامان** : ـ بەواتای «دەخالەت» ، پەنا بردنە بەر کەسێـك کاتی تووش بوونی کارەسـاتێـك ، یان کەوتە ناو تەنــگ و وچــەڵـــەمـــەیێکـەوەو کەس نەبێت لەو کاتـەدا بەدەنگیـدا بگـات یان بتـوانێت یارمەتیی بدات ئەو کەسە نەبێت کە پەنـای بردۆتـە بەر ، جا ئەگـەر هاتـوو ئەو کەسە شتێکی هەبێت بەرانبەری پیَی دەڵێت : دەستم ـ دامێنت من کردم تۆ نەیکەیت .

9 ـ **دەست وسـان** : یان دەس وسـان ، بۆکەسێکـە بێ دەسـەڵات وکەم توانـا ، واتـە بەوکەسـە دەگـوترێت کە هەمیشە بە ئامادەیی لەبەر کەسێك بوەستێت بۆئەوەی هەر ئەمرێکی کرد ئەم گورج بۆی جێبەجێ بکات ، واتە هەر دەم بەسەر کزییەوە وەستاوی بەر دەرگای بێت . . .

10 ـ **دەست و پێوەنـد** : دەس وپێـوەند ـ لێرەدا دیارە کە مەبـەست ئەوانـەن کە بەردەسن ، ئیشکـەروکارەکـەرو خزمـەتکاری زەمانی جاران دەگەیێنێت . . . ئەوانەی کە بە خیـزانێـك یان کەسێکی دەسـەڵاتـدارن، بەسـتـراون بەوانـەوە وەك ئاغـاو خزمـەتکار ، دەرەبەگ وئەوانەی وان لەژێر دەستیدا . .

11 ـ **دامـو دەزگـا** : ـ دەزگا ـ واتە ـ دەستگا ـ بە ئەسڵ بە تەنیـا دایـەرە دەگـرێتـەوە ، «دامـو دەزگـا»ش بۆ هەمـان مەبەستە . . .

لەگـەڵ گەلێـك نمـوونـەی تردا کە دەوری دەست وئەو واتایانە دەردەخات کە هەر یەکە یان جودا ـ دەبێتەوە، یان هاومـەبـەست دروست دەکـەن هەر یەکە بەپێی پێویستیو توانـای لە زمـانـدا . . . جا تا زۆر بەکاربێت و بە جۆرەها شێـوە بەکـاربێت دیـارە دەوری فراوانتـرەوبۆشایی زیاترپڕ دەکاتەوە لەو زمانەداو بە هێزو بە توانایە . .

با بێینـەسـەر لایـەنێکی تری بەکـارهێنـانی (دەست) ئەویش لە :ـ

### ئیدیۆم و زاراوەکاندا

«دەست» هەروەهـا دەوری تایبـەتیی خۆی هەیـە لە دروست ـ کردنی زاراوەو ئیـدیـۆمـدا جا لە وێنەی ووشەی لێکدراودا بێت یان لە وێنەی رستەدا.

لێرەدا یەکەم دەست دەکەین بە وێنەکانی لە ووشەی لێکدراودا . .

1 ـ **دەست پاك** : ئاوە ڵفاوێکی لێکدراوە ، بەڵکو ئیدیۆمە بە واتـای (ئـەمین) دژ ی «دز»ودەست پیس بۆنمـوونـە : دەس و دەرونی پاکـە . . . واتـە بێگەردە هیچ گومانێکی لێناکرێت لێی دڵنیابە . . .

2 ـ **دەسـت پیس** : ـ یان ـ دەس پیس ـ دژ ی «دەسـت پاك»ە واتـە چاو غافـڵ کەیت دەست دەبات بۆهەر ووردە شتێك بەرچنگی بکەویت . .

3 ـ **دەست درێژ** : دووواتـای هەیـە یەکـەمیـان (دەست پیس)ی دەگـرێتـەوە واتـە بۆی هەڵکەوێت دەست بۆهەر شتێك درێژ دەکات. واتە حەز بە دزی دەکات . .

واتـای دووەم : بەیـەکێـك دەگـوترێت کە ماڵدارو بە دەسـەڵات ، خاوەن پارە بە پارە دەستی دەگـاتـە ئەوەی دەیەوێت . ، واتە بە دەسەڵاتە

4 ـ **دەسـت کورت** : بە پێـچـەوانـەی واتـای دووەمی «دەسـت درێـژە» دەسـت کورت بە فەقـیـرو هەژار و بێدەسەڵات دەگوترێن ، واتە لەبەر بێ پارەیی وکۆڵەواریی خۆی دەستی ناگـاتە هیچ شتێك ، واتە لوقمە نانەکەی بە کولـە مەرگی چنگ دەکـەوێت ، کورد دەڵێت. «لـە سەر ساجی دانیشتووە».

5 ـ **بە دەسـەڵات** : بە دەستـەڵات یەعنی دەستی دەروات بروانە دەست درێژ .

6 ـ **بێ دەسەڵات** : بێ دەستەڵات : واتە دەست کورت بروانە ئیدیۆمی ناوبراو.

7 ـ **دەستـەرۆ** : یان ـ دەسـرۆ . . دەست + (رۆ) رەگی فرمـانی «رویشتن وڕۆیی»ە واتـە دەستی دەروات ئەمـە هاومەبەستی : بە دەسەڵات و «دەست درێژە» سەیریانکە لە سەرەوە.

8 ـ **دەسـت بر** : دەسـت + بر (رەگی فرمـان وچاوکی ـ برین» ئەمـەش بە کەسێـك دەگـوترێت کە «فێڵبـاز» بێت گاڵتە بە خەڵك بکات . . تا دەگات بە مەرامی خۆی پارە دەکێشێتەوە لەوکەسە ، بەڵێنی درۆی پێدەدا . . . پاشان دەردەکـەوێت کە «دەستی ئەوکەسـەی بریـوە بە جۆرێك خۆشی دەستی نەگات بەوەی کە ئەوبەتەمای کردبوو . . .

9 ـ **دەست بڵاو** : واتە دەست بە ماڵی خۆیەوە ناگرێت ، نرخی پارەوپوولی خۆی نازانێت وبیـر لە دوا رۆژ ناکاتەوە لەبەر هەر هۆیێك بێت : بێ ماندوویی دەستی کەوتووە ، یان خۆی دەنوێنێت، یان کورت بینەو نازانیت کە «پوولی سپی بۆرۆژ ی رەشە» . . .

10 ـ **دەست باد** : واتە «دەست بەد» دەسی بێ کەڵکە پارەو پوولـی تێـدا ناوەستێت، لەم لاتێی کـەیت لەولا

نامێنێت ، واتــە «دەست بلاو»ە دەست بە ماڵی خۆیــەوە ناگرێت ، بروانە ئیدیۆمی پێشوو . . .
11 ـ **ژێر دەستە** : دەست و پێوەند ، مەحکوومی کەسێك بوون لەبەر هەر هۆیێك بێت .
12 ـ **دەست سپی** : دەست سپی ـ واتــە چاوبــەستراوە ، بێ دەسەلاتە هیچی لە دەست نایێت ، چاوی نەکراوەتەوە .
13 ـ **دەست رەش** : ئەمــەش بۆ کەسێکــە کە کارێــك بکـات بۆ کەسێك سوودی لێوەرناگرێت ، واتە کارەکەی لە جێگـەی سوود زیـان دەگەیێنێت بەو کەسە . . ئەمەش وەك دەڵــێـن : بەخــتــی رەشــەوخۆیوبەختی خۆی . . دەست سپی لە رووالەتدا دژ واتای ـ دەست رەشە بەلام لە ناوەرۆکدا واتە لەرووی واتاوە هەر یەکە شتێکە .
14 ـ **دەســت رەنــگــیــن** : دەســت رەنــگین ، بە تەواوی دژ واتای «دەست سپی» بە ئەمەش بە کەسێك دەگوترێت کە شارەزابـێـت ، سەری لە شت دەرچـێـت و دەســت و سنعەتی جوان بێت . . لەمەدا ئافرەت دەگرێتەوە . . .
15 ـ **سەردەســتــە** : سەر + دەســت ، ئەمــەش : شتی نایابی هەڵبژاردە دەگرێتەوە . . .
16 ـ **دەسەلاتدار** : دەسەلاتدار ـ (دار) لێرەدا پاشگرێکی ناوییە بە واتای «خاوەن» یان «بە» واتە بە دەسەلات خاوەن دەسەلات ، ئەو کەسەی دەستی دەروات .
17 ـ **دەستـەپـاچـە** : دەستە پاچە یان ـ دەسەپاچە ـ پاچە لێـرەدا لە «پێچـان»ەوە هاتووە ، واتە : دەست بەسراو بەو کەســە دەگــوتــرێت کە «بێدەســەلات» بێت و هیچی لەدەست نەبێت ، دژی «دەســەلاتـدار»ە کورد دەڵێت : دەســەپـاچـە دانیشتووە . لەگەڵ ئیدیۆمی تردا . . کە وەك ئەمانەی سەرەوە لە وێنەی ووشەی لێکدراودان . . .
18 ـ **دەستەو ئەژنۆ** : دەستەو ئەژنۆ دانیشتووە بەشی دووەم لە ئیدیۆمانە» لە وێنەی رستەدان بۆ نموونە :ـ
1 ـ **بە دەستی** : خەڵك مار ئەگرێ : ئەم ئیدیۆم «زاراوە»یە بۆ کەسێـك بەکـاردێت کە کاری خۆی بە دەستی خەڵـك جێ بـەجێ بکـات لێـرەشدا نەك لەبەر ئەوەی بە دەسەلاتە بەوان ئیشی خۆی دەبـاتــە سەر بەڵکـو لێـرەدا زەرەر و زیان بەخشــە ، بۆ ئەوەی ئەگــەر کارەکــە نەچـووە سەر ئەوان تووشی بن و مارەکــە کە لێرەدا تووش . . هاتنـەکـەیـە ـ بەوانـەوە بدات و خۆشی وا لێی بێتـە دەرەوە وەك «نـەبـای دیبێ و نە باران» .
2 ـ **دەستی** : (دەسی) لێ وەشێنراوە ـ ئەم ئیدیومەش کە وتـوتـە ژێـر کاری ئاینەوەو هەمووش دەزانین هەندێك حاڵــەت کە تووشی مرۆڤ دێت ئەنجــامی دواکــەوتنی کۆمــەڵ کە بەتــایبــەتی ئافرەت دووچارە دەبـوو ، وەك ماتەمینی ، رەنگ هەڵبرزکان و نەخەوتن و نەخەواردن و یا «تــەقینـەوە»و لە هۆش چوون ـ بۆ شاردنـەوەی یان بایـەخ نەدان بە هەستی مرۆڤـایـەتی ، بەوە لێکـدەدرایەوە کە ئەو کەسـە ـ شەیتـان و جنـۆکـە وەلێیـان داوە . وەیـان بەسـەر شتێکدا کە نییە تا تاوانباری راستەقینە بەرەڵلاو سەربەست بێت . . کەواتە «دەسی لێ وەشێزاوە» یەعنی : شێت بووە یان بەرەو شێتی دەروات . .
3 ـ **دەســت بۆ ئاڵـتــون بەرێـت دەبێت بە خۆڵ** : واتــە «بێ بـەختـە» بەختی رەشــە ، ئەمـە هاومەبەستی ئیدیومی «بچێتـە سەر سیــروان ووشکی ئەکــات»ە . . . ئەمـەو گەلێـك لە نمـوونەکانی تریش لە زمانی عەرەبیدا هەیەو بۆ هەمان مەبەست بەکاردێن . .
4 ـ **سەرت ئەتــاشیو ئاوێنــەشت ئەداتــە دەست** : واتــە کەتــنــەکــە پێ دەکــات و پێشت رادەبــوێــرێت ، یان کەتنـەکـەت پێ دەکات و دەشیدا بە سەرتا ، واتە جامبازو بەلایێکـە بۆخۆیو هارو هاجێکـە نەبێتـەوە . . . لە هیـچ جۆرێك دەرەقەتی نایێت . .
5 ـ **دەست بە دەمی سەگا ئەگا** : ئەمەش دیارە بۆ کەسێکی هارو هاجـە ، ئەگەر وانەبێت چۆن لە هارو هاجێکی وەك سەگ نەتـرسێت کە دەزانین چ ئاژەلێکی درنــدەیـە گەر پەلاماری کەسێکیدا لە کۆڵی نابێتەوە . جا وەرە ئەم کەسە ئەو سەگە بورووژێنێت و خۆی لە خۆی هاری بکات .
6 ـ **دەستی نەمــەیــوە** : مەیین ـ دیـارە بۆشتی شل ، کە تونــد دەبێتــەوە لە سەرمـانـدا ـ ئاو دەبێت بە بەفـر یان بۆ دەست و پێ کە لە سەرمـانـدا لە کار دەکەوێت یان شیر کە

دەکرێت لە ماست . . . جا لێرەدا بە یەکێک دەگوترێت کە دەستی شل بێت لە کاردا ، هەڵەیە لە کارکردندا هۆشی لای کارەکەی نییە هەر شت بەردەبێتەوە لە دەستی جا دەشکێت، دەرژێت . . واتە وەك دەستی تەزی۔ بێت وایە ، بەم کەسە دەڵێن دەستی نەمەییوە واتە توندو تۆڵ نیە .

٧ ـ **دەستی گۆ ناکات** : واتە ئیش ناکات ، پەنجەکانی دەستی نایێتەوە یەك، جا بەهۆی نەخۆشییەوە بێت، یان لە سەرماندا، یان رووداوێکی وەختیە .

8 ـ **دەستی ئەوی تێدایە** : واتە وەك کوردەکە دەڵێت : پەندی ئەوە دەسیسەی ئەوی تێدایە ، کەتنی ئەوە ئەمەش بۆ کەسێك بەکاردێت کە کەسێك تووشی سەرێیشەو کارەسات بکات و هەر وەك ئاگای لە هیچ نەبێت وایە واتە کاری خۆی لەژێرەوە دەکات .

9 ـ **دەست بەستەیە** : واتە گیرۆدەیە ، گرفتارە ، ناتوانێت هیچ بکات هەر هۆییك بێت یان بەهۆی کەسێکەوە کە ناچاریبووە .

10 ـ **دەست نیشانی کردووە** : دەست نیشان کردن ئەمەش بۆ کەسێکە کە شتێکی دیاری کردبێت وچاوی تێ بریبێت و ئاراستەی کردبێت و خۆی بۆ ئامادە کردبێت . . واتە دایناوە، خستوویەتە بەر چاوی . . .

11 ـ **دەست لە بەروکی ناکاتەوە** : دەشگوترێت : دەست لە یێخەی بەرنادات ـ یان ناکاتەوە ئەمە لە عەرەبیشدا بە هەمان شێوەو بۆ هەمان مەبەست بەکاردێت . . . بەرۆك ـ واتە ـ یێخە ـ نەوەی لە مل دەئاڵێت . «بەرۆك»یش پێشی مل و سەرەوەی سنگ دەگرێتەوە، هەمووش دەزانین کە دووکەس پەلاماری یەك دەدەن ئەو شوێنە دەگرن بەلاّم لێرەدا مەبەستی کەسێکە کە تێی ئالاّوەو تەنگی پێ هەڵچینەوەو نەفەسی لێ بریوەو لێی نابێتەوە واتە وازی لێ ناهێنێت . .

12 ـ **دەستەو ئەژنۆ دانیشتووە** : واتە دەستە پاچە بۆی دانیشتووە نازانێت چی بکات ئەمەش بۆ کەسێك بەکاردێت کە ئەنجامی تەنگ وچەڵەمەییك کە تووشی دێت لە بەر پەستی و نائومێدی، پشتی سارد دەبێتەوەو لە پەلوپۆ دەکەوێت و رەشبینی دایدەگرێت هەروەك سالم دەڵێت کە تورکەکان سلێمانیان داگیرکرد . . گەرێن با گۆشەگیریم بم ، دەستەو ئەژنۆ کەف زەنان .

گێژە لۆکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان

13 ـ **دەستی لێ شتووە** : یان (دەسی) ـ ئومێدی لێ بریوە ، هیوای پێ نەماوە ، جا لە منداڵ بێت ، یان کەسێکی کە ئومێدت پێی هەبووە یان کارێك . . .

14 ـ **دەست و قەڵەمی هەیە** : واتە . خوێندەوارە .

15 ـ **..ێی دەست نادات** : بەکەڵکی نایێت ـ سەرنجی هەر یەکەبدەو ئەبینین چ واتاییەك چەندەها واتای نوێ دروست دەکەن . .

16 ـ **دەستی خستە سەر شتەکە** : واتە ـ دۆزییەوە . . . واتە ئەو شتەی کە گێژی کردبوو ، خستبوویە مەراقەوە .

17 ـ **دەست نادات** : واتە بە کەڵك نایێت ، بێ سوودە

18 ـ **دەستی بۆ هەڵدەهێنێتەوە** : بۆ منداڵ لە رووی دایك و باوکدا، یان بچووکێك لە رووی گەورەدا بوەستێت، چەنە بازیی لەگەڵدا بکات و پەلاماری بدات و دەستی لێ بەرز بکاتەوە . . ئەمەش نارەواو جێی نەفرەت و نەعلەتە . .

19 ـ **دەست لێ بەردان** : دەستی لێ بەرداوە ، واتە وازی لێ هێناوە بە پێچەوانەی دەستی لەبەرۆك ناکاتەوە یان وازی لێ ناهێنێت . . . ، دەستی لێ هەڵگرتووە

20 ـ **بە پیری دەست بە هەویری** : ئەمەش بۆ کەسێك بەکاردێت کە لە تەمەنێکدا، واتە پیرە کەچی وەك گەنجێك و هەرزەکارێك دەجوولێتەوە ئەمەش نابێت ، چونکە هەر تەمەنەو رەوشتی خۆی هەیە ، کورد بەمانە دەڵێت : دڵ تەرن ، دڵیان بەخۆیانەوەیە . .

21 ـ **دەسی گۆج بووە** : یان (گۆج بووە) دیارە دەستی گۆج وەك دەستی ساغ نییە ، یان کاری پێ ناکرێت ، یان بەزەحمەت ، لەوانەشە لەبەر لەکارکەوتنی ئەو دەستە شت برژێنێت و بیرژێنێت و بشکێنێت ، جا ئەمە بە تەوسەوە بە کەسێك دەگوترێت ئەمە کارو کردەوەی بێت . . . واتە هاومەبەستی «دەستی نەمەییوە»یە

22 ـ **دەست بە سەرە** : بروانە ـ دەست بەسەر ـ پێچەوانە

سەربەست ئەم رستەو ئەویان ووشەیێکی لێکدراوە «فرێزە».
**23 ـ هیچی لەدەست نایێت** : ئەمە هاومەبەستی «دەست پاك»و «بێ دەستەڵاتـە» واتە هیچی پێ ناکرێت و بۆ هیچ کارێك بە کەڵك نییەو نایێت.
**24 ـ دەسی لێ هەڵگرتووە** : بروانە : دەست لێ بەردان واتە وازی لێ هێناوە . . .
**25 ـ دەستی لە هەمـانـە دەرچووە** : واتـە : هیچی بۆ نەماوەتەوە، کار لە کار ترازاوە . .
**26 ـ هەر دەستی ئەگەزێ** : پەشیمانە.
**27 ـ دەسی بە سەرکێشـاوە** : ئەمـە بە واتـای ـ داگیـری کردووە ، ئەمەش کاری خاوەن دەسەڵاتە . . .
**28 ـ دەسی بەسـەرا گرتـووە** : براوانـە ئـیدیومی سەرەوە . . . (دەسی بەسەرا کێشاوە) هەردووکیان هاومەبەستن
**29 ـ دەس نەبا بە دەسا** : (دەست دەدات بە دەستـدا) ئەمـە بۆ کەسێـك بەکـاردێت کە تێـداچـوویێت ، واتـە بەڵگەی پەشیمانییە واتە پەشیمانە لەوەی کردی و لەوەی سەریداهات . .
**30 ـ ئاوبێنـەو دەست بشـۆ** : ئەمـەش کەسێك بەکاری دێنێت کە هیچی پێ نـەبـرابێت ، باش مانـدوویـوون و رەنـج دان . . . کوردەکـە دەڵێت : عاساتی وعاباتی برۆ بەخێر هاتی
**31 ـ دەسی پی کـردوە** : واتـە شتـەکـەی تازەکـردەوە ، لەوانـەشـە «ئـاگـری کۆن بە پاکـات» ئەمەش مرۆڤی ژیر سڵی لێ دەکاتەوە . .
**32 ـ شەیتـان دەسی لێشتـووە** : واتـە وازی لێ بێنـە ، ئەمـەش بەتـایبـەتی بە کەسێك دەگـوترێت کە باسی مردوویـەك بکـات بە خراپـە، مردوو تەواو لە هیچی پێ دەکـرێت و نەهیچت پێ دەکرێت بەرانبەری ـ تەواو بوو ـ ئەوی رۆی رۆی . . .
**33 ـ خەریکە دەسە چەورەکەی بەسەر منا بسوێ** : ئەمە هاومـەبـەستی «بـۆ دارەکـە لەسەری منا بشکێ» کەسێك دەیڵێت کە هەست دەکات : ئەوەی کراوە دیارە باش نییەو ئەو کەسە دەیەوێت خۆی رزگاربکات و بیدا بەسەر ئەمدا.
دەشگـوتـرێت : دیـزە رەشـەکـەی دووکەڵ لەبن ، دەسە چەورەکەی خۆت ئەسووی لەمن؟
واتـە ئەو کەسـە لەبەد کاریدا «رەشە» و «دووکەڵاوی» یە ـ بەڵام منیش ئاگاداری ئەوەم
**34 ـ پەریشـانـە بە دەستییـەوە** : واتـە : گرفتـارە. تووش بووە، یان بۆ کەسێکی خراپە ، یان بۆ نەخۆشێکی پەدخووەو بیانوو
**35 ـ بە دەستی ئەنقـەست** : نەك ئەنجـامی نەزانین ، ئەمـەش بۆ کەسێکـە : زیـان بگـەیێنێت بە کەسێـك ، دەگوترێت «بە دەستی ئەنقەست وای‌کرد ، یان وای لێکرد ، ووشەی «ئەنقەست» ـ عن مقصد ـی عەرەبییە
**36 ـ دەسـت گیـری بوو** : دەست گیـر بوون ـ واتـە ـ دەستی کـەوت ، دەست کەوتن . . دۆزییـەوە، بە چنگی کەوت
**37 ـ دار دەستەیانە** : یان دار دەست ، واتە داری دەستە ، وەك داری دەست وایـە، ئەمـەش بەو کەسە دەگوترێت کە کەسێـك بە هەوەسی خۆی هەڵیسـوورێنێت و ئەوەی بیەوێت بەوی ـ بکات و بیباتە سەر .
ئەمەو لەگەڵ گەلێك نموونەی تردا . . .

## ئێستـە دێنـە سەر ووشـەی «دەست» لە پەنـدی پێشیناندا :

1 ـ ئەگـەر سەر نەیێشێت (دەسـرۆکی) نائاخێتێ (واتە تێ ناپێچێت) . واتـە شت بێ هۆنابێت ، واتـە بزانە ئەوهۆیە چییە بیدۆزەوە، گەر دۆزیتەوە چارەسەر دەکرێت ، دەست بخـەرە سەر دەردەکـەو دەست نیشـانی بکـە تا بزانیت دەرمـانی چییـە ، دەرمـانی بکـەیت. واتـە ئەم کارە لە جێگەی هەڵچوون و هەڵەشەیی ژیرو هیچی گەرەکە.
2 ـ سەرێـك بە دەستـی خۆت نەیـخـوریێ خورووی ناشکێ واتە خۆت دەبێت مشووری کاری خۆت بخۆیت ، ئەگینـا کەس بەتـەنگتـەوە نایێت . . هەمـان «پـەند لە عەرەبیدا هەیە»
3 ـ ئاو بە دەستی خۆت نەخۆیتەوە تامی نییە : واتە خۆت کاری خۆت بکە تا نرخی خۆت بزانیت، چونکە ئەگەر بە

خەڵــك كارت بەريتــە سەر نە نرخی دەزانیت و نەتـامی چونكــە نازانیت چۆن كرا ، هەر ئەوەنـــدە دەزانیت كە ، (حــازر خۆری بەر سیــبــەریــت) بەر گەرمــی و گری نەكـەوتـوویت ، ئارەق لە پێنـاویـدا نەرشتووە ، وە ئەوەی نرخی شتێـك نەزانێت هەر وەك چنگی كەوت بەئـاسـانی هەر بە ئاسانییەش لە ناوی دەبات ، .

4 ـ چاو لە دەسـت بێـت دەسـت بەسـتــەیت : لەمــەدا دەردەكـەوێت كە كورد چەنـد حەزی لە مرۆڤی بێ ئیش و كار نەكـردووەو هەر بەم و بەوولەسـەر حیسێبی ئەم یان ئەو ژ یاوە . . واتە چاوت لە دەستی كەس نەبێت لەهی خۆت زیـاتـر ، ئەو دەستەی پێی دەخوێت با ئەوەی دەشیخۆێت بەو دەستە دەستت كەوتبێت .

5 ـ دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە : واتە كاربكە چونكە ئەوەی كاردەكـات و مانـدوو دەبێت هەمیشە تێرەو موحتاج نییەو لە برسێتی ناترسێت .

دەشگـوترێت : دەستی تێـر لەسـەر زگی برسییـە ، واتە دەست كە تێر بوو برسێتی زگ بێ دەنگ دەكات .

6 ـ سوارو پیادە ئەگەر حەز بكەن دەست و مۆس دەكەن : واتــە دوو كەسی لەیــەك زویـر ئەگــەر بیـانــەوێت دەتوانن ئاشت ـ بینـەوەولەیـەك ببـورن . . . ئەمـە (ئیـدیۆم)یشە . . . بروانــە كورد چەنـد لە شەروزویری سڵی كردۆتەوەو چەنْد حەزی بە ئاشتیو ئاسایش كردووە

7 ـ سەرچۆپی بدە دەست سەگ بۆ لای خوانچەی رائەكێشی :

واتە خۆپەرست هەر خۆی لە بیرە ، بێ سفەت هەر بیر لە خۆی دەكاتەوە ، واتە بروای پێ مەكە . .

8 ـ ئەوەی بە پەیــژەدا سەركــەوێـت دەبـێـت لە خوارەوە دەست ـ پێ بكات . .

واتــە : سەركــەوتـن بە بازدان نابـێت ، هەوڵ و تەقـەلاو كۆششی دەوێت هەنگـاو بە هەنگاو پلە بە پلە . . واتــە رێگـەی گەیشتی بە مەرام بەوجۆرە راست و ئاسـان نییە . .

9 ـ فێری رۆیشتن ببە ئنجا دەست بكە بەراوكردن : (دەست كردن) ئەمـە دەتـوانین بە هاومــەبــەستی پەنـدی ژمــارە هەشت دانێین . . واتــە دووبــارە دەبێت مرۆڤ هەنگـاو هەنگـاو بچێتـە پێشـەوە واتە هەڵە مەبە تا تووشی پەشیمانی نەبێت .

10 ـ شین و شایی دەستە وایی :

واتــە خۆشی بە نۆبــەت ، ئەمەیە ژ یارن هەمیشە بۆ كەس ناچێتە سەر هەر بە خۆشی ، واتە دەبێت مرۆڤ چاوەروانی هەمـوو شتێك بێت و بۆی ئامادەبێت ، لای سەیرنەبێت تا كۆڵ نەدات و نائـومێـدی نەیدات بە عەرزا . بەڵكو شانی بداتە بەر تا خۆی بگرێتەوە .

سەرنجی ئەم پەنـدەو ئەوانـەی لەم چەشنـە بدە كە لەسەر كێشی شیعر رۆیشتوون . .

11 ـ ئینســـان بچێتــە شاری كوێــران دەبێت دەست بە چاوەوە بگــرێت ئەمــە لە عەرەبیشـدا هەیـە . . واتـە لە سنــووری عورف عاداتـی خەڵــك دەرنــەچێت و خوو ورەشـتـی ئەوان نەخــاتــە لاوە . . رێــزگــرتن لە باری كۆمــەلایــەتییـان و هەست و نەستیـان پێـویستـە . . لە عەرەبیدا پەندێك هەیە كە ئەمە دەگەیێنێت بە كوردی چی دەخوێت بخۆ بەڵام ئەوە لەبەركە كە خەڵك لەبەری دەكات .

12 ـ گرێی دەستـان مەخـە دوانان : واتە كار دوامەخەو لە شوێن و كاتی خۆیـدا ببیـەسـەر ، واتـە فرسـەت لە كیس مەدە ، نازانیت ئەنجــامی ئەودواخستنـە چی روودەدات . . . لە عەرەبیدا پەندێك هەیە بۆ هەمان مەبەست .

13 ـ چەپلە بەدەستێك لێ نادرێ : واتە هەموو كارێك بە تاقی تەنیــا ناكـرێت ، پێـویستی بە كەسی تر هەیـە ، بە یارمەتیدانیان ، واتە كار بە هاوكاریو پشت بە یەك دێتە كایەوە .

هەمان پەند لە عەرەبیشدا هەیە . .

14 ـ قەرز بە قەرز دەست ئارداوی :

واتە شت بە یەك لایەن و لەیەك لاوە ناكرێت ، دەبێت دوو لایی بێت ، ئەمرۆ من سبەینێ تۆ . .

15 ـ دەستێــك نەتــوانم بیبــرم ماچی ئەكـەم : ئەگـەر دەرەقـەتی كەسێـك نەهـاتم خۆمی لێ نزیك دەخەمەوە ، مەرایی دەكـەم ، ئەمـە وەك (ئیـدیـۆم)یش بەكـار دێت بۆ

کەسێك هەل پەرست بێت بەپێی کات بجوولێتەوە ، جا ئەم جۆرە کەسانە بەراستی جێی مەترسین .

16 ـ پیاوی ستەم بار دەربە دەری دەستی ستەمکارە : واتە کە (ستەمبار هەبوو یەعنی . . ستەمکار هەیە)، کە زۆر لێکراو هەبوو دیارە زۆر دار هەیە . . واتە ئەم بێ ئەو نابێت ، واتە ئەو لادەیت ئەم لادەچێت .

17 ـ دەست بە کلاوی خۆتەوە بگرە با تەیبا : ئەمە «ئیدیۆمیشە» واتە ئاگات لە خۆت بێت و خۆ بپاریزەو کەمو کووری خۆت بزانە ، ئینجا باسی خەلك بکە ، واتە لە خۆتەوە دەست پێبکە ، ئینجا برۆرە سەر خەلك . .

18 ـ دوو گوندۆرە بەیەك دەست هەلناگیرێت : واتە دوو کار بەیێکەوە ناکرێت ، لەوانەیە هەردووکی لە دەست بچێت ، نە ئەم ونە ئەویان دەست گیر بێت . . واتە یەکێکیان تەواو بکە ئینجا دەست بدەرە ئەوی تریان .

هەمان پەند لە عەرەبیدا هەیەو لە جێگەی (گندۆرە) هەناریش بەکاردێت . . .

19 ـ دروونە (دروێنە) لەبەری دەست ناکرێت : واتە بە دەستی بەتاڵ و بەبێ سەرمایەو دەسمایە ئیش ناکرێت ، لە هیچی نەبوو هیچ دەستگیر نابێت . . .

20 ـ دەستە خوشکی بە تەمای دەستەبرا لە جێگای خۆی ئەمێنێیتەوە . . .

واتە بە تەمای کەس مەبە ، هەر کەسێك بێت ، نزیکترین کەس و هاورێ ، ئەگینا بە هیچ ناگەیت و هیچت دەستگیر نابێت . . . واتە بە تەمای خۆت بەو پشت بە خۆت و هەوڵ و کۆششی خۆت قایم بکە .

21 ـ دەست بۆ هەموو کەسێك درێژ مەکە : واتە سەر بۆ هەموو کەسێك شۆر مەکەو داوای یارمەتییان لێ مەکەو مەهێڵە بە دەردو دەست کورتی و وەزعی نالەبارت بزانن ، پەنا بەرە بەر خواو بەر ئەوانەی کە بەراستی جێی ئەوەن گرێی دڵ و دەروونیان بۆ بکەیتەوەو یارمەتیت بدەن بەراستی پشتگیریت بکەن و تووشی پەشیمانێت نەکەن . . مرۆڤی زۆر گلەیی کەر ناهەقیش بێت ئەو رێزو حورمەتەی نامێنێت و لەوە خۆی سووك و ریسوا دەکات .

کورد دەلێت : «بوغچەت بۆ هەموو کەس مەکەوە»

22 ـ دەست دەست ئەناسێ : ئەمەیان ئەوە دەگەیێنێت کە مرۆڤی ژێر ساحیب و دۆستی خۆی لەهی تر جودا دەکاتەوە . .
یان من دامە دەست تۆو لە تۆم دەوێتەوە ، نەك لە خەلکی کە .

23 ـ هەتا لەسەر دەست نەرۆی قەدری پێ نازانی : واتە وریا بە ، فرسەت لە دەست مەدەو بێ سفەت مەبە ، قەدری شت بزانەو کەمە بە نیعمەتی خۆت مەکە ، کە رۆیی با پەشیمانیش بیتەوە بەچی دەچێت . .

24 ـ دەست نیە لە گۆزەدا عاسێ بێت :
واتە پێویستە بریار بدەیت لە کاتی خۆیدا و دوودڵی نەکەیت و یەك لای بکەرەوەو ناوی خوای لێ بێنە .

هەروەها بڕوانە ئەمانەی خوارەوەو خۆت دەوری (دەست) بزانە لەناویاندا وەك ووشەیێکی بەکار :

1 ـ دەستێکی پێوەنێ :
واتە لەکۆڵ خۆتی بکەرەوە، خۆتی لێ رزگار بکە ، بە هەر جۆرێك بێت .

2 ـ دەستێك بێنە بە خۆتا :
واتە ئاگاداری خۆت بکە ، ئەمە بە یەکێك دەگوترێت کە بیر لە خۆی نەکاتەوە ، لەبەر ئەرك قورسیو بێ وەختی .

3 ـ دەستێکم کەوتە ئەم دیوو دەستێکم کەوتە ئەودیو: هیچم بێ تەما ، سەرسام بووم و لە پەلوپۆ کەوتم ، حەپەسام ئەنجامی ئەوەی کە دیم و چاوەڕوانیم نەدەکرد .

4 ـ دەستی لێ مەدە :
واتە تازەی مەکەرەوەو برینی مەکولێنەرەوە .

5 ـ بەدەس من نییە :
واتە لە دەسم دەرچووەو هیچم پێ ناکرێت و هیچ دەسەلاتێکم نییە .

6 ـ دەستم لە هەویرە هەر ئەوەندەم لە بیرە :
ئەمە بەکار دەهێزێت لە کۆتایی هێنان بە حەکایەت کە دایك و نەنك و گەورەژن دەیکەن بۆ مندالان . .

7 ـ زمان درێژی دەست کورتە :

8 ـ بە دەستی خۆم کردم بە خۆم :
واتە سووچی خۆمە ، موستەهەقم .

ـ نابێت خۆمان بدەین بە دەستەوە : نابێت مل شۆرکەین بۆ زەمان ، نابێت کوڵ بدەین ، دەبێت بە جەرگ بین شانی بدەینە بەرو خۆمان رابگرین ، واتە جڵەوی خۆمان بەئاسانی تەسلیمی غەدرو زوڵمی زەمانە نەکەین . .

ـ نایە دەستیەوە :

واتە راستییەکەی بۆ دەرخست ، لێی نەشاردەوە رووبە رووی کردەوە، لەوە زیاتر هیچ چارێکی تر نەبوو . . .

واتە ناچار بوو ، دیارە ئەمە باشترە لە شاردنەوەی ئەوەی هەیە . . .

ـ شتێکی وام بەدەستەوەیە :

واتە بەتەمام ، بیرم لەوە کردۆتەوە ، بریارم لەسەر ئەوە داوە . . .

هەر لەدەس و پەنجەی خۆی دێت : لایەق بە خۆیەتی ، لێی دەوەشێتەوە

بەدەستەراستدا : واتە بە لای راستدا

بەدەستی چەپدا : واتە بە لای چەپدا . .

**(دەست) لە هەندێك دووعادا**

1 ـ خووایە ئەم دەستەو دایەرەیەی هەر ئاوەدان کەیتەوە، قەد کوێری نەکەیتەوە .

2 ـ یاخووا ئەم دەست موحتاجی ئەو دەست نەبێت ، ئەمە لە عەرەبیشدا هەیە .

3 ـ دەستی شکێ .

4 ـ دەستەکانی خۆش بێت . .

5 ـ زەلیلی دەستی ستەمکار نەبێت . .

## ئەنجام

لە ئەنجامدا نامانەوێت ئەوەی کە گوتمان دووبارەی بکەینەوە ، چ لە پێشەکیدا ، چ لە نموونە هەمە چەشنەکاندا، تەنیا دەڵێین بۆ گەیشتن لەو دەورە گرنگەی وشە دەی نوێنێت لە زمانداو پەرەسەندنی بە درێژانی مێژووی ، دووبارە سەرنجی وشەی (دەست) بدەن . . لە وشەی سادەو دارێژاوو لێکدراودا .

لە : چووتە ووشەدا .

لە : ئیدیومدا چ کە لە شێوەی ووشەی لێکدراودایە یان لە شێوەی رستەدا . . .

لە : پەندی پێشیناندا . .

لە پاڵ ووشەی تردا ، بۆ نموونە لەگەڵ ووشەدا (سەر)دا چونکە باسی (سەر) مان کردووە ، لێرەشدا باسی (دەست) دەکەین و هەردووکیشیان یەك دەگرنەوەو بەیەکەوە بەکاردێن بۆ دروست کردنی ئەو ووشەو مەبەستانەی هیچیان نە بە تەنیاو نە لەگەڵ ووشەی تردا ناتوانن دروستی بکەن . . هەروەها : لە دروست کردنی : هاوواتاو دژ واتا بۆ ئەوەی بزانن چەند واتای نوێی بەخشیوە بەزمانەکەو چ بۆشاییەکی پر کردۆتەوە تێیدا . . . ، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین کە خوێنەر خۆی بەسەرنجدانی باسەکەو ووردبوونەوەی دەتوانێت لە دەورو توانای هەر ووشەیە بگات لە پاڵ ناسینی گشت ئاڵوگۆڕێکدا کە بەسەر رووالەت و ناوەرۆکیدا هاتووەو ئەمەش چ کارێکی کردۆتە سەر زمانەکەو بەمەش توانای زمانەکەی بۆ دەردەکەوێت و لە عاستی (زانستی دەنگ )یش لەم زمانەدا دەوەستێت و هەر بەوپێیەش دوای ووشەی دەکەوێت بەڵکو بەشێوەیێکی باشتریش ، چونکە لێکۆڵینەوەی واتای ووشەو سەرچاوەی ئەو واتایانەو جیاوازیی لە زمانێکدا بەپێی شوێن و کاتی و ئەو نەتەوانەی گفتوگۆی پێدەکەن و ئەوهۆ جیاوازنەی کاردەکەنە سەری و ئەو ئەنجامانەی دەیدەن بەدەستەوەو ئەو یاسایانەی لەژێریدا دەخولێنەوەو ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر رووالەتیاندا دێت لەپاڵ ناوەرۆکدا کارێکی گرنگە لە زانستی زماندا . . بە تایبەتی لقی (لێکسیوکۆلۆگیا) . ئەمەش پێویستی سەرشانی زمانەوانە بۆلێکۆڵینەوەی ، لەبنج وبناوانی ووشەو لقوپۆپی و کۆنی و تازەیی لە زمانداو لە زمانەکانی ئەو بنەماڵەیەدا ، واتە لەسەرچاوەی پەیدابوونی لە هەموو روویێکەوە تا دەگاتە ئەمرۆ . . تا لاپەرەی مێژووی هەریەکە بەپێی خۆی بخرێتە روو . . چونکە هەموو دەزانین کە (پێویستی سەرچاوەی داهێنان)ە ، کەواتە هەر ووشەیە لە چوارچێوەی پێویستیدا پەیدابووەو پەرەی سەندووەو دەسێنێت . . . ، هەر ئەو پێویستیەش ناچاری دەکات گەر لەخۆی و لە خێزانکی ئەوەی دەیەوێت پێی نەگات پەنا دەباتە بەر دەوروپشت و دەرودراوسێ و تا بێگانەو بەپێی گونجان ئەو ووشانە وەردەگرێت یان وەك خۆی چۆنە واتە یا بەدەستکاری و داتاشینەوە تا وای لێدێت «پر بە پێستی خۆی بێت» گەر وانەبوو ئەوە دیارەو جا خۆی دەتەکێتەوە یان دەروا وەك هەڵەیێکی باو.

# پرپۆزیشنی (بە) لە زمانی کوردیی دا

محەمەد ئەمین هەورامانی

**روشنایی : -**

نووسەران و زمانناسانی کورد ناوی پرپۆزیشنی (بـە)یان بە ناوی جۆراو جۆرەوە سەر ژمێر کردووە. بۆ وێنە، مامۆستا سەعید صدقی لە کتێبی (حرف ونحو)ی کوردیی دا وەك (أدوات) ناوی (بە)ی بە رێك کەوت هێناوە. مامۆستا تەوفیق وەهبی لەقامووسەکەی‌دا وەك پریپوزیشن و مامۆستا کۆرردۆییڤ لە کتێبەکەی‌دا (زمانی کوردی) وەك (بەرناڤ)و رەشید کورد، (رێزمانی کرمانجی)، وەك (پێربەست)و کاك نووری عەلی ئەمین لە کتێبی (رێزمانی کوردی)دا وەك ئامرازی پەیوەندی‌و نووسەری ئەم وشەیەش لەکتێبی (زارەکانی زمانی کوردیی لەتەرازووی بەراووردا) وەك پرپیوزیشن، ناوی (بە)یان بردووە.

لیژنەی زمان وزانستەکانی کۆری زانیاری کورد لەکتێبی (رێزمان و ئاخاوتنی کوردیی)دا باسێکیان بۆ پرپـۆزیشنی زمانی کوردیی تەرخان کردووەو لەوێ‌دا پرپـۆزیشنی (بـە)ش سەرژمێر کراوە بە وێنەش لەرستەدا بەکار هێنراوە.

د. وریا عومەر ئەمین لەگۆڤاری کاروانی ژمارە (8)دا بە رێکەوت پرپـۆزیشنی (بە) لەرستەدا بەکار هێناوەو لەو بروایەش دایە کە هەندێ جار پرپۆزیشنی (بە) دەبێ بە (پێ).

د. کوردستان موکریانی‌یش لەگۆڤاری (زانکۆ)، ژمارە (1)ی بەرگی (7)ەم، لە باسی (ناو)داو بە بۆنەی هێنانەوەی هەندێ وێنەی پێویستی باسەکەیەوە پرپـۆزیشنی (بە)ی بەکار هێناوەو بە ناوی (ئامرازی پەیوەندی)یەوە ناوی لێ ناوە. .

لە زمانناسە بێگانەکان، ئەوانەی خەریکی زمانی کوردیی بوون و من پێیان دەزانم:

یەکەم: د. سکاروز، لە کتێبەکەی (گرامـاری زمانی کوردیی - زاری سلێمانی)دا باسێکی تایبەتی بۆ

پرپیۆزیشن تەرخان کردووەو لەو باسەش دا بەشێوەیەکی فراوان دەربارەی (بە)، کە جۆراو جۆری واتای لەفرەیزدا بگرێتەوە، لیێەوە دواوە.

دووەم، د. مەکەنزی، ئەویش لەبەکارهێنانی جۆری پرپیۆزیشن دا ناوی (بە)ی هێناوەو لە فرەیزیش دا بەکاری هێناوە (تەماشای، لێکۆڵینەوەی زارەکانی زمانی کوردیی). بکە

لێکۆڵینەوە، دەربارەی بەکارهێنانی پرپیۆزیشنی (بە)و پەرەپێدان و بەرەوپێشەوە بردنی شان بەشانی دەوڵەمەند بوونی زمان، کە جەنجاڵی سەرەمرەی ژیان، کاریگەری سەرەمرەیەتی، بە مەبەستی دیاریکردنی ئەرکی سینتاکسی و واتای سیمانتیکی و ئەرکی دیکەی، بە وردیی و قووڵی نەکراوە.

جا، لێرەدا، من ئەمەم بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی و بۆیە خۆم خستە گۆرەپانی ئەم لێکۆڵینەوەوە بە نیازی توانینی پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییەکی پێویست بە زمانی کوردیی بۆ ئەمەش، من وام بەباش زانی کە بگەرێمەوە، بەپێی تواناو لە بەردەستدابوونی سەرچاوە، بە مێژ ووی بەکارهێنانی (بە)دا وەك پرپیۆزیشنی و هەڵگرتنی شوێنەواری تاوەکو دەگاتە بەکارهاتنی ئەمرۆی.

بێگومان گرتنە بەری رێرەوی هەڵەتی وەها پێویستی زۆری بە دەس ـ خستنی زانیاریی بروا پێ کراو هەیەو هەر لەبەر ئەوەش بوو بۆیە ئەم سەرچاوانەی خوارەوەم بەباش زانین، ئەگەرچی لە راستیش دا لەمانە باشترو رەواتر تا ئێستاو ئەم دەمە بەرچاو نەکەوتوون، چونکە؛ یەکەم، سروودی سەرچاوەی دینیان وەرگرتووەو دووەمیش لەوە بەملاوە هۆنراوەی قۆناغ بەقوناغ.

هەڵبژاردەی دینی کە سروودی هۆنراوەیەو لە کتێبی دینی پرۆزی (بارسان) وەرگیراوەو ئەمیش لەکتێبی پیرۆزی (سەرئەنجام) وەرگیراوە؛ وتنی دەگەرێتەوە بۆ نزیکەی هەشت صەد ساڵێ لەمەوبەرترو باوەریش ناکەم کەس هەبێ دڵی کرمێ بێ یاخود لووتەلابێ لە تێکستی وەها.

هەروەها بەرهەمی هۆنراوەی شاعیرەکانمان پلە بەپلەو قوناغ بە قوناغ، لە مەلای جزیرییەوە بەرەو سەیدای هەورامی یەکەم و بێسارانی و خانای قوبادی و مەولەوی وەفایی و هتد تا دەگاتە نەوەی ئەمرۆ، دوابەدوای بەرهەمی دینی دا بۆ باوەرپێ هێنان لەرووی مانەوەی راست و رەوانی تێکستەوە.

کەژماڵکردن بە شوێن شوێنەواری پرپیۆزیشنی (بە)دا بۆ دیاری کردنی ئەرکی و رووالەتی و واتای لە دوێ توێ ی ئاخاوتنی جۆراو جۆری هۆنراوەیی دا بۆ ناسینی دەوری سینتاکیی و واتای سیمانتیکی و ناسینی قەوارەی لەرستەدا مەبەستی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە: چونکە لێکۆڵینەوەی وەها کە بەرهەمی مێژ وویی درێژی رێرەوی زمانی کوردیی یە ولە وەچەیەکەوە دەیگرێتەوە، دەمانگەیەنێتە بروایەکی بتەوی سوودبەخش بە ئامادەکردن و چاککردن و بەپێزکردنی شەتڵەزاریی بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی بە پیت و بەرەکەت بۆ ناسین پرپیۆزیشن (بە) لە هەموو روویەکەوەو وەك ئاواتێکی دووخوازو بەرچاوخستنی (خەستە)شی وەك ئەنجامێکی نزیکخوازی هاتووە دی.

**پرپیۆزیشنی (بە) لەیارسان دا**

وتمان، بۆ هەڵگرتنی شوێن پێی بەکارهاتنی جۆر بەجۆری پرپیۆزیشنی (بە)و ناسین زوربەی رووالەکانی و ئەرکەکانی، لە(یارسان) دێرینترمان بە دەست نەکەوت و نەش بیستراوە لەوە کۆن تر تائەمرۆ بەرچاو کەوتبێ شایەنی باسە (یارسان)، چەندسروودو پەخشانێکی دینی پیرۆزن کە لەنێو کتێبی دینی پیرۆز (سەرئەنجام)دا وەرگیراون.

ئەگەرچی، مێژ ووی نووسینەوەی سەرئەنجام هێشتا بە تەواوی دیاریی نەکراوە، بەلام ئێمە هەر لەبەر ئەوەی کە ناوەرۆکەکەی دینییەو زوربەشی هۆنراوەیە مێژ ووی هاتنەکایەوەو ئاشکرابوونی سەرژمێر دەکەین نەك مێژ ووی نووسینەوەی لە قەوارەی کتێبی سەرئەنجام ـ دا. چونکە، لای هەموولایێ رۆشنە پەیرەوی دینی ئەگەر هونراوەبێ و ئاوازاو سۆزداربێ چاکترو باشتر لە(گۆرران) دەپارێزرێ و هەروەها ئاسانترو زووتر لەبەردەکرێ تاوەکو پەخشان، پاراستنیشی لەسنگ دا پێش نووسینەوەی، ئەرکی پیرۆزی سەرشانی بەرێوەبەرە دینییەکانە.

پێشکەوتن و ئاوەدانی دەرکـردووەو ناسراوە کە تیایا رەگەزی ئاری نەژاد رەنگی بنـاغـەی کۆمـەڵی رێـژ راوە کولـەکـەو نیـرگـەی بۆ دیـوەخانی ژ یان و پێشکەوتن داناوە، دیواری جوگـەی ئاوەدانی راکێشـاوە بەم هۆیـەوە ئەم ناوچـەیـە گۆرانکـاری مەزن و قوڵی لە تێکـرا مەیـدانـەکـانی کۆمـەلایـەتی، ئابـوری شارستـانی‌دا بە خووە دیوە کە لە ئەنجـام دا کاروانی پێشکەوتن و سەرکەوتن مرۆڤایەتی لە پلەیـەکی نزم و دواکـەوتنـەوە گەیـانـدوتـە قۆنـاغێکی تر بە رەنـگـێ کە نەورۆزی لە بارێـکـەوە بردە بارێـکـی تر تاپـوویـوویـەکی کۆمـەلایەتی بە سەردا پۆشیوو خستیە ناو چوار چێوەیەکی دیاری‌کراوی نوێ‌وە. . . .

شیـاوی باسـە مێـژ ووناسـان ریشـەی پەیـدابـوونی نەورۆزو دەرکـردنی ناوو نیشـانی بۆ دەوورێکی مێـژ ووی کۆن بۆ چەرخی جەمشیـدی جەم کە تیایا وەرچەرخانێکی گرنـگ لە شارستـانی و پێشکـەوتن پەیـدابوو ئەگەرێنێتەوە بێ‌گـومـان لە سەر نەورۆز باس و خواست و داستـان زۆر هەیە. . کە یەکێ لەو داستانە بەم جۆرەی خوارەوەیە. .

پاشای چوارەمی پیشدادی لە پێش دا ناوی جەم بو کە بە زمـانـی پەهـلەوی کۆن جەم بە پاشـا گەورە، دەستـەلات دار دێ. . رۆژ ی لە رۆژان ئەم پاشـایـە بە مەڵبـەنـدی ماددا گەشت ئەگـا لە کاتی گەشت کردنـدا فەرمان ئەدا تەختێکی رازەوە بە زێرو زیو بەندی جوانی بۆ دانێن. . خۆشی تاجێکی رازاوە ئەکـاتـە سەری دیـارە وەختـیش بەهـار ئەبـێ. . کاتی کە رووبە رووی رۆژدا ئەنیشی تەخت و تاج هەردوو ئەدرەوشێتەوە. .

خەڵکـەکـە ئەم رۆژەیـان ناو نا رۆژێکی نوێ جا لەبەر ئەوەی بە زمـانی پەهلەوی کۆن شیـد بە مانـای تیشـك، یاخـۆردێ بۆیـە جەم بوو بە جەمشیـدو ئەورۆژەیان دانا بە نەورۆزو کردیان بە سەری ساڵ. . . .

لە داستـانـێکی تردا چیـرۆکـەکـە بە رەنگێکی تر ئەگیـرێنـەوە واتـە جمشیـد رۆژ ی لە رۆژان فەرمـان ئەدا شووشـەیـەکی بۆ دروست کەن کە لە تەشت یا چەرخ و فەلەك دەچو وەختێ کە ئەچوە ناوی دیو چنگ لە سەر شان هەڵیـان ئەگـرت بە رۆژە ریگـەیەك بە ئاسمان دا لە کێوی دەماوەندەوە ئەیان گەیاندە شاری بابل. . ئەم رووداوە بوو بە جێگای سەرسورمانی خەڵکی بۆیەکا ئەم رۆژەیان ناو نا رۆژ ی نوێ. لە سەر.گوزەشتـەیـەکی تردا پەیـدا بوونی نەورۆز ئەبـەنەوە سەر زۆری‌داریو خوێن رێژ ی ببوراس (ئـەژدیهـاك)واتـە کوشتن و سەربرینی لاوان بۆ خۆراکی مارەکـانی سەر شانی پاشـا بوو بە هەوێن بۆ بەرپـابـوونی شۆرش و دەرکـەوتنی پاڵەوانێکی وەکو کاوەی ئاسنگەر. . کە بە لێ هـاتـووی کومـەڵی رەش و رووتی زۆرلێکـراوی راپێـچی کۆری خەبـاتی شۆرشگێـری کردو. . قەلای چەوسـانـدنەوەو ستەم کاری روخاند، وەبانگی رزگاری‌و ئازادی راهێشت. . کە لە ئەنجـام دا ئەم رۆژەیـان ناو نا رۆژ ی نەورۆز، رۆژ ی سەرکەوتن و رزگاری وەکردیان بە جەژ ن. . .

فیـردەوسی لە شاهنـامـەدا سەرچـاوەی پەیدابوونی ئەم رۆژە بۆ دەوری جمشیـد ئەگیـرێتەوەو دەڵی جمشید کاتی کە هاتـە سەر تەخت ئاسنی نەرم کردو کەرەسەی جەنگی لێ‌دروست کرد. . کەلـوپەلی لە کەتان و ئاورێشم بری، خەڵکی فێـری خۆشتن و دروومان و جەلوبەرگ لەبەرکردن کرد فەرمـانی دا بە دێـو خشت و بەردو گەچ خانـووبەرەو گەرمـاوو کۆشـك دروست بکـەن، زانیـاری پزیشکی داهێنـا، کەشتی دروست کردو. پاشان تەختێکی جواهیر بەنـدی بۆ خۆی دانـاو دێـو هەڵیـان گرت ئەیـان برد بۆ ئاسمـان. . خەڵکی ئەم کاروو فەرمـانـانـە ئەم داهێنان و سەرکـەوتنانەو پێشکەوتنە مەزنانە. . بەجەژنیان داناوو ئەو رۆژەیـان کرد بە نەورۆز. . شیـاوی باسـە فیـردەوسی جەمشیـد ئەباتەوە سەر بنەماڵەی پێشدادی کە لە ئەنجامی لێکـولینـەوەدا بۆ مێژ ووناسان دەرکەوتووە کە پیشدادیەکان یەکـەمین بنـە ماڵەی پاشای ماد بوون، بۆیە هیچ سەیرنیە ئەگـەر ناوی، ماد جەمشیـد زەردەشت، هەمدان، کیوی دەمـاوەند وەك بەرد نەخشەی لە مێشکی کوردا نەکێشاو بە قووڵی جێگـای گرنگی لە دل و دەروونی‌یاندا نەکردبێتەوە بە رەنگی کە رۆڵـەکـانی ئەمـرۆ بە شانـازیـەوە ریشـەی

باوپـاپیـران بۆرابـوردووی کۆن بگیـرێننـەوە وەخـۆیان بە نەوەی مادوکــەی خســرەو دابــنـێــن و شاعــیــرو نووسـەرەکـانیشمـان بە باڵای کێـوی دەمـاوەنـدی سەر لە ئاسمـان تونـد بۆی تەمـومـژ تەنیوودا هەڵدەن و خۆیان بە پێچـوە شێـری لانـەی ماد دانێن و تێ کـۆشـەرەکـانیشیان خۆیان بە میرات گەری کاوەی ئاسنگەر بزانن. .

لێـرەدا ئەوەی پێـویستە بووترێ نەورۆز وەکو جەژنێکی سروشت. . گەلانی تری ئەم ناوچـەیـەش جەژنی پێـوە ئەکـەن. . دیارە سروشتی تایبەتی هاوکۆ دەستێکی باڵای لە پێکـەوەنـانی هاوکـۆڕ یـانی کۆمـەلایەتی رەنگ رشتنی بنـاغەی کۆمەڵ دا گێرابێ کە لە ئەنجامدا بووبێ بە هۆی ئەوەی کە ئەم گەلانـە. . سەر لە بەهاردا جەژ ن بە رۆژ ی نەورۆزەوە بکـەن. . ئەشێ زستانی درێژ ی پر لە مەینەت بەهــاری پر بە پیت و بەخشنــدە ژ یــانی مەڕومــاڵات بەخیـوکـردنی گەرمیـان و کوێستـان بارودۆخێکی گونجاو هەل و مەرجـێـکی وای ساز کردبێ کە تێکــرا گەلانی ئەم ناوچـەیـە هەر لە هندستان. . تا گەلانی ئێران، ئەفغان، بلوچ، ئازربـایجـان رۆژ ی نەورۆز وەکو رۆژ یکی سەری بەهار بە رۆژ ی جەژنی خۆیانی بزانن و هەموو ساڵی تیایا ئاهـەنـگ و زەمـاوەنـد بکـەن بۆیە جێگای‌خۆیەتی ئەگەر بڵێین کە لە کۆن دا دوور نیــە ئەم جەژنــە جەژنی تیکـرا رەگەزی ئاری نەژاد نەبووبێ. . بۆیە ئەمرۆش ئەم گەلانە هەموو ساڵێ بە گەرمەوە یادی ئەم جەژنە ئەکەنەوەو نایەڵن شوێنەواری باوباپیرەیان کوێر بێتەوە.

ئەمـە جگـە لەوەی کە پەیـوەنـدی ریشـە داکـوتـراوی بەهێــزی نێـوان گەلانی‌و تێکـەڵاوبون و بە یەکـا چوونی بەرژەوەنــدی بێ سنــووریــان لە هەمــوو روویــەك و مەیــدانێکـەوە کارێکی وا بەتێنی لە سەر پەیـوەنـدی. ئەم گەلانــە گیــراوەو نوانــدوە بە چەشنی کە زۆر دیــاردەی شارستـانی یا داب و نەریت و رەوشت، تەنانەت جەژنی ئەم گەلەیا ئەم ناوچەیە کاری تایبەتی خۆی بکاتە سەر ئەو گەل و ئەو ناوچـەیـەی ترو مۆرك و نیشـانەی دیاری‌کراوی خۆی پێـوە نیـە بۆیە نەورۆز سنوورو دیواری وڵاتی **ئاری** نشین شکاندو بری‌و لە چوار چێوەی وڵاتی کوێستانی بەفر داگرتوی رۆژهەڵاتەوە تێ‌پەری‌و هەوارگەی لە وڵاتانی‌تردا خســت و بو بە جەژنی وڵاتی میســرو تونس هتــد. . کە ئەمــرۆ لەم دوو وولاتــە عەرەبــیــەش یادی جەژنـــی نەورۆزئەکـەنـەوە لە میسـر وەکـو مێـژ وو ناسـان دەڵێن لە زەمـانی فەرعـونـەکـانـەوە رۆژ ی (شم النسیم) هەبـوە کە کتـومت ئەچێتـەوە سەر جەژنی نەورۆز کە هەتـا ئەمرۆش شوێنــەواری ئەم جەژنـەش لە میسـرو تونس دا هەر ماوە سەرەرای ئەمـەش ئەم جەژنـە لە وڵاتانی عەرەبی‌تردا هەر بە پیـرۆز دانـراوەو لە بەهـاران دا جەژنی پێوە ئەکرێ تیایا ئاهـەنـگ و زەمـاوەنـد ئەکـرێ. شیاوی باسە ئەم کۆمەڵە ئەفسـانـانـەیە کە لە سەر پەیدابوونی نەورۆز دوواوە هۆی دروست بوونی شێ ئەکـاتـەوە. . کە تێکـرا هەمـووی لە پێش چەرخی هاتنی ئایینی پیـرۆزی ئیسلام کاریکی‌وای گیـراوەو نوانـدوە. . بە رەنگێ خستنیە سەر ئەوبیرورایە کە بڵێــین ئەم رۆژە بریـتـی‌یــە لە رۆژ ی دروست بوونی جیهـان و ئادەم واتە دروست بوونی هەردووکیان رێکەوتی ئەم رۆژە پیرۆزەی کردوە. .

بەم رەنگـە مقـریـزی ـ طبـری، مسعودی، دەڵێن ئەم رۆژە لە دەوری ئەخمینی‌یـەکـانیشدا بە سەری ساڵی تازە دانــراوە شایی‌و زەمــاوەنـدو ئاهـەنگی تیـا کراوە، تا ئەم رەوشـت و داب و نەریتــە جێـگــای تایبــەتی خۆی لە کومـەڵگـەدا گرت و شوێنـەواری تا دەوری سەرهـەڵدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش هەر مایەوە، تەنانەت لە وەختی عەباسی‌یەکاندا خەلیفە (معتضدی)ویستی لای‌بەرێت یا هیـچ نەبێ لە پایەوگرنگی کەم کاتەوە بەڵام سەرنەکەوت لەم کارەدا.

حمـزەی ئەصفهـانی دەڵێت: ـ خەرج ورسـومات لە سەری ساڵی کۆچی‌دا کۆ ئەکــرایــەوەو هێنــراو گۆررا بە رۆژ ی نەورۆز کە ئەوکاتـە رێکـەوتی 18ی حوزەیران بوو لە زەمـــانـــی متــوکــل دا کە تا ئەو دەورە خەراج هەر لە سەرەتـای نەورۆزەوە کۆ ئەکـرایەوە، ئەو هێنای دوومانگی پێش خست لە زەمــانی مەلیــك شای سەلجــوقی یــدا

تقـویمیان گۆریو نەورۆزیان بە سەری سالی تازە دانا کە ئەو کاتـە رێکـەوتی 15ی مارتی 1079 زابینی ئـەکرد بەم بەڵگـانـەدا روون ئەبێتـەوە کە گەلی کورد لە مێـژەوە لەم مەڵبـەنـدەی ئێستـادا نیشتـەجێ بووەوژ یـاوە لەگـەڵ مەرومـالات، ئەسـپ، چووت وگا خەریـك بووە بە گەرمیـان و کوێستـان رۆژگاری سەختی پر مەینەتی بردوتە سەر لە زۆر جێگادا پتر لە شەش مانگ لە کونی زستان دا شەوورۆژ ی کردوتـەوە تا ئاسـۆی بەهـار مژدەی فریشتەی ژیـانی پێ راگـەیـانـدوە بەرگی زینـدوبـونـەوەو دلشادیو بەختەوەری بری بە بالای‌دا کە لە ئەنجام دا ئەم رووداوەو سەرکـەوتنـەی ناو ناوە نەورۆزو کردویـەتی بە جەژنێکی سروشتیو، نەتەوەیی، ئاهەنگ وزەماوەندی بۆگێراوەو لە دەوری سەمـەنی تا رۆژ بۆتـەوە هەڵپـەرکێ‌ی کردووە بە دەوری یا تا لوتفتی رۆژانی زستانی دژواریان داو بە بادا ئەم هۆیـانـە بە گشتی کارێکی ئەوتۆی گێراوە کە ئەم رۆژە بە لای کوردەوە پیـرۆزو ئاسایی بێ وهیچ رەنگ و بۆنێکی بێگـانـەیی و داتـاشـراوی لێ‌وەنـایـە. . هەر وەکـو هیـچ پەیـوەنـدێکی بە ئایینـەوە نیـە. . بە واتـەیـەکی تر لە ناوچـەرگـەی بارودۆخی سروشتی مەڵبـەنـدەکەو کانگای رووت و بێ گەردی کومـەڵـگـەی کوردەوە ئەم جەژنـە چەکـەرەی کردو بوو بە نەونـەمـامی باخچـەی رزگاری بە وێنـەی رۆژێکی پیـرۆزی نەتـەوایەتی برا بە بالای کوردا وەناوی دەرکرد.

بەم چەشنـە رۆژگـار هاتو رۆژگارچوو مەغوڵەکان، هولاکـۆو تیمـورلـەنـگ، سولتـانـەکـانی عوسمـانیو صفـویـەکـان. . بارێکی وا ناهـەمـواریان لە دواکەوتن، نەزانیـن و مالّ وێـران کردن، خستـەوەو ئاوە رەشێکی نامـرۆڤـایـەتیو کوشتن و بڕینی ئەوتـۆیـان لە ناوچـەکەدا رشت، کە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە هەر نەفرەتیان بۆرەوانە بکەن، وە مۆرکی بێ‌شەرمیو خوێن رێژ یو زۆرداریەتی بە ناوچاانیانەوە بنین، وە خستوتیانە ناو سەرەنوێلکی مێژ ووە.

نەورۆز لە تێکـرا ئەم رۆژگـارە سەخت و دژ وارەدا هەر لە بەرگی سروشتیو کۆمـەلایـەتی جەژنی سەری سالّ دا ماوەتـەوەو لە چوار چێوەی دیاریکراوی خۆی دەرنەچوە بە راستی ئەوەی پێـویستـە لێـرەدا بووترێ لەم دووریانە پێچو پەنـایـەی مێـژ وودا لەمـە زیـاتـر نەهـاتـۆتـە بەرچـاوی مێـژ ووناسانیو نووسەرانی کورد. . تا بتوانین گەنجینەی نەورۆزی لەمـە زیاتر پێ‌برازێنیتەوەو باسەکەمانی پێ‌ی بە پیـزو دەولـەمـەنـد بکـەین. . ئەمێنیتـەوە سەرکـۆشش و تەقەلای رۆشنبیرانی کورد کە دوور نیە لە پاشە رۆژدا زۆر لاپـەرەی نەزانراووگوم بووی مێژ ووومان بە چرای زانین بۆ روونـاك و رۆشن بکـەنـەوەو لە بارەی جەژنی نەورۆزەوە لاپـەرەیـەکی نوێمـان بۆتومـارکـەن ووبـازاری مێژ ووی گەلەکەمانی پێ گەرم و جوان کەن.

خانیٚ شاعیـری بەرزی کورد لە مەم وزیـن دا بەم چەند دێرەی خوارەوە لە سەر نەورۆز ئەدوێ. .

دورا خەلەکی ژ بەختی فیروز
دیسان کۆنما ژنوۆڤە نەورۆز
مەبنی لەوی عادەتی مبارك
شەهربو سوپاهی یان بە جارەك
با ژ یرو کەلات مانی بەردان
تەشبیە بە نەژدیان و جەردان
صەف صەف دەمشینە کوهو دەشتان
رەف رەف دەخشینە سەیرو گەشتان
ئەسنافی ئومەم صغارو کبار
قەتعەن نە تەماوە شهری دەیبار

لەم هۆنـراوەشـدا جارێکی تر دەرئـەکەوێ کە نەورۆز هەر جەژنـێـکـی سروشـتـی بووە کە وردو درشـت شارودێ، شاهـوگـەدا پێکەوە چوونەتەوە دەرەوە بۆدەشت وکێوو ئەو رۆژەیـان بە ئاهـەنـگ و شادی بردووتـە سەر و بە وێنـەی جەژنێکی نەتەوەیی. . روانیویانەتە ئەم رۆژە پیرۆزە.

پاش ئەم وورده باسـەولێکـۆڵینـەوە سەرپێ‌یـە لە سەر نەورۆز بە درێژایی مێژ ووو جێگای خۆیەتی کە لە مەودووا جلەوی باس چرای روون کردنەوە بدەینە دەست پیرەمێرد نەك تەنهـا لەبـەر ئەوەی کە ئاوێنـەیـەکی پاك و بێ‌گەردی

وێنــەی راســت و دروستــی چەرخێکی جۆراو جۆری هەڵبـەزو دابـەزی کومـەڵگـەی کوردی تیا ئەبینین و بەس بەڵکو سەرەرای ئەمە زاناو داناو دنیا دیدەو شۆرە سوارێکی هەڵکـەوتـوی ئەوتـۆ بوو کە بە پر توانایی خۆی توانیویەتی ئەرك و پیۆیستی مێژوویی سەرتاپا پلەیەکی کومەڵ بگرێتە ئەستـــۆو بە پاك و پۆختـــەیی سەرگـــوزەشتـەی زیـاتـر لە سەدەیەکت بۆبگیرێتەوە . بە راستی پیرەمێرد ئەستێرەیەکی گەش و جریـــوەداربـــوو لە ئاسمـــانــی شین مێـــژ ووی رۆشنبیـــری کوردا، بە لای کەمـــەوەڵـــە پلەو قۆنـاغێکی تایبـەتی‌دا دوو رووداوی مەزن، دانانی کۆمەڵی زانستی، زینـدوکردنەوەی جەژنی نەورۆزی بە ناویەوە گرێ دراوە، کە هەردووکی لە بنـەرەتـا بۆ هەوڵ و کۆششی بە پیـزو بێ پشوودانی پیرەمێردی نەمر ئەگەرێتەوە بە دەستێ خەریکی کۆمـەڵی زانستی بۆکەرەستەی ژیان و مانەوەو سەرکەوتنی بۆ دابین ئەکـرد، خەم خوردو پاسـەوانی بۆ، بیست ساڵی رەبـەق لە دەست ئاڵ و شەوەی کۆنـەپـەرستی و بەنگـو باوە نارەواکـــان پاراستی، بە دەستێکی تر ئاگـــری نێڵە نێڵەی نەورۆزی خۆش ئەکرد گیانی نەتەوایەتی بە باڵا ئەکرد کە لە ئەنـجـــام دا بە پشتـیی و پەنـــای لاوانـی خوێـن گەرم رۆشنبیـــرانی کوڵـــەنــەدەر خستیـــە قەوارەی جەژنێکی نەتـەوایـەتیـە وەولـە کۆمەڵگەی کوردا چەسپاندی . . زیاد وتن نیە ئەگەر بڵێین کە پیرەمێرد لەم دووریانەدا بە هەموو چەکێکەوە هاتبوە کۆری جەنگەوە لە پێناوی تۆلەسەندن لە دواکـەوتن و بۆبەرەوپێش چوون و سەرکـەوتن و رزگـاری رەنجی فەرهـــادی گەرمیـــان و کوێستـانی ئەدا بە شیلەی بیـری واڵـەبێـژی شەقامی نارێکی ژینی رووناك ئەکردوە تۆوی زانستی لە کۆمـــەل دا ئەروان هاوارو بانگی راستی کوردەواری ئەدا بە گوێی کۆمەڵانی خەڵکی‌دا .

جا با گوێ شل بکـەین بۆ پیـرەمێرد لە دوو نووسینی بە نرخی‌دا یەکـەمیان بە ناونیشانی من و نەورۆز کە لە ساڵی 1944 لە ژین دا بڵاوکراوەتەوە دووەمیان بە ناوی نەورۆز بووە بە ئاگـــر لێـــمـــان کە لە ساڵـــی 1949 لە ژیـــن دا بڵاوکـــراوەتـــەوە کە بەکـــورتـی و پوختـــەیی لە خوارەوە ئەینووسین : -

منـــداڵ بووم لای مەلا حسین گۆجـە ئەم خوێنـد کە ساڵ ئەگـەیشتـە دەمی بەهـار مامـۆستـا ئەیگـوت یاڵلا بچن نەورۆزانــە بهێنن، ئێمەش ئەچووینە ماڵەوە سەردایکمان ئیتـر دایـك و باوکمـان هەرچی‌یـان لە دەست بهـاتـایا یا هەرچی‌یان لە بارابوایە چەرخێ، قران، حمەشایی ئەیان داینـی. ئێمـــەش ئەمـــان هێنـــا ئەویش بەشـی خۆی لێ هـەڵئـەگـرت، یەکی قەمەرەیەکی ئەداین و ئەچوین لە مزگـەوتی شیخ ئەورەحمانی شێخ ئەبوبکری شیخ ئەوللە سورەی (دوو لە تووی) خەتی خۆش بوو نەورۆزنامەی بۆ ئەنوسینەوە کە ئەمەش دەقی نەورۆزنامەکەیە

نەورۆز شد      نەوروز شد
نەورۆزی نۆ      فیروز شد
دنیا هەمە      پیرۆز شد
بابابدە      نەورۆزم
تا بەر خوری ▬ ئەز روژ یم

ئیتـــر ئێمـــەش بە هەمـــوو کۆڵان و سەربـانێـك دا بە گۆرانیـــەوە ئەمـان گووت و ئەخـوێنـدەوە ئەو رۆژە بەرەڵا ئەبـوین، ئازاد بوین ئەچـوینـە ئەودەشتـە بۆئاهـەنـگ و زەمـــاوەنـدو هەڵپـەرکێ بە راستی نەمـان ئەزانی ئەم رۆژە چیـەو لە چیـەوە هاتـوەو چۆن پەیـدابووە، تا رۆژی حسن ئەفندی مامم لیٚی پرسیم؟

تۆ بە خۆشـــی نەورۆزەوە هەڵ ئەپـــەری نازانـیش ئەم نەورۆزە چیـەو چۆن هاتوە ووتم نەواللە . . هەر ئەوەندەی لێ ئەزانم :

کە ئەم نەورۆزە ئەوەیـــە کە ئێمـــە پارە ئەدەیـن بەرەڵا ئەبین . . هەر وەکو جەژنی مریشکە رەشە وایە کە مریشك دێنن بۆمامـۆستـا . . مامم پێ‌کەنی ووتی : بە پێچەوانەوە رۆڵـە ئەمە رۆژێکە خوا ئەم جیهانەی تیا دروست کردووەو رۆژێکی پیـرۆزو مەزنـە واتـە رۆژ هەموو ساڵی کە ئەکاتە ئەم ئەنـدازیـە ساڵ ئەگـەرێتـەوەو ئەبێتە سەری ساڵ، کە سەر لە نوێ زەوی ئەژێتـەوە درەخت و گیـا ئەبـوژێتـەوە، هەوایـــەکی تازە ئەکـــەوێتـە ناوەوە مرۆڤ کاتی هەنـاسـە

هەڵئەکێشی تێی دەگا کەوا گیانی تازە ئەبێتەوە.
لێرەدا دووخاڵ لە شوێنی جیادا سەرنج رائەکێشی یەکەمیان لەو دەورەدا نەورۆزنامە بەزمانی فارسی ئەنووسرا کە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە هێشتا هەست و هۆشی کوردایەتی هاوچەرخ ریشەی قووڵی لە مەیدانی رۆشنبیردا دانەرشتبو، بۆیەبازاری زمان ووشەی کوردی کزو کەساس بوو. وەنووسینی کوردی بە تەواوی بە سەرکەندو کۆسپەکانی دا زاڵ نەبوبو، دووەمین خاڵی یش بریتی یە لەوەی کە جەژنی نەورۆز تا ئەم بوارە مێژوویەش لە چوار چێوەی جەژنی سەری ساڵی کردنەوە دەرنە چو بوو هێشتا لە قاڵبێکی سادەو لە چواردیوارێکی تەنگەبەردا لە ناو مزگەوت و مەلافەقێ قوتابیانی حوجرەدا ستاری گرتبوو و هێشتا نەچوبوە ناو دڵ و دەروونی تێکرا کۆمەڵانی خەڵکەوە، بەرگێکی میللی و نەتەوایەتی ئاشکراو روونی نەپۆشیبوو کاتێ پیرەمێرد هەوارگەی لە ئەستەمبوڵ داخست دێتە سەر گێرانەوەی سەرگوزەشتەی نەورۆز لەم سەردەمەدا کە بێ گومان ئەمەش لاپەرەیەکی ترە لە لاپەرەکانی مێژووی نەورۆز.
کورتەی باسەکەی پیرەمێرد.. بۆیەکەمین جار لە ژیانم دا لە ئەستەمبول جەژنی نەورۆزم دی، ئەم رۆژە لێرە بە رۆژێکی پیرۆز دانراوە هەموو ساڵی لە (9)ی مارت دا کاربەدەستان تیکرا دەستە دەستەو پۆل پۆل ئەهاتنە سەرا بۆ پیرۆزبایی کردن لە سولتان بە ناوی یاد ـ کردنەوەی نەورۆز. لە دیوەخانی سوڵتانا زیارەت کەران شەربەتیان ئەخواردەوەو بە شادی ئەو کاتە کەمەیان ئەبردە سەر کە شەویش دا ئەهات لە گشت منارەکانی پایتەخت دا (دیارە مەبەست منارەی مزگەوتە) مووم یاقوتیلکە چرایان دائەگیرساندو دەیان کرد بە جەژن، ئەمە وێنەیەکی بچووکی سادەی سەرگوزە شتەی نەورۆزی ئەو دەمەیە.
پیرەمێرد ماوەیەك لە تورکیا ئەمێنێتەوە جا هەر چەندە مووچە خۆری میری ئەبێ و لە ناو دەوڵەتیشدا پایەو پلەی بڵند ئەبێ و خۆش گوزەران ئەژی و لە هیچی کەم نابێ بەڵام دڵ و هۆش و بیر و مێشکی هەر لە کوردستان ئەبێ هەمیشە خەو بەدارگوێز و مازوو، کەرەو دۆی وولاتەوە ئەبینێ شەیدای کەژ و کێوەکانی شارباژێر و شیوە کەل مەرگەبوو وەکو رۆشنبیرێکی گەورەی کورد هەڵسوکەوتی ●٬کردو بیری ئەکردەوە.
پاش سەفەربەگلگ عەشقی کاولکەی وولات کەوتە سەریەوە بۆیە دەستی لە خۆشی و لەماڵ و منداڵ هەڵگرت تاجی پایەبلندی دەوڵەتی عوسمانی دا بە زەوی‌دا بەرەو هەوارگەی وولات گەڕایەوە لێرەدا دەڵێت: ـ
(کاولکەی وەتەن هێندە شیرینە، زاری دوپشکی عەرەب لە چاویا هەنگوێنە) پیرە مێرد پاش (23) بیست و سێ ساڵ چۆڵ پەرستی لە ساڵی 1926 بەرەو هەوارگەی نیشتمان هاتەوە.. لەم کاتەدا.. کە چاوی بە دواکەوتنی نیشتیمان وولاتەکەی ئەکەوێ هێلانەی رازو نیازی دڵی ئەورژێ لەم پلەی مێژ ووەدا● وەکو خۆی باسی ئەکا..
هەوای بیرکردنەوەی نەورۆزم کەوتە کەلەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم جەژنە پیشەی باوباپیرانە، یادگارێکی کۆن و شیرینە نابێ کوێرکرێتەوەو بکوژێتەوە.
بۆیە کەڵکەڵەی زیندوکردنەوەی ئەم جەژنەم کەوتە سەرو بریارم دا کە چاکی بوژاندنەوەی لێ بکەم بەلادا.. بەم پێیە بۆ پێکاندنی ئامانج کەوتمە کار لە پێشدا هەر لە سەرەتاوە دەردەسەریەکی زۆرم کێشا چەند جار ئاگریان ئەکوژاندەوەو بە ئاتەش پەرستیان تاوان بار ئەکردم بەڵام نەبەزیم دەستم لە کۆشش هەڵنەگرت.
شیاوی باسە دانانی کۆمەڵی زانستی ساڵی 1926و هەوڵدانی بۆ پێشەوە لەگەڵ کۆششی پیرەمێرد بۆ نەورۆزکردنەوە هەردولایان شان بە شانی یەك ئەرۆیشتن هەردوولایان دوو نەو نەمامی باخی پێشکەوتن و رزگاری کورد بوو کە پیرە مێرد بە ئارەقی ناوچەوانی بە خوێنی جگەری ئاوی ئەدان و پەروەردەی ئەکردن تا گەیاندنیە پایەو پلەی خۆی وەجێگاو شوێنی تایبەتی لە دڵ و دەروونی گەلی کوردا کردەوە..
جا چەند لەشکری زانستی لە برەودان بوایە..

وەبەرەوپێش کەوتن و سەرکەوتن بڕۆشتایە ئەوەندەش نەورۆزیش پەلوپۆی ئەهاویشت و هەنگاوی ئەنا وەپێش ئەکەوت وجێگای تایبەتی لە کۆمەڵگەی کورددا ئەگرت . . بۆیەکا کە کۆمەڵی زانستی لە ساڵی 1926 کە هێشتا شیرە خۆربووە تازە زمانی ئەبڕا وەکەوتبوە گاگوڵکی نەورۆزیش . . هەر لە بیری پیرەمێرددا گینگڵەی ئەخوارد . . هێشتا نەبوبوبە کارونەکەوتبوە بازاری کاروئیشەوە بۆیە هەردوو لایان شان بە شانی یەك ئەڕۆیشتن تا لە ساڵەکانی 1930دا پاش ئەوەی لاوانی خوێن گەرمی مەلاشوهەڵدراو بە کوردەواری زۆربوون و قوتابیانی تازە کۆرە کەوتنە چالاکی نواندو داواکردنی داخوازیەکانی گەل بە تایبەتی لە دەوروبەری راپەرینە پیرۆزەکەی شەشی رەشی ئەیلولی بەردەرگای سەرادا . . قوتابیانی وریاو لاوانی خوێن گەرم و بەشی رۆشنبیرانی کورد بوون بە هێزێکی ئاشکرای کاریگەر لە بەرچاو. بەم پێیەش جەژنی نەورۆزیش بەرەو لق و پۆپ هاوێشتن و بەرفراوانی دەنگ دانەوە وبە هێزی ئەڕۆیشت بەرەنگێ کەوتە قاڵب ودۆخێکی واوە کە ترس ولەرز بخاتە دڵی دەزگای کۆنەپەرستییەوە ئا لەم هەڵوێستەدا پیرەمێرد گۆزری خۆی هەڵئەگرێ ، گۆمی بێ دەنگی ئەشلەقێنێ وزەنگی راپەرین لێ ئەدا . . وەئەکەوێتە قسەو دەڵێت پاش بیرکردنەوە لەم داب و نەریتی باوباپیران . . کەوتمە چالاکی نواند شەوێکی نەورۆز هەندێ دارم کری . . پاشان هاوارم بردە بەر کورگەلی زانستی ئەوانیش داریان بردە سەر گردی مامە یارە
بە شادی وهەڵپەرکێ ئاگری نەورۆزمان کردەوەو بۆ بەیانیش سەیرانمان کرد لەو دەشتە بە دەهۆڵ وزورناوە دەستمان کرد بە هەڵپەرین ، نان وچێشت وچایەکی زۆریشمان تیایا بەشیەوە ئەمە هەموی وتەی بە نرخی پیرە مێرد . . . ئیتر نازانین ئەمە لە چیی ساڵێکدا بووە . . بەڵام بەبیروڕای ئێمەو بۆچوونمان ئەم سەرەتای نەورۆز کردنەوەیە هەر ئەبێ لە ساڵەکانی (1930)دا بووبێ یا ئەتوانین بڵێین پاش راپەرینە پیرۆزەکەی شەشی رەشی ئەیلولی بەردەرگای سەرادا بووبێ .

بەم چەشنە ساڵ بە ساڵ دەنگی دەهۆڵی و زۆرنای نەورۆز زیاتر بەرز ئەبووەوە وکۆمەلانی خەڵکی باشتر لە دەوری کۆئەبونەوەو بە گەرمییەوە ئامادەیی یان بۆ یادکردنەوەو خۆش کردنی جەژنی نەورۆز پیشان ئەدا . هەر کاتێ وەرزێ بەهار دەستی پێ ئەکردو ئەیان ووت ئەمە سەرەتای بەهارە کورگەلی ناوشار بە تایبەت بەرەی خوێندەوارو لەشکری زانستی وقوتابیانی تازەپێ گەیشتو ئەکەوتنە کۆبونەوە لە دەوری پیرەمێرد وەبۆیادکردنەوەی جەژنی نەورۆز کەرەسەی ئاهەنگ وە زەماوەندیان دابین ئەکرد بەو پەری چالاکی یەوە ئامادە ئەبون وەئەیان کرد بە قاوو . هەندێ جار دەیان ووت سبەی (21) ئازارە پێویستە یادی ئەم جەژنە بکەینەوە هەندێکی تر دەیان ووت بەیانی باران و توفە با بیخەینە رۆژێکی تر یا دەیان ووت وا چاکترە جەژنەکە لە رۆژی هەینی دابێت تا کور گەل لەگەڵ تێکرا میچە خۆران دا بەشداری تیابا بکەن . . جا زۆر جار شەوی (21) ئازار ئاگری نەورۆز ئەکرایەوە وەلە رۆژێکی تردا زیاتر رۆژی هەینی بۆ کوبونەوەو دانیشتنەو یاد کردنەوە دائەنراو هەڵئەبژێردرا . لەم رۆژەدا کۆمەلانی خەڵکی لێشاو بەرەو گردی مامە یارەو کارێزی وەستا شەریف ئەهاتن بە ئارەزووی خۆیان بە شیعرو ووتە خوێندنەوە لەگەڵ یاپراخ خواردن و چاوو شەربەت خواردنەوە بە گفتوگۆو ووتوێژ وگەردن ئازادی لەگەڵ یەکدا ، بە ئاهەنگ و خۆشی ئەیان بردەسەرو رایان ئەبوارد . . بەم رەنگە نەورۆز دەقی تایبەتی بە خۆیەوە وەرگرت وەکەوتە قالبێکی کۆمەڵایەتی نەتەوەییەوە هەمو ساڵێ بوبو بە باو کە لە (21) ئازاردا کورگەلی زانستی بە رابەری پیرەمێردی نەمر دەستیان ئەکرد بە کرینی بارە دارێکی زۆر نیلەنیل ئاگری نەورۆزیان لە سەر گردی مامە یارەو کارێزی وەستا شەریف ئەکردەوە ، بەیانی شاگردانی زانستی و رەشوو رووتی شار تێکرا ووردو درشت کاربەدەستان وەپیاو ماقولان وە میوانانی نەورۆز (کە هەندێ جار میوان لە دەرەوەی شاریش بانگ ئەکران) گرد

ئەبونەوە وە پێکەوە هەموو لایەکیان بە شادی ئەم چەژنەیان ئەکردەوە لێرەدا بیرەمێرد دەڵێت : هەرچیم دەست ئەکەوت لە کاری رۆژنـامـە گەریـەتی‌دا هەمـوویم لەم سەیـرانەدا دائـەنـا هەزارو پێنج سەد کولێرە نان ئەکرا هەر نانەی پێنج یاپـراخ وورده شتی تری تێ‌ئەکرا دوانزە سەماوەری گەورە ئەکـەوتـە زیرەزیر دەهۆڵ و زوورنای شار ئەکەوتە لێدان بە هەلپـەرکێ‌و شادی بە ووتـارو شیعـر خوێنـدنەوەو یەکتری بینین چەژنیان یاد ئەکردەوە.

بەراستی بوژانــدنـــەوەی نەورۆز زینــدوکـــردنـەوەی پاڵـەوانێکی وەکـو مامـە یارە وەنـاونانی گردی گوڵانی روو تووقـــوتی بێ ناز بە ناویـــەوە وەنـــاو دەرکـردنی ئەم گردەو کارێـزی وەستـا شەریف بە وێنـەی جێگـاو مەڵبـەندێکی پیـروزی نەتـەوایەتی ، کۆبونەوەی کومەڵانی خەڵکی نان دان و گفتـوگـو کردن ئەمـانـە تێکـرا گشتی زنجیـرە سەر کەوتنێکی نەتـــەوایـــەتیـــە لەو رۆژەدا کە مرۆڤ ناتـــوانێ نەی نرخێنی وەلـە بازاری پێشکەوتن روشنبیری کوردی‌دا هەڵی نەسـەنگێنێ وەکـو دەستکـەوت نەی‌خـاتە بەرچاو. جێگـای خۆیـەتی لێرەدا بڵین کە هەموو دیاردەیەکی نوێ‌و سەرکـەوتن و دەستکەوتی تازە بە ئاسانی‌و ئاسایی ریشەی لە کۆمـەڵ دا دانـاکـوتێ‌و وەنایەتە سەرشانۆی ژیان نایەتە کایـــەوە کورد واتـانی دارێ ئازادی‌و سەرکـەوتن بە ئارەق رشتن و کۆشش رەنـج دان نەبێ هەرگیـز نایـەت بەرهـەم وەبـەری شیـرین نادا بۆیـە نەورۆزی‌یش لەم مەیـدانـەدا بەشی خۆی لە چەرمە سەری‌و تاڵ و تفتی رۆژگار چێشت بۆ ریگـــرتـــن و بەرهـــەڵـــستی کردن لە بوژانـــەوەی ئەم یادکـردنەوەیەی باوباپیرانە کۆنەپەرستان هەزارو یەك کەندو کۆسپیـــان خستە رێگەی بۆ کوژاندنەوەو کوێرکردنەوەی ئەم دیـــاردە نەتـەوایـەتیـە سەدەهـا هاشـەو هۆشـەو چاوەراوو بەنگـوبـاوی نارەوایـان بۆ نایـەوە، پیـرەمێـردو جولانەوەی رۆشنبیری کوردیانە بە ئاگرپەرست وەتاوانی بێ‌جێ تاوان بارکـرد تا گەیشتنـە رادەیەك دەزگای میری‌یان لێ‌هان دا تا بتـوانن لەم رێگـەیـەوە ئەم جەژنە وەیادکردنەوەی باوباپیرە کوێـرکەنەوە زیندە بە چاڵ کەن بەلام پیرەمێردو رۆشنبیران لە ئاستی ئەم هێـرش و شالاوە نارەوایـەدا چەکیـان دانـەنا مەردانـەو ئازایـانـە بەرامبەر ئەم هاشەو هوشەی دەستگای میـری‌دا وەستـان بانگیـان بۆ کۆمەلانی خەڵکی راهێشت داوای پشتگیـریان لێ‌کردن و، بیروڕای خۆیان دەربارەی ئەم کێشـەیـە بەزەقی روون کردەوە ووتیان کەنەورۆز هیچ پەیوەندیەکی بە ئاگر پەرستی‌یەوەنیە .

پیـرەمێرد ئەی‌گرماند بە سەر دوژمنان دا وەدەی ووت : گەوجینـە ئێوە لە گوێی گادا نوستوون ئاگرێك کە خۆمان بیکەینەوە وەخۆشمان بیکوژێنینەوە ئیتر چۆن ئەبێ بیپەرستین .

بەلام دەرکــەوت کۆنـــەپـــەرستـان ، دەزگـای میـری مەبـەستیـان لە ئاگـرنـەبـو، قینیان لە کۆمەلانی خەڵکی ، لەزانستی لە نەوەی تازەکورەی‌گەل لە خوێندەواری بە ئاگا هاتن لە رۆژنامەی ژیان بوو.

ئەیـان ویست بەربـەستی لە شەپۆلی هەڵچوی لاوانی خوێـن گەرم ورۆشـنـبیـــرانی کورد بکــەن بە تایبـــەتی سەرهـــەڵـــدانی سەرەتــایی جەنگی دووەمینی جیهـانی مەتـرسیـەکی گەورەی خستبوە دڵی دارو دەستەی دەزگای میـری‌یـەوە لەبـەر ئەم هۆیـانـە دەزگـای میـری فەرمـانی قەدەغـەکـردنی جەژنی نەورۆزی دەرکـرد بۆیـە لە ساڵی 1938 موتـەسـورفی سلێمـانی مجیـد یعقـوب جەژنی نەورۆزی قەدەغـەکـرد دەرگـای کۆمەڵی زانستی داخست وەقـوتـابیـانی زانستی خستـە بەنـدیخـانـەوەو رۆژنـامەی ژیـان یشی داخست وەترسو لەرزێکی گەورەی خستە ناو کۆمـەلانی خەڵکەوە بەم چەشنە تا ماوەیەك چرای زانستی ووریـــایـونـەوە کزکـراو بەرگـری لە پێش کەوتنی ئاسـۆی سـەرکەوتن کرا .

بەمـەدا گەوجیـەتی خۆیـانـد سەلماند بەتەمابون بەفو ئاگری نەوروز بکوژێنێتەوە بە ترس خستنە دڵی خەڵکیەوە کاروانـی پێشکـــەوتن لە رەوتی نەوەستـــاوی بخـــەن بە داخستنی رۆژنامەی ژیان ووشەو وێژەی کوردی بێ چەك بکـەن ناوی پیـرەمێرد کوێر کەنەوە ئەو راستیەیان نەئەزانی (کـە چرای دز ناگـاتـە بەیـانی . چرای زانستی کز ئەکرێ بەلام ناکـوژێتـەوە) وکـاروانی سەرکـەوتن و پێشکەوتن لە وەستان ناکەوێ .

# خەوبینین و خەوەکەی لالە سەرحەد



جەمال بابان

(بەشی یەکەم)

خەوبینین تا ئێستا نهێنی یەکە لای زانایانی نەفسی و کومەلایەتی روون نەبوتەوە. زانایانی وەك (فروید)و (أسیرنسکی)و زۆر خویان بەم (لغز)ەوە خەریك كردووە بەلام نەگەیشتوونەتە ئەنجامێکی ئەوتو دلی پێ خوش بکرێت ئەگەر بگەرێینەوە بۆ زۆر پێشووتر واتا بو سەردەمی (سوقرات)و (ئەفلاتون)و (دیموکرتیس)و (ئابوقرات)و (ئەرستو) لە زانایان و فەیلەسوفەکانی ئەوسای یونان ئەبینین ئەوانیش گەلێك خویان بەم كارەوە خەریك كردووە و هەریەکە بە جوریك (وصف)ی خەوبینینی کردووە. لەوبەینەشدا زانایانی ئیسلام وەك (رازی)و (زمخشری)و (فارابی)و (ئیمامی غەزالی)و (ئەبو حەیانی تەوحیدی)و (ئیبنی سینا)و (ئیبن رشد)و (ئیبنی خلدون)و زۆری تر ، هەموو لەم بوارەیان کەموزۆر داوەو لێیان کولیوەتەوە هەندیك لە زانایانی ئیسلام کتێبیان لە سەر داناوە وەك (عبدالغنی نابلسی) لە کتێبەکەیدا (تعطير الانام فی تعبير المنام)و (محمد سيرين ياخود ئيبن سيرين) لە كتيبەكەيدا (منتخب الكلام فی تفسير الاحلام) و(ئيبن شاهين) لە كتێبەكەيدا (الاشارات في علم العبارات) كە ئەمانە هەموو لەو كتێبانەياندا خەويان لێك داوەتەوەو تەفسيريان كردووە (فرويد)يش هەندێك كتێبی لەسەر لێك دانەوەی خەوو زانياری‌ی خەو داناوە.

لە کاتی خویدا سوقرات خەوبینینی (بەشتێکی پیروزو کارامەی‌ی دەرك بە شت کردن داناوە) ئەفلاتونیش ئەلێت : بریتییە لە (وحی) كە بوگیان دێتەخوارەوە دیموکرێتس ووتویە (خەوبینین بریتیە لە چالاکی وکارامەیی موخ لە کاتی ئاوابونی دەرك پێ کردنی هەست دا). ئەبوقرات و ئەرستو ئەلین (خەوبینین لە ئەنجامی چالاکی موخەوە سەر هەل ئەدات). زانایانی ئیسلام لێکدانەوەی خەویان زیاتر بە ستوە بە ئابین و بە تایبەتی بە قورئانەوە واتا خەوبینین یان بردوتەوە سەر سێ سەرچاوە یەکەمیان لە یەزدانی پاکەوەیە کە ئەمەش باشەکەیانە دووهەم لە

شەیتـانـەوەیـە کە ئەمەیان پووچە سیّ هەمیشیان وررینەیە واتـا لە نەفسـەوەیـە بەڵام لێکـدانەوەی زانایانی نوێ وەك زانـایـانی کۆن خەوبینین ئەبـەنـەوە سەر (سیّ و دووی دەروون واتا نەفس).

فروێـد کە پزیشـکـێکـی نەمسـاوی بوو لە دەست پیّ کـردنی ئەم سەدەیـەدا تیۆریەکی بۆ خەوبینین دانا کەوا (تـاودانـەوەی ئەو خواست و هەستـەیـە کە تێرنەبوون و لە ناخـدا خۆیـان مەڵاس داوەو پەیـوەنـدی بەسـیکس ـ جنسیشەوە هەیە (1)

**سەرچاوەکانی پەیدابوونی خەوبینین :**

ئەوەنـدەی زانـایان بۆیان روون بۆتەوە، بە زۆری سیّ شت هەن کە زیاتر ئەبنە هۆی خەوبینین کە بە کورتی ئەمانەن :

یەکـەم : ئەو شتـانـەی هەست ئەبـزوێنن و سەرنـج رائەکێشن ومرۆهوشیار ئەکەنەوە لەو دینایەدا کە دەوری داوە وەك ئەوەی مێشـولـەیـەك سنگی نوستـویەك بگەزێ لە خەویـا وا ئەزانیّ چەقـۆ ئەکـەن بە سنگیـدا لە خەوبینیندا یاخـود نزیـك ئاگردان یا زۆرپا نوستوەو تینی گەرماکەی بۆ دێت لە خەویا وا ئەزانی ئاگریان تێبەرداوە.

دووهـەم : ئەو کارانـەی هەنـدێـك ئەنـدامـەکانی لەشی ئەیکەنە سەر مرۆی نوستوو : وەك پربوونی میزڵدان لە میز یاخـود پربوونی گەدە لە خواردن یاخود نارەحەتی جەستە لە نوستندا ئەمانە ئەبن بە هۆی خەوبینینی ناخۆش مرۆ وا هەست ئەکـات کە خەریکـە بخنکێت یاخـود لە ئاوا نقوم بێت یاخـود دەنگی دەرنـایـەت چەنـد هاواربکات یاخود دررندە پەلاماری ئەداو ناتوانی راکات . . .

سیّ هەم : ئەو شتانەی کە بەخەبەرین بە چاو ئەیان بینین وهـەستیـان پیّ ئـەکەین و هەموو لە میشکماندا کۆئەبنەوەو ئەبن بە بیرەوەری ، لە کاتی نوستنی یاخـود خەوبینین دا سەر بەجـۆرێکی تر هەڵئـەدەنەوە (2). زۆر کەس خەو بە کاروکردەی رۆژانەیە وەئەبینیّ بە تایبەتی ئەوانەی کە زیاتر کاری لیّ ئـەکـەن جا هەر ئەو شەوە کە ئەنـوێت یاخـود لە دوای بەینێك سەرهەڵئەدات بە شێوەیەکی روون ، یاخود ئاڵوز گەڵێك شتی تری تێکەڵاو ئەبێت منالّ خەو بە بووکە شووشـەوەو قوتـابی بە تاقی کـردنەوە (امتحان) وبرسی بە خواردنـــەوەو ئاوارە بە نیشتمـــانـــەوەو بەنـــدوحـەبسی بە ئازادبوونەوە ئەبینن . .

**خەوبینین لە قورئاندا :**

لە قورئـــانـی پیــرۆزدا باسـی خەوەکـــانی حەزرەتی ئیبـراهیم و یوسف و پیغـەمبەری خۆمانی تیدایە حەزرەتی ئیبـراهیم لە ناو کۆمەڵێکی ، بت پەرستدا سەری هەڵدا، کە دەستی کـرد بە ئامـۆژگاری میللەتەکەی و بەربەرەکانیان دژی بت پەرستن خێـرا گرتیـان و ئاگـرێکیـان بۆ کردەوەو فریّیان دایە ناوی، بەڵام خوای گەورە رزگاری کرد ( یانار کونی بردا وســلامــا علی ابـراهیم). لە تاوانـا ئیبـراهیم فەلـەستینی بەجێهێشت وچـوو بۆ میسـر لەوی (هـاجر)ی هێنـا کە ئیسمـــاعیلی لیّ بـوو لەوێشـەوە هەستـا خۆی و کورەکـــەی و ژنـەکـەی چوون بۆ (مکـە) لەویّ (کعبـە)ی دروســت کرد دوای ئەوە خەونــێـکـی بینــی کەوا کورە خۆشـەویستـەکـەی ئەکـات بە قوربـانـی ولەریّی خودادا سەری ئەبڕێت (فبشرناه بغلام حليم فلما بلغ منه السعی قال يابنی انی اری فی المنـــام انی اذبحـــك فانظـر ماذا تری؟ قال يا أبت أفعـل ماتؤمـر ستجدنی ان شاء الله من الصابرين. فلما اسلما وتله للجبين وناديناه ان يا ابراهيم قد صدقت الرؤيا انا كذلك نجزی المحسنين . . ان هذا لهـو البـلاء المبين وفـدينـاه بذبح عظيم. وتركنا عليه فی الاخرين سلام علی ابراهيم كذلك نجزی المحسنين انه من عبادنا الؤمنين . . وبشرناه باسحق نبياً من الصالحين . . .) کە ئەمـــەی بە کورەکـــەی وت ئەویش قابــل بوو چونکـە فەرمـانی یەزدان ئەوەبوو خەریکی سەربرینی بوو واتـا . . چەقـۆکە بێنیّ بە ملیا ، خوای گەورە بەرانێکی بۆ رەخسـاند کە لە جیاتی ئیسماعیل سەری ببرێت وبیکات بە قوربـــانـی دوای ئەوە خوای گەورە ئیســحـــاقیشی پیّ بەخشی کەبووبە پیغەمبەرێکی راست وپاك وخۆشەویست . .

خەوەکەی لە قورئانی پیرۆزدا خەوبینینەکەی حەزرەتی یوسف کوری یەعقوبە . . (اذ قال یوسف لأبیه یا أبت انی رأیت احدعشر کوکباً والشمس والقمر رأیتهم لی ساجدین قال یا بنی لاتقصص رؤیاك علی اخوتك فیكیدوا لك كیداً ان الشیطان للانسان عدو مبین . . وكذلك یجتبیك ربك ویعلمك من تاویل الاحادیث ویتم نعمته علیك وعلی ال یعقوب كما أتمها علی ابویك من قبل ابراهیم واسحاق ان ربك حكیم علیم . . ) . .

یوسف بە منداڵی خەوی بینیوە کەوا یانزە ئەستێرە (کە بریتین لە یانزە براکانی )لەگەڵ ڕۆژ مانگیشدا (کە باوك ودایکین) سوجدەیان بۆبردوە ئەم خەوەی (3) بۆباوکی گێڕاوەتەوە ئەویش هەست ئەکات کەوا کورەکەی لەم دنیا لەوە دنیاش بە پایەیەکی بەرز ئەگات و براکانی و دایك و باوکی هەموو سەری بۆدائەنەوێنن بۆیە پێی ئەڵێت قسەنەکات و لای براکانی نەی درکێنی بۆئەوەی تووشی زیانیکی نەکەن و لای براکانی نەیدرکێنی بۆئەوەی تووشی زیانیکی نەکەن و بەخیلیی پێ نەبەن . .

بەڵام لە ڕاستیدا ولەبەر ئەوەی یوسف کورێکی ژیرو ئیسك سووك و منداڵیش بوو باوکی لەوانی تری خوشتر ئەویست و ڕووی زیاتر ئەدایە .

ئەوانیش بەمە رقیان هەڵ ئەستا ، تا ڕۆژێك بردیانە دەرەوەی شارو فڕێیان دایە بیرێکەوەو بە باوکیان وت کەوا گورگ خواردوویەتی کراسەکەیان بە خوینی بەرخێك ئاڵ کردو دایان بە باوکیان بۆئەوەی بروایان پێ بکات ، بەڵام باوکیان ئومێدی هەرنەبری خواوراستان کاروانێك لە خەلکی شام بە لای بیرەکەدا تێ ئەپەرن یوسف دەردێنن ولەگەڵ خۆیان ئەیبەن بۆ میسر لەوی ئەیفرۆشن بە (عەزیزی میسر واتا وەزیری میسر) عەزیز لە بەر راستی وژیری یوسفی زۆر ئەچێت بە دڵا ، بە جۆریك لە ئەنجامدا هەمو کاروبارێکی ماڵەکەی ئەداتە دەست لەولاشەوە ژنی عەزیز لەبەر جوانی وقۆزی بە تیری عەشقی یوسف گرفتار ئەبێت یوسفیش ئاووری لێ ناداتەوە لەسەر ئەوە ژنەقسەیەکی بۆهەڵ ئەبەستی لە ئەنجامدا یوسف فڕێ ئەدەنە بەندیخانەیەکەوە کە دوکەسی تری تیا حەپس کراوە یەکێکیان مەیگێری فیرعەون ئەویتر نانەواکەی بووە ئەم دوانە لە بەندیخانەدا هەریەکە خەوێك ئەبینن کە بۆیوسفی ئەگێڕنەوەو ئەویش بۆیان لێك ئەداتەوە هەردو لێك دانەوە کە بەراست دەرئەچێت (ودخل معه في السجن فتیان قال : احدهما انی ارانی اعصر خمراً، وقال : الاخر انی ارانی احمل فوق راسی خبزاً تأكل الطیر منه ، نبئنا بتأدیله انا نراك من المحسنین . . ) . . یەکێکیان بەرئەبێت ئەبێتەوە بە مەی گێری فیرعەون ئەوی تریان هەڵئەواسرێ باڵندە بەدەنوك مێشکی ئەخۆن . . بەینێکی پێ ئەچێت فیرعەون یاخود مەلیك خەوێکی ناخۆش ئەبینێت ( . . . وقال الملك انی اری سبع بقرات سمان یأكلهن سبع عجاف ، وسبع سنبلات خضر وآخر یابسات ، یا ایها الملأ افتونی فی رؤیای ان كنتم للرؤیا تعبرون . . قالوا اضغاث احلام وما نحن بتأویل الاحلام بعالمین) . مەی گێرە کە یوسفی بیر ئەکەویتەوە گورج مەلیك ئاگادار ئەکات ، دوای ئەوەی کە کەسی تر خەوەکەی بۆ لێك نادرێتەوە یوسف ئەهێننە دەرەوە لە بەندیخانەو خەوەکەی فیرعەون ، بەم جۆرە لێك ئەداتەوە : کەوا حەوت ساڵی ئایندە هەمووی ساڵی هات و وەرزی حاصلاتە حەوت ساڵەکەی دوای ئەوە قات و قڕو گرانی ئەبێت لەبەر ئەوە پێویستە لەبەروبووم وبەرهەمی حەوت ساڵی یەکەم مشووری گرانی و نەبوونیی حەوت ساڵی دوهەم بخورێت و دەغل ودان هەڵگریت فیرعەون کە ئەمە ئەبیەو ئەبینێ یوسفی زۆر ئەچێت بە دڵاو یەکسەر ئەیکات بە عەزیز واتا وەزیری میسرو هەمو دەسەڵاتێکی پێ ئەبەخشێ . . . خەوەکەش دێتەدی ولاتی شام وئەوانی تر تووشی گرانی دێن هیچ نامێنی بیخۆن ، خەڵکەکە بار ئەکەن باوك وباوەژنەکەی یوسف وبراکانی هەموو ڕوو ئەکەنە میسر لای یوسف کە لە سەر نەریتی ئەو سەردەمە هەموو کرنوش واتا سوجدەی بۆ ئەبەن ئنجا یوسف لە خوا ئەپارێتەوە ئەفەرموێ (رب قد اتیتنی من الملك ، وعلمتنی من تأویل الاحادیث، فاطر

السموات والارض ، انت ولي في الدنيا والاخرة ، توفني مسلما والحقني بالصالحين).

خەوی پێغەمبەری خۆشمان (محمد)(د) بە بۆنەی (شەڕەگەورەکەی بدر و (داگیرکردنی مکە)ەوەبوو غەزای بدر دوای پانزە ساڵ لە چەوساندنەوەی ئیسلامەکان ڕوویدا واتا دوای دان بە خۆداگرتن وگوێ نەدانە چەوساندنەوە. دوای ئەوە کۆچ کردن لە ڕێی خواداو بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام. ئەوەبوو تەنها (300) کەس لە موسوڵمانەکان بەسەر (1000) کەسدا لە کافرەکان سەرکەوتن ئەمەش خەوەکەی پیغەمبەر پاڵی پێوەنان بەرەو سەرکەوتن. . ( اذ يريكم الله في منامك قليلا ولو اراكهم كثيرا لفشلهم وتنازعتم في الأمر ولكن الله سلم انه عليم بذات الصدور. واذ يريكموهم اذ التقيتم في اعينكم قليلا ويقللكم في أعينهم ليقض الله أمراً كان مفعولا). .

هەروەها لە داگیرکردنی (مکە)دا خەوەکەی پێغەمبەر (د) زۆر کاریگەربوو لەوەدا کە ئیسلامەکان نەگەڕانەوە تەواویان کرد (انا فتحنا لك فتحاً مبينا . . .)

ئەمانە بوون خەوەکان کە قورئانی پیرۆز باسیان ئەکات ، ئنجاپێش ئەوەی بێینە سەر خەوەکەی لالە سەرحەدی ڕۆغزایی با هەندێك لەو خەوانە بدوێین کە نووسەران یاخود وێژەوانان بە خەیاڵ وبیری خۆیان دروستی ئەکەن زیاتریش لەبەر ئەوە خەیاڵی تێکەڵاو ئەکەن چونکە ناوێرن بە ئاشکرا لە لایەنە ڕاستیەکەی بدوێن لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەم جۆرە شتانەش زیاتر لە نوسین وکتێب وهەڵبەستی نووسەرانی ئیتالیای ئەوسادا ڕەنگ ئەداتەوە بە تایبەتی نووسەرانی سەدەکانی ناوەراست ئەو سەردەمە کاتێکی تاریك بوو تاوەکو ئایەتە ئاینیەکانیش بە چەوتی لێك ئەدرانەوەو خەڵکیان لەوەدینا تۆقاندبوو، بۆیە خەوبینن لەم بابەتە زۆر ڕێك ئەخرا یەکێك لەوانە خەوەکەی (دانتی)ی ئیتالیاییە (1265 ـ 1321) کە کومیدیای خوایی پێ ئەڵێن و بریتیە لە کاروانێك حەوت ڕۆژ ئەخایێنێ وگەلێك خەوی سەیر سەیری تێدایەو هەمووی بە هەلبەست واتا شیعر هۆنیوە تەوە. .

**کۆمیدیای خوایی ـ دانتی :**

لە کومیدیاکەیدا دانتی (رمز)ی بەکارهێناوە وەك مامۆستایەك و وەك فەیلەسوفێك ئەدوێ ، تاکو کاربکاتە سەر خەڵکی دانتی سەفەرێکی بۆ ئەوە دنیاکردوە ئەوە دیناشی کردوە بە شێ شەوە جەهەننەم وناوەڕاست (مطهر)و بە هەشت لەم کاروانەیدا دانتی سێ کەسیشی لەگەڵدایە یەکیکیان. (فرجيلوس)ەکە هەستیارێکی لاتینی بە ناوبانگ بووئەم پیاوە لە سەفەرەکەدا سەرکردەیەو ڕەمزە بۆ (عقل)، دووهەمیان بیاتریش ئەمیش (ڕمزە بو عیلمی لاهوت). سێ هەم قەشە برناردکە (ڕمزە بۆبیرکردنەوە). هەروەها ئەم دیوانی شیعرەی دانتی پەنجە ڕاکێشانێکە بۆ کاروانی مرۆو هەوڵدانی بۆ پاك بوونەوەو ڕزگاربوونی لە گوناهەکانی و پەشیمان ـ بوونەوە تاکو دوای مردن ئەگاتە خۆشیی ڕاستەقینە لە جەهەنەمدا خەڵکێکی زۆر ئەبینێ کە هەمو لە ئەنجامی کردەوەی ناپەسەندو گوناهیاندا تووش بوون و لە ئازارو چەوسانەوەدان بێ ئەوەی هیچ ئومێدێکی ڕزگاربوونیان هەبێت .

بەلام لە ناوەڕاستدا (مطهر) بەو کەسانە ئەگەیت کە خەریکی خۆپاك کردنەوەن لە گوناهەکانیان و کەفارەتی ئەدەن تاکو دوای ئەوە بچینە بەهەشتەوە. ئەم شوێنە شوێنی ئومێدە چونکە تەمای ڕزگاربوونی تێدا هەیە ئەو گیانانەی تێدان هێجگاری نین بە پێچەوانەی (جەهەنەمەوە) کە چەوساندنەوەکەی هەتا هەتایەو هیچ تروسکەی ئومێدێکی تێدا بەدی ناکرێ هەروەها بەپێچەوانەی (بەهەشتەوە) کە دوای پلەی ئومێدو ڕزگاربوون، خۆشیی و بەختیاریی یە.

دانتی لیرەدا بۆیە زۆر گرنگیی بە (مطهر) داوە چونکە شوبهاندوویەتی بە ژیانی مرۆ لە سەرزەمین بۆ ئەوەی هەرکاتێك بیەوێ ئەتوانێ واز لە گوناهو خراپە بێنێ و بەوە خۆی ڕزگاربکات . هەر لەبەر ئەمەشە کە دانتی خەوبینینی بەستووە بە (مطهر)ەوە (نەك بە جەهەنەم و بە هەشتەوە) چونکە لە هەردوکیاندا واتا لە ، خەوبینین ولە (مطهر)دا ()ئومێد) چاوەڕوان ئەکرێت کە بێتە دی(4) :

**هەندێك (ڕەمز) لە خەودا :**

ئاگرقووت دان : ماڵی هەتیوخواردن .

ڕۆژ : مەلیك یاخود دایك وباوك .

باران : خێروخۆشی .

ترێگوشین : خزمەتی شا یاخود مەلیك

مانگای ڕەش مانگای قەڵەو : ساڵی هات وخۆشی .

مانگای‌لەر : ساڵی نەهات وقاتوقڕ .

حەوت مانگا : حەوت ساڵ .

بەگوێرەی ئایەتەکانی قورئان .

دەستی درێژ : پارەی زۆرو بەخشیش .

شێر : ئفتار .

قاژوو : پیاوی فاسق .

مشك : ژنی خراپ (فاسقه) .

قسەی پێغمبەر (د)

سەیرکردن لەپەنجەرەوە : دوعا گیرابوون

بینینی خواو وەزیر : تەمەنی درێژ و ژیانی ئاسوودە .

بینینی کورتە باڵا : تەمەن کورتی .

دانیشتن لە ژێـر سێبـەری دارا : ڕزگـاربـوون . لە ماندوبوون حەسانەوە .

دانیشتن لە بەینی لقی و پۆپی دارێکی بەردارا : ڕزقی زۆر

سەرکـەوتن بۆ سەرچیـای : بەرز سەرکەوتن لە ئیشداو پایەی بڵند

خواردنەوەی شەراب : قسەی خۆش وجوان کردن .

شیرخواردنەوە : چاك بوونەوە لە نەخۆشی و تەندروستی ی .

دانیشتن لە ژیر شەوقی مانگدا : لە گوناه خۆشبوون .

کەوتنە بیرەوە یان کەوتنە چاڵەوە : چوونە بەندیخانەوە

جلی سپی لە بەرکردن : ڕزگاربوون لە نەخۆشی خراپ .

جلی پیس ودڕاو لەبـەرکـردن : تووش خراپـە یان نەخۆش بوون .

سەربڕینی قاز : کوشتنی دوژمن .

جل سووتان : تووشی ناخۆشی بوون .

ڕۆیستنی بە ڕووتی : ناو زڕاندن .

لای میسریەکانی کۆن (فیرعەونەکان)

سەگت دواکەوێ : هاورێیەکی دڵسۆز یارمەتیت ئەدا .

بە ناو پەڵەگەنمێکی گوڵدارابرۆیت : خێرێکی زۆرت دەست گیر ئەبێ .

بە سەرزەوی‌یەکی وشکدا بڕۆیت : تووشی زیان ئەبیت .

ماسی بینین لەئاوا هەل هەڵکەوتنە بۆ دەست کەوت .

ماسی لەبەینی هەردودەست دا : خێریکت لە لاوە بۆ دێت .

سیمـرخ بینین : زۆر چاکـە : چوونـە بەهـەشت ونەمری ی (خلود) .

باز : بینینی ونیشتنەوەی بە سەرتاو نزیکت هەموو خێرن .

لای فیرعەونەکان

قاز : باشی نی‌یـە . دان بخـوات واتا ڕزقت ئەبرێ .

بە سەربڕراوی واتا لە دوژمن ڕزگاربوونە .

پەپـووسلێـمـانکـە (هـدهـد) : ئەگـەر بە سەر پەنجەرەکەتەوە نیشتەوە ئەوە پەیامێکی خۆشی پێ‌یە .

شەمشەمەکوێرە : بە دەورتا بسووڕێتەوە ، تووش بوونە .

کۆتـرو مریشـك : خۆشـی خیـزان وگەیشتنی بە خواست و ئاواتە .

سەگ : سپیـەکـەی هاورێی دڵسـۆزەو ڕەشـەکـەی هاورێی ناپـاکـە ومـردنی : لە کیس چوونی هاورێیـەو کلك ڕاوەشاندنی خۆشی ی ناوماڵە .

گا : تورەیی وهەڵچونە .

کلیل دۆزینەوە : نەهێنیەکت بۆ دەرئەکەوێت .

کیل لە دەرگادا : کردنەوەی قاپی ڕزقە .

کوێربوون : تووشی تەڵەکەبوونە.
کوێربوونی چاوی ڕاست سەرنەگرتنی خۆشەویستیە.
خوێن : خێروچاك بوونەوەیە لە نەخۆشی.
ڕەنگی ڕەش : گوناەو زۆرە.
ڕەنگی سپی : پاکی و ڕاستی ونوری خوایە.
ڕەنگی زەرد : حەسوودی : چاوپیسی یە.
ڕەنگی قاوەیی : فێڵ ، تەڵەکەیە.
سەوزیتێر : شەڕو خراپەیە.
سەوزیکاڵ : خێرو خۆشی یە.
زەردی ئاڵتونی ی : حیکمەت ، بەرزبوونەوەیە.
زیوی : بێبروایی بەخۆ ، دوودڵی یە.
شین : برواو یەکبوونە.
ئاسمانی ی : ئومێدو بێگەردی یە.
سوور : زەبرو خەتاو شەهوەتە.
بنەوشەیی : بروا وئایینە.
پزیشك بینین لە خەوا : تووش بوونی نەخۆشی یە.
گۆج وئیفلیج بوون لە خەوا (شلل) : چاك بوونەوەیە لە نەخۆشیەکی قورس.
خۆشتن لە حەوزدا : تووشی بوونی نەخۆشی جومگەکانە.
خۆشتن لە ئاوی لێڵ دا : تاڵی هاتنە.
خۆشتن لە دەریادا : تایەکە بەری ئەدات.
مارلە قاچەوە ئاڵان : (تصلب شرايين).
دوپشك بدا بە دەستی چەپەوە : نەخۆشی دڵە.
تەونی جاڵجاڵۆکە لە سەر سنگ : نەخۆشی سی یەکانە.
باڵندە بە سەرسەرا بسوورێتەوە : گل کردنی چاوە.
تووکی سەر رووتاندنەوە : سەریەشەیە.
تووك دەکردنی لەشی : نەخۆشی پێستە.
مێرووله هەڵگەران بە لەشدا : نەخۆشی ئیسقان و(فقرات)ە

کوورەی هەنگ بینین : نەخۆشی گوێیە.
خواردنی بۆڵەترێ : نەخوشی ریخۆڵەیە.
پاڵ کەوتن لە گۆرردا. چاك بوونـەوەیـە لە نەخـۆشی خراپ و درێژ ی تەمەنە.

لای میسریە کۆنەکان فیرعەونەکان

مەلیك : باووك.
مار : نێرینە. لای فرۆید
ژ وور : مێینە.

بەشی دووهەم :

# خەوەکەی لالە سەرحەد

**• پێشەکی ی:**

میللەتی کورد وەك هەمـو میللەتێکی تر کە لە ریـزی خۆیایەتی، بە تایبەتی دانیشتوانی دەرەوەو لادێو بەشێکی زۆریش لە دانیشتـوانی شارەکـان ئەمـانە هەموو کەموزۆر بروایـان بە خەوبینین هەیـە. زوریـان رەش بینـانـەلێکی ئەدەنـەوە یاخـود خەڵـك بەو جۆرە بۆیـان لێـك ئەداتەوە، دڵیـان دائـەچلەکێنن و ئەیـان خەنـە مەراقێکی زۆرەوە، هەشــە روون بینـانـە تەفسیـری ئەکـەن، هێمن و جۆرە حەسـانـەوەیـەکی نەفسی ئەدەن بەخـۆیان و دڵیان خۆش ئەبێت. لە راستیشدا وە نەبێت لیکدانەوەکانی هەردولا لە سەربنـاغـەیـەك بێت لە سەر ئەوبنـاغانەی باسمان کردن هەروەهـا یەکێـك نەبـوە خۆی بەم جۆرە شتانەوە خەریك بکـات و جۆرەشـارەزاییەکی تێدا پەیدابکات. مەلاکان و کۆلکـەخــوینــدەوارەکـان نەبێت کە بەکتێبی کۆن وەك نوسینـەکانی خواجە حافزو شێخی سەعدیو هەندیکی تر (تفاؤل)یان بە خەڵکی پەیدا ئەکرد، بێ ئەوەی ئەو کتێبانە پەیوەندییان بە لێك دانەوەی خەوەوە هەبێت. بەلام ئەوەی زۆر باوبـــوو لە ناوکـوردەواری‌دا، بگـرە تاکـوئێستـاش،

ئەوەبوو کە خەوبینین بە خواو پنغەمبەرو شێخ و مەشایخ و وەلی و پیاوچاکانەوە، ئەوکەسە بەرزئەکاتەوەو بێ ئیمان نامرێ و (سلبی) سەرە مەرگ نابێت و لەوانەیە یەکسەر لەوە دنیایەبەرەو بەهەشت بچێت.

من خۆم منداڵ بووم هەرچەند تەمانەم ئەبیست و ئەژنەفت هەربیرم لەوە ئەکردەوەو خواخوام بوو شەوێك لە خەومدا بە خزمەتی خوای گەورە یاخود پێغەمبەری خۆشەویست بگەم. ئەم بیرو لێکدانەوەیەو شەو بەوخەیاڵەوە نوستن وای لی کردم، شەوێك لە تەمەنی شانزە سالی دا خەوم بە پیغەمبەرەوە دی، دەستم ماچ کردو ئەویش سەری ماچ کردم و کێشای بە پشتما کە تەمەنم درێژ بێت. بۆبەیانی ئەوەندە بە خۆشیەوە خەوەکەم گێرایەوە وەك لە تاقی کردنەوەیەکی گەورەدا بە یەکەم دەرچووبم، خەمکیش لە راستیدا بە خیلیان پێ ئەبردم کە ئەو خەوەم دیوەو بوو بە تەحاتەحا ئیتر خزم و بێگانە بە جۆرێکی ترو بە چاوێکی کە سەیریان ئەکردم، ئەمەش بەینێکی باش دەوامی کرد تاشتەکە وردەوردە لە بیرچووەوە بەلام لە بیر خۆم هەر نەچۆتەوە.

جا من خەوەکەی لالە سەرحەدیش هەر بەم جۆرە لێك ئەدەمەوە، لالە سەحەرد لە کۆمەڵێکی دواکەوتووی سەدەی نوزدە هەمدا ژیاوە، ئەو سابیرو باوەری ئایینی گەلیك بەهێزترو کاریگەرتر بوو لە ئێستا بۆیە ئەویش خەوەکەی بە خواو پیغەمبەرەوە دیوەو رەنگ هەیە بە خەیاڵیشی کەموزۆر شتێکی تیکەڵاو کردبێت، بەڵام وەك هەندێك کەس کە لە خۆیانەوە ئەڵێن خەوەکە هەڵبەستە من ئەم رایە بە راست نازانم هەموکەسی خەوئەبینی و خەودینیتە دیی. ئیتر بۆچی ئەم خەوە درۆبێت بەڵێ خەیاڵ یاخود هەڵبەستی رەنگ هەیە تێدا بێت، بە تایبەتی ئەو قسانەی کە پەیوەندییان بە خۆی و قەیتولی کوری و عەشرەتەکەیەوە هەیە جا پێش ئەوەی بێینە سەرگێرانە وەی خەوەکە بابزانین لالە سەرحەدکی یە : ؟

**لالە سەرحەد**

لە رەگەزدا خەڵکی دێی دسکەرەیە سەر بە ناحیەی تانجەرۆ لە پارێزگای سلیمانی. دسکەرە ئەمرۆ دێیەکی سەدماڵی ئەبێت نزیك چەمی تانجرۆ یەو نزیك رێگای ئۆتۆموبێلی بەینی سلێمانی و دەربەندیخانە.

لالە سەرحەد لە تیرەی رۆغزایی لە عەشرەتی جافە لە کاتی خۆیا (دەست پێ کردنی سەدەی نۆزدەهەم) پیاوێکی نان بدەو دیاربوە، ئەو ساکە هەر گەرمیان و کوێستانیان کردوەو مالداری ئاژەلیان کردوە، تۆوچاندن و ئیش کردنی تریان بەلاوە شورەیی بوە، رۆژ رۆژ ی (گاڵت وەگویز)(5)بوە کوڕێکی هەبوە (قەیتول)ی ناوبوە زۆری خۆش ویستوە، کوڕێکی تری هەبوە (موالی)ناوبوە ئەم (موالی)یە باوکی (6) (خەلیفەیونسی بەناوبانگە). لە رشتەی مرواری دا هەندێك رووداوی دزی هەیە ئەیدەنە پاڵ لالە سەرحەد، خوێنەر ئەمە وا بێت ئەوەئەوسا کۆمەڵەکەو رۆژگار بەو جۆرە بووە.

هەرچۆنێك بێت خەوەکەی لالە سەرحەد بەلای منەوە (رائعە)یە کە لە ئەدەبی کوردیدا. هەربۆ ی مامۆستا علاء الدین سجادی کە ئەویش نەیهێشت ئەم شتە بە نرخە بفەوتێ وخستیە سەر لاپەرەکانی رشتەی مرواری. دەسا فەرموون ئەمە ئێوەو ئەمەش خەوەکەی لالە سەرحەد.

# خەوەکە

لالە سەرحەدی روغزایی ئاشنایەکی سەرراجی هەبوو زۆری خۆش ئەویست، هەمیشە لە قسەکردنیشا بەربەرەکانی یەکیان ئەکرد، شەوێك میوانی لالە سەرحەدبوو، بەیانی هێشتا لە خەوابوو، لالەسەرحەد هەڵی کوتایە سەر جێگاکەی، نووکە شەقێکی تێوەژەند بانگی کرد (ئاکوررە راستەوەوە گۆرانە هزە نیوەرۆیە) (8). کابرا بە دەم خەووەوە وتی : گەماڵە پیرە بە میوانیش ئەگەفی(9) ؟ لالەیش ووتی (ئابرا تۆدەنگ، ئێمشەو

خەوێکم دیگە، کەسی وانەوو فاڵەکەیم بۆبگێڕیتەوە، با وەتوێ بێژم) سەرراجیش ووتی : تۆبێژ ی ی، ئەگەر پچرپچریش بێ، بە دەرزیو درەوشەپێکەوە گیرەوبەندی ئەکەم (10) ئنجا لالە دەستی کردە خەوگێڕانەوە ووتی : (سەس ساق) (11) و (بالآنتەران) (12) گۆییان پێوە وێ، گوێی دوژمن کە رروێو چاوی گشت وردە شاتریو (13) گەلآیی (14) کوێروێ، لە خەوما گویلکە میچکەیەکمان گوم بوبو، شۆینم هەلگرتبو، گەیشتمە ئەودەشتی (نێرگەە جاررە) (15) روانیم پیاگێکی ریش چەرموگی نورانی لە سەر بەردەکەی (مەحمود گاوانی) (16) لێ ی هەڵیاژ یاگە، گاڵوکێکی وەتەنشت خۆیا راکیشاگەو بووزگێکی لاوخاسی لەبەر دەما ویساگە، چست و چالاك مەگەر هەر خۆم لە تافی کورڕێنیما وا وریا بو بێتم پرسیم برا تو کێ یو ئەو پیرەکیس؟ وتی : لالە ئەوە بینایی چاوانەو منیش (حەمەد رەسولّ الله)م لە دڵی خۆما وتم پیاو وەخوا خاس بوو ئێستا وەکەرامەت سۆراخی گۆیلکەکەم (17) بۆ ئەکات.

چوومە بەرەوە، سلاوێکم کرد هیچ نەجمیا (18)، بەلآم وەلا ـ لوتێکەوە بۆلەیەکی لێوە هات وەکو جواوی سلاوەکەی دابمەوە واوو، تەمام ووتوررەیم بێژم کاورا سلاو سلاوی خوایە تۆبۆچ خاس جوابم نادەیتەوە وەگاڵۆکەکەت ئەنازی؟ حەمەد رەسول الله خێرا تێ گەیشت هاتەبەرەوە وتی : قورروان ئەوە لالەسەرحەدە، لالە سەرحەد. ئنجا جمیاو چوار مەشقی لێ یدانیشت و وتی : لالە وەخێرهاتی، مەرروانەقسور، شەونەخەوتووم، نیازمان بوو بێ ینە میوانی یتۆجارێ ئەم دەشتەم لاخۆشوو وا تۆزێ لێرە حەساینەوە. . . منیش وتم : قورروان وەخێر بێ ی فەررو بە رەکەتت هاورد وتم : لەو وەختەدا لام کردەوە پێ کوررەیەك لە چەمەوە هات ئاکاورا بی لاوەلا، کاورا وەهەڵەداوان رای کرد هات وتم بت بینم چۆن رائەکەیت؟ بچۆرە مالەوە بێژە وە خازە (19) میوانمان تێت، شەکە گێژەکە سەرووررن، گۆشتی شەکی گێژ فرە خۆشە.

پی کوررە رۆیو منیش روانیمەبەروبەریشتێنی بینایی چاوان، کیسەو سەویلم نەدی سەویلەکەی خۆمم دەراورد فرەخۆشەویست و ولەلام، لەو ساڵەوە خازەم هاوردوو چوبومە تانجەرۆو سڵ بکەم ئەو سەویلەم دوزیوەوە کیسە توتنیش هەر ئەو کیسەووکە لە کراسی منالی (قەیتوڵی) و خۆیشکەکەی مابووەوە، هەرچەن ئەوانیش پیاهەڵ ئەمیزان، بەلآم خازە گجارێ ئەیشۆرد توتنەکەشی کورگەل لەکاروانی بەغدایان داوو هەنێك توتنیان بۆ هاوردوم توتنەکە فرە خۆشوو مەگەرتوتنی بەراوی (قاینەجە) (20) هاوشانی یبکردایە.

سەوێلێ خاسم تێ کرد، دامەدەست حەمەد رەسول الله بۆم بگرێ تا ئاگری بۆ ئەکەمەوە هەسێ و بەردەکەم دەراورد، گازێ پوشوی (21) ناودارم داگیرساند ~~ئە~~ ~~ئەکەمەوە، هەسێ و بەردەکەم دەراورد گازێ پوشوی~~ ~~ناودارم داگیرساند~~ سەویلم لە دەست سەندەوەوپوشوم خستەسەر قومێکم لێ دا تاخاس داگیرسیا دامە دەم بینایی چاوان، مژێکی لێ دا فەرمووێ: لالە ئەم توتنەت لە کوێ وو فرە خۆشە، بێژە جاخێکم بۆداگرن لە تەك خۆما ئەیووم وتم وەچاوان.

لەو دەمەدا تەماشامان کرد وا لە دوورەوە بررە سوارێك دەرکەوتن، کە هاتن من ناسیمن، بینایی چاوان فەرمووی لالە ئەوانە کێن؟ وتم بینایی چاوان کورگەلی تەرخاینن هاتگن بۆ پێشواز، وتی با بچین بەولاوە فرە بێ فەررن بە شۆین ئەوانا دەستەیەکی تر هاتن پرسی ئەمانە کێن؟

وتم ئەمانە وردە شاترین، دیسان فەرمووی ئەمانەش بێ فەررن. کاروانێکی تر هاتن پرسی ئەمانە کێن، وتم ئەمانە گەلآلین، وتی ئەمانە هەر فرە بێ فەررن با چارەیان نەوینم (22).

ئەوا بینایی چاوان خۆی لەو سەرەوە دانیشتگە، حەمە رەسول الله لەو لایەوە منیش لەم لایەوە هەر وا قسەمان ئەکرد کەچی تاقمە سوارێکی فەقیانە شۆرری سەروپێچ داری گشت جوان خاس تۆز ئەکەن و هاتن بۆرکەوە سوارێك لە پێشیانەوە تەراتین ئەکات بای غەزەوو،

دەتـۆزی قولیـا ناگـات بینایی چاوان فەرمووی لالە ئەمانە کێن؟ وتم ئەمـانــە کورگـەلێ رۆغـزایین، ئەوسوورکـەوە سوارەش لە پێشیانـەوە (قـەیتـول)ی خزمەتکارتە . تومەز ئەمـانە هەموو کە کاروای پێ کورره خەوەری بردبوو گشت هاتگن وەپێشـواز بینـایی چاوان فەرمــوی (مـاشـاالله ، ماشاالله لە خێلی رۆغزایی، لە قەیتولی سوورکەوە سوار، ئابێ بێژە چکێ نۆما سورکەوە با خێوێ) منیش وتم (قەیتە ئابتوینم خۆماسایی وەچاخی باوکت روون کەرۆ) قەیتول ئاوزەنگی پیا هاورد، خێروێ و بیروێ، نۆما هات وەخۆیا سەری سوارێوو، کلکی سوارێـك (24)، قەیتولیش لە ناوەراستیا وەك حمە رەسول لله سواری بوراق بوو بێ وا بوو.

لەو سەرودەم . ا سەیری قەیتولم ئەکرد حەمەد رەسول الله سەری نابـوە بنـا گۆیێ بینای چاوان، تێ گەیشتم کە گەرەکیـە بە بینایی چاوان بێژ ێ داوای نۆماکەی لە قەیتول بۆبکـات، وتم کاکـە قسـەی خۆت مەدۆرینـە، قەیتـول نەگریس و تووەو کەللە شەقە، لێت توورره ئەوێ، میوان نەوی خواش وتی نایــدا، بینــایی چاوان فەرمــووی: محمد ئەم نۆمایە هەر بۆ قەیتول خاسەو هەر لەو دێت، من بێژم وەرەئیسی عەنزەچارەوێیکی (25) عەرەوی قرەخاس بۆ تۆ بنێرێ.

سا ئێمـە لەوحەیسـەو بە یسـەدا بووین تێ فکریم وەك قەتــارەی قۆلنــگ سەر یەك ینشتـوێ هەر پێ کوررەیـەك سینیـەك، یاسـەلـەیـەك (26) وەسـەر سەرەون نان هات بەلام چ نانێــك؟ پلاو گشت وەك مەلای سەرچــەرمـگ تەشـوە ترشێ (27) هەسـەن وەگی لە تەکـا وەقـاورمـەی شەکەگێژا دەورە دریاگە پیاك ئەشیا بێژ ێ هەر نانەو بۆخوا دروست کریاگە.

نان رانـرا، (خـولـە)ی ئەیی کەوکۆ وەخۆیو زورنایەوە پەیــدا بوو بێــوەی کەس پێ ی بێــژ ێ پیـکـی زورنـــای لێ خۆش کردو فیقاندی وەزوورنادا ئەوانەی نانیان هاوردوو کەوتنە ژەنن ، کاورای دەهۆڵ ژەنی قلیاسانی وەفررگانێ دەهــۆڵ گەیــانـد، لە تەقـەی دەهـۆڵ وزورنـا لە گشت لایــەکــەوە کەنیشــك و شۆرە ژنی جاف گلیـرَبـوونـۆ، بوەرەشـوەلـەکێـك بۆحـەمـە (28) پاشـاش ئەوزەمـاوەنە نەکـریاوو. جابراکە بزانە چەن خۆش وووەدەنگی دەهۆڵ وزورناوە (29) ئەو نانە نۆشی گیان کریا.

حەمـەد رەسـول الله فەرمـوی (شنینـە) نەمـزانی چی بیژ ێ، بینایی چاوان فەرمووی (دۆ)ی گەرەکە، مەشکەدۆ هات کاسەیان بۆپرر کرد، کەوچکی نەگەرەك وو، هەروا کاســەی ناوە سەریــەوەو ئۆخەیـچیشی کرد منیش ووتم یارەووی نۆشی گیــانت وێ، هەروا لە دەنگی دەهـۆڵ و زورنا مکایلیی وسەدانی گلێربوونەوە، بینایی چاوان پرسی لالە ئەمانە کێن؟ عەرزم کرد قورروان مکایەلێن لە تەك ئیما ناکـۆکن فەرمـووی رایـان کێشن بۆجەحـانم لە زیـررەی ئەوان خەوەرم بوە.

کاتێـك لالـە سەرحـەد ئەم خەوەی گێـرایەوە سەرراج ووتی: لالە تۆ بێژ ی ئەم گشت تەحامەیان هاورد، خۆمن هێمـان لە ماڵی تۆچەشکـەی برنجم نەکردگە؟ خازە هەر بێـژ ی برنـج نەکـوتیـاگـە، چۆن بەو دەمـودەسـە کوتـریاو لێ نـریـا؟ منیش ئیمشـەوخوا وەخێـری بنـوسێ خەوێکم دیگــە. لالــە سەرحـەد وتی: ئابـرا بێـژ ی بزانم تۆچیت دیگە؟ . . سەررا ج وتی: -

(لـە خەومـا من زینێکم بۆچارەوێ فلقـەکـەی تۆدوریـوو پارەت نەداوومێ هاتم وەگـژتـا تۆش دەستت لێ دابـوومـە شیـــر وســـوبـــاشی حەمـە سالـح بەگ قائمقـامی (30) هەلـەبجـە گرتینی وبردینیە دیوان پرسی ئەرێ گەماڵە پیرە ئەم پیــاوە زینی بۆدووریی پارەت بۆچ نەداوەتێ؟ تۆش وتت میرم ها لە مالما بەخێوی ئەکەم پارەی چی بەمێ؟ لە سەر ئەوە ئەمـری کرد هەردوکمـانیـان راکێشا منیان خستە

چاڵێـك پیسـایی ئەدەبخـانـەوەو تۆشیان هاویشتە چاڵێك هەنگوینەوەو لەشمانی تێوەچوو. . .

لالــە سەرحــەد هەڵی دایـە وەكـانم لە دەرەوەی وڵات تەبلیغات دەكات پولێكی زۆریان لێ سەندم .

سەرراج ووتی : ئەری وەللاتیا قورس بوبوم لالە سەرحەد وەكـەیـفی بوو كەوتـە تیتـاڵی وتی : خۆرایی نی یــە، بانـگـێشتنم بۆ بینـایی چاوان كردگــە سەرراج وتی ئەو ساكەش تۆپێكەنیت میرڕقی هەستا ئەمری كرد : مەواشیر بدەلێـیان ، بێـژە ئەشێ یەكتـر بلێسنـەوە من دەستم كرد وەلــێـســاانــەوەی تۆفرە خۆش وو تۆش دەسـتـت كراد وەلێسانەوەی من قێزت هاتەوە بە سەریا رشایتەوە ئەویشیان بە زۆر پێ لستینەوە .

لالــە سەرحــەد كە گوێ لەمــانـە بوو دەستی كـرد بە جنێـودان و بە دەمیشیـەوە هێڵنجی ئەداو ئەیووت (دەویت باوكـە ئەوە خەوە تۆدیگتـە؟) سەرراجیش ووتی : (ئـەی گەمـاڵـە پیرەی بێ كەڵبەیە ، ئەوە خەوە تۆدیگتە فلیانت بۆ خوا لە كیسـەی توتنی میـزاوی دا تێ كردووە ، بۆچارە وێ فلقێـك كە بە دزیـەتی چنگتـان كەوتوە قسەی خوداو دڵی پێغەمبەرت شكاندوە؟)(31) .

دوا تێ بـینیم بەرامبـەر بەم خەوە ئەوەیـە : كەلالــە سەرحــەد گەلێـك شانـازی بە خۆی وقـەیتـولی كورری‌و چارەوێ سوورکــەوەكــەی لە هەمــوو زیــاتـر بە تیـرەی رۆغـزاییـەوە ئەكـات كە خۆیانن وتیرەكانی تری لا هیچە (هـەرچـەنـدە هەمـوشی ئەچنەوە سەر عەشرەتی جاف) هەروەهـا ئەیـەوێت (نـان بدەیی) خۆی دەربخـات وەك زوربــەی خێڵەكی واتــا عەشـایـەر كە ئەودەست و دڵـە فراوانـەیان هەیە جگە لەوە هەرچەندە خەوەكەی بەوجۆرە بووە یاخـود بەو شێـوەیـەی گێراوەتەوە بەڵام هێزی ئایینی‌و بـروای ئەوپیـاوە دەرئـەخات بەرامبەر بە یەزدانی مەزن و بەپێغـەمبـەری خۆشـەویست بەو شێوەیەی كە خۆی تێ ی گەیشتوەو چۆتە دڵیەوە هەندێ كەس رەنگە هەیە ئەم خەوە یاخــود قسـەكـانی لالـە (كفـر) و(بێ دینی) بزانن دەسـا ئەوەنـدەی من تێ‌گـەیشتبم ئەو بەوپەرری بڕواو ئایینەوە ئەو قســانـەی گێـراوەتـەوە بەڵام لە چمكی سەیـركـردنی خۆیـەوە وەك ئیسـلامێكی ساكـارو رۆڵەیەكی عەشایەری نەخـوێنـدەوار، دواقسەم ئەوەیە ئەڵێم : هەندێك مۆركی هەلبەست بە خەوەكەوە دیارە، سا لە گێرانەوەی ئەم دەم بۆ ئەو دەم و لەمــەوە بۆ ئەو یاخــود لالــە سەرحــەد خۆی خەوەكـەی دیـوەو چكێكیشی پێـوە ناوە بەڵام لە ئەنجامدا ئەمـانـە هیـچ لە (أصـل)ی خەوەكـەولە نرخـەكـەی كەم ناكەنەوە .

□

## پەراوێزەكان :

1 ـ سەیـری گۆڤـاری (الهـلال) ئوكتـوبـەری 1975 بكـە ژمارەی تایبەتی كە بۆخەوبینین تەرخان كراوە. ل 65 .

2 ـ سەرچاوەی پێشوو : ل 63 .

3 ـ لە زۆر شوێنـدا وشــەی (خـود) شوێنی خەوبینن ئەگـرێتـەوە ئەمیش بەگـوێـرەی رست و وشـەوشـوێنـە ئەگـوررێت كە تێدابەكار ئەهێنرێت لە راستیشدا لە قسە كردنی رۆژانەماندا ئەمە شتێكی ئاساییە .

4 ـ ئەم كومیـدیـای خواییـە زۆرەو دوورو درێـژە ئێمـە لێرەدا لەمـە زیاترمان نەتوانی لە سەری برۆین .

5 ـ ئەوسـا كە هێشتـا كۆمـەڵ كوردەداری لە گەرمیـان و كوێستـان كرندابوو بە دوای ئاژەڵدا هەندێك تازە نیشتە جێ بوبوون (گۆران) یان پێ ئـەووتن كە بە لای كۆمـەڵی یـەكـەمـەوە (كـە كوردیـان پێ ئەووتن). سووك بوون بە جۆریـك كە (گـاڵ) یاخـود هەرزن یان بچـانـدایـەو كوردەكـە رانـەكـەی بە شوێنكیدا لێ خوریایە كە پەڵە هەرزنـەكـە یاخـود گاڵـەكـەی لە سەرە رێگـادا بوایە بێزی نەئەهات رانەكە لابدا بە گۆرانەكەی ئەووت گاڵت وەگوێزە .

6 ـ بە خەلیفـە یونسی دسكـەرە ناوبـانگی دەركردبوو من خۆم دیبوم

پیاوێکی کەڵەگەت ریشێکی سووری دوفلیچقانەوەدەنگێکی گڕی هەبوو جوتێك چەكمەی سووری بە سەر شەرواڵ دا هەڵ ئەکێشا کلاوێکی قووچی لە سەر ئەکرد لام وایە خەلیفەی شێخی قەمچی رەش بوو خەلیفە یونس لە نان بدەنیی و سواری وقسەی نەستەقدا پیاوێکی پیاوانەبوو چادری دوانزە ئەستوونی قاجاریم هەر لای ئەودیوە ئێستا سەرحەدی کوری لە شوێنیەتی .

7 ـ رشتەی مرواری ـ بەرگی یەکەم . چاپخانەی مەعاریف 1957 ل 25 ـ 29

8 ـ وەك وتمان ئەوسا سەردەمی خێڵ و عێلایەتی وگەرمیان وکوێستان بوو کورد (رحالە) بە چاوێکی سووك سەیری گۆران (حضری ـ مدنی ـ یاخود نیشتەجێ) یان ئەکرد . بە تەواوەتی بە پێچەوانەی ئێستاوە .

9 ـ ئەگەفێ واتا ئەوەرێ ؟ وا دیارە هەردولا بە سەر یەکیانەوە هەبوە بۆیە قسەیی وایان لەگەڵ یەکاکردوە .

10 ـ بەودا کەوا زین درووەو دەرزی ودرەوشەی هەیە وئەیدوورێتەوەو بە یەکیەوە ئەلکێنێ واتا بۆی لێك ئەداتەوە وتفسیری خەوەکەی بۆ ئەکات .

11 ـ سەس ساق (سەید صادق) کوری شیخ عیسای بەرزنجییە کەلەکاتی خوێدا شێخی ئەوناوەبوە هەر لەوێ وەفاتی کردوە بە سەرگردیکەوە نێژراوە نزیك شاری (سید صادق)ی ئیستا کە لە سەر ریگای ئوتومۆبێلی بەینی سلێمانی و هەڵەبجەیە ومەرکەزی ناحیەی سید صادقە لە سیلمانی

12 ـ بالأنبەران ـ (شەخسێکە)لە ناوچەی شارەزوودا خەڵك بە پیرۆزی دائەنین .

13 ـ 14 ـ وردە شاتری وگەلاڵی هەر یەکە لقێکن لە عەشرەتی جاف

15 ـ نیرگسەجار . واتا شوێنی نیرگس شوێنیکە یاخود دەشتێکە لەشارەزوورانزیك دیێ دسکەرە .

16 ـ محمود گاوانی : شەخسێکە لە ناوچەی شارەزوورا نزیك دسکەرە

17 ـ گوێلك ـ گوێرەکە .

18 ـ نەجولاَ .

19 ـ خازە ـ ژنی لالە سەرحەد بووە .

20 ـ قاینەجە دیێەکە لە شارەزوور لە کاتی خوێدا دێی عیزەت بەگی حمە صالح بەگی جاف بوو جا لەبەر ئەوەی هەوای گەرمە بروا ناکەم توتنی خۆشی تیا پێ بگات .

21 ـ ئەستێ لە ئاسن دروست ئەکرا کە ئەدرێ بە جۆرە بەردیکی تایبەتی دا ئاگر ئەدا پوشو ناوەرۆکی داری گەندەڵە کەوشك ئەبێتەوە ئەخرێتە بەینی بەرد و ئەستێ کە چونکە وشکە زوو ئاگر ئەگرێ جگەرەو سەبیلی پێ دائەگیرسێت .

22 ـ ئەمانە هەرچەندە لە دواییدا هەموو ئەچنەوە سەر عەشرەتی جاف بەلاَم (منافسە) و بەر بەرەکانی لە ناو لقەکانی عەشرەتەکەدا هەبوە لالە خۆی وروغزاییەکانی لەوان بە زیاتر داناوە .

23 ـ واتە زۆر خێراو بە هەڵمەتە .

24 ـ ولأخی رەسەن وچاك ئەوولاخەیە کە لە کاتی غاردا سەرو کلکی بەرزکاتەوە نەك سەری دانەوێنی وکلکی بەرێت بە ناو گەڵیا

25 ـ چارەوێ و نۆما هەریەکن .

26 ـ سە لە مەبەستی (سلە)ی عەرەبیە کە لێرەدا پلاوپالێوە .

27 ـ چێشتی شلەیە .

28 ـ مەبەستی حمە پاشای سەرۆکی عەشرەتی جاف و باوکی وەسمان پاشاو مەحمود پاشایە کە کۆشکەکەی لای کەلار لە سەر قەلاکە دروست کردوە .

29 ـ واتا لە سەر ئاوازی مۆسیقا .

30 ـ وسوباسی واتا زەفتیە حمە صالح قائمقام حمە صالح بەگ بابانە کە بە ڕای حامد بەگی جاف ئەم پیاوە پێش زەمانی لالە سەرحەدبوە .

31 ـ لە راستیشدا مامۆستا سجادی وەستایی بە کار هێناوە لە دارڕشتنەوەو گێرانەوە ونووسینەوەی خەوەکەدا هەروەها لە دەمە تەقێی بەینی کابرای سەرراج و لالە سەرحەددا .

# لاپەڕەیەکی پێچراوە لە ژیانی موفتی زەهاوی

لێکۆڵینەوەی: محەممەد مصطەفا حەمەبۆر
(هۆشەنگ)

مامۆستای بە برشتمان؛ شێخ محەممەدی خاڵ، پەڕاوییەکی (140) لاپەڕەیی زۆر گرنگ و بە نرخی، لە سەر محەممەد فەیضی ئەفەندی، بە ناوی: (موفتی زەهاوی) یەوە نووسیوە، وە لە ساڵی 1953ز دا لە چاپخانەی (مەعاریف) لە بەغدا لە چاپی داوە، کە تاکو ئێستا چکەسێك ئەوەندەی ئەو؛ قووڵ و فراوانی لە سەر (موفتی) بڵاو نەکردوتەوەو، ئەوەندە ووردو زانستیانەو بە (سەرچاوە)ی زۆرەوە لیٚ ی نە تۆژ یوەتەوەو بە بینی درێژ و بیٚ لایەنانەو دەسپاکیەوە بەدوایا نە گەڕاوە، کە لەم لێکۆڵینەوەیەمدا ئەو سەرچاوەیە بە ڕەمزی (خاڵ)، نیشانە بۆ ئەکەم.

بەڵام کۆنترین نوسراوێکیش کە لە سەر (موفتی) بڵاو کراوەتەوە، لە بەر هەرە کۆنیەکەی کەم کەس پیٚ ی زانیوە، ئەویش، ئەوەکەی: (ئەلەکسەندەر ژابا) (1) یە کە چ مامۆستا (خاڵ) و چ ئەو: (4 ـ 5) جارەی کەسانی دیکە لە سەر (موفتی) نووسیویانەو (شت) یان بڵاو کردوتەوە؛ چکامێکیان نیشانەیان بۆ ئەوەکەی: (أ. ژابا) نە کردوە.

لە بەر ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەمدا دەقی ئەو نووسینەی : (ژابا) و پارچە هەڵبەستێکی بڵاونەکراوەی کە بەناوی (موفتی) یەوەیە، لە گەڵ ڕوونکردنەوەیەکیش لە سەر هەڵبەستێکی تری بڵاوکراوەی (موفتی) پێشکەش بە هەمووان بە گشتی و، پێشکەش بە بەرێز مامۆستامان (خاڵ)ی بەتایبەتی ئەکەم، بۆیەرێگەم بە خۆمدا کە ئەم سەرەناوەی سەرەوەم بەم نووسینەم ڕەوا ببینم، تاکوو ببێتە کەرەستەیەکی نوێی بۆ چاپی دووەمی (خاڵ)و، وەك : دانەرۆکە یەکیش بێ بۆ ئەوانەی شتێکی دیکە لەبارەی : (موفتی) یەوە ئەزانن، بە دوای ئەم لێکوڵینەوەیەمدا بڵاوی بکەنەوە.

بە داخەوە هەڵبەستەکانی (موفتی) زۆر دانسقە دەس ئەکەون، ئەوەتا؛ بەو هەموو کردوکۆشیە بەجەختەی (مامۆستاخاڵ) ەوە هێشتا جگە لە هەڵبەستە کەمەکانی بە زوبانی عارەبی و فارسی و تورکی، تەنیا لە یەك چواربالّی و دووتاك و نیوتاکێك و چواریەکە تاکێکی (موفتی)، هەڵبەستی تری ئەوی بە دەست نەهێناوە، کە ئەوا ئەم لێکۆڵینەوەیەشی ئەچێتە پاڵ کە ئەمیش درێژترین نوسراوێکە لە دوای ئەوەکەی (خاڵ) ەوە چونکە (موفتی) ئەوەندە خووی نەداوەتە هەڵبەست دانان، هەروەك لە لاپەرە (50) ی (خاڵ) دا نوسراوە : -

[شاعیری بەناوبانگ (مەعرووف ڕەصافی ی کورد وتوویەتی : ئەوەندەی «من»و «جەمیل صیدقی زەهاوی» بە شیعرەوە خەریکین، ئەگەر «موفتی» زەهاوی» نیو ئەوەندە بە شیعرەوە خەریك ببوایە، گەلێ گەلێ لە ئێمە شاعیر ترو شیعری زۆر تر ئەبوو. ].

منیش بە پێی لێکۆڵینەوەم لە سەر (موفتی)و هەڵبەستەکانی ئەوا ئەم ڕستەیەی دوایی ئەخەمە سەر ئەو فەرمودەیە و ئەڵێم : -

وەك لە هەڵبەستەکانی (موفتی) یەوە دەرئەکەون کە زوربەیانی کوتر پری و لە بۆتەیەکی تایبەتیدا و بە بێ خۆ بۆ ئامادە کردن واتە؛ بە دەمی و (ئیرتیجالی) دەری بریون و ئەوەش بوتە هۆی زۆر بڵاو بوونەوەی هەڵبەستەکانی و گەلێ جاریش نەگونجاوە بنوسرێنەوە لەوکۆڕانەدا و لە ناو چوون چونکە بە زۆری دانەنیشتوە بۆ هەڵبەست دانان تاکوو نوسخەیەکی لە لای خۆیشی مابێت، بۆیە؛ دەسکەوتنی هەڵبەستی ئەو کارێکی هەروا ئاسان نیە و ئەوەتا ئەو هەڵبەستانەی کە بە نووسین بۆ خەڵکی ناردوون زوربەیان لە (خاڵ) دا، گرد کراونەتەوە.

لەباری زانستی (موفتی) شەوە لەلاپەرە (104)ی (خاڵ) دانوسراوەکەلە سوکواری (مەرثیە)ی (موفتی دا (سەیید ئەحمەدی راویی واعیظ) ووتوویەتی : [ڕۆشنبیرانی و خوێندەوارانی عیراق لە دوای (موفتی) ؛ یا: قوتابی خودی (موفتی)، یا: قوتابیی قوتابیی ئەون].

وەلەبارەی بەرزێتی پایەو کەسەتی (شەخصییەت)و بلیمەتی و پسپۆری (موفتی) یەوە، والیی عوثمانی لەبەغدا (سولەیمان نەظیف) وەك لەلاپەرە (25)ی (خاڵ) داهاتوە ووتوویەتی : [هەمووخاکی دەوڵەتی عوثمانی و تەواوی قەڵەمڕەوی؛ شانازی ئەکابە (موفتی زەهاوی) یەوە].

هەروەکوو (موفتی) باوکی ڕۆڵەیەکی وەك هونەرو فەیلەسووفی گەورەمان (جەمیل صیدقی زەهاوی)ش بوە و (موفتی) هاونشینی پاشا و گەورە پیاوان بوە و ئەمانەش بەرچا و مەزنیەکەی لەوەدابوە کە هەمیشە شوێن هاناو ڕوو تێکردن گەی لێقەوماوان بوە، کە هەڵئەگرێ هەمیشە و بە جۆرەها پەل هاویشن، لە کۆشش دابین بۆ هەرچی زووتر و زۆر تر لە سەر ئەو گرد بکەینەوە و بگرە تا ڕادەی دوکتورا لە سەر هەریەك لە ڕووەکانی ژیانی ولێ هاتوویە کانی و لە سەر هەر ڕێرەوێکی و. . هتد ی بنوسرێ، کە بە داخەوە لە سەر هی وا دوکتورا وەرگیراوە کە بەقوتابیی قوتابیی (موفتی)ش نابێ و موفتیش هیچ و بە پێویستیشی ئەزانم کە هەمیشە بیرەوەریی بکرێتەوە.

بۆیە بە جوونەوەی نازانم وبەشکوو بەلامەوە لە هەرە پێویستیانە کە ئەم چەند دێرەی ناو ئەم لێکوڵینەوەیەم خستوتە پاڵ ئەم دوو سێ باسەی کە لەملاو ئەولا

کۆمکـردوونـەتـەوە، بەهیـوای ئەوەی شتێکیان لە سەر ئەم نەمرەمان لێ بێتە دبی .

جگـە لەمەی لەم لێکۆڵینەوەیەمەمدا پێشکەشم کردوە، زۆر چاك لە یادمـە کە؛ لە ساڵی 1981ز دا لە (قـاهیـرە) بووم، لە دانیشتنێکمدا لەگەڵ بەرێزو نیشتمان پەروەرمان مامـۆستـا (عـومەرویجدی) لە ماڵی خۆیان، کە لە دەمی ئەوەوە دوو چواربـاڵی و تاکەهەڵبەستێکی دیکەی (موفتی) بە زوبــانی کوردی وەتــاکێــك و چواربـاڵیـەکی تریم بەزوبانی عارەبی و یەك تاکی فارسی یم لەوەوە وەرگرتوە کە هێشتـا چاپ نەکـراون. کە ئەوسـایـە مامۆستا (ویجدی) لەگــەڵ پیـریشی دا مامـۆستـای (فیقهی ئیسـلامی) بو لە دانشگـای (ئـەزهەر) دا چونکە لە میصر دا کەسێکی ئەوتۆ نەبو کەجێگەی ئەوزانا کوردەمان بگرێتەو کە، بەداخەوە لە کاتی ئەم نووسینـەمـدا ئەو هەڵبـەستـانەی لەمەر مامۆستا (ویجـدی) م لەشــرو شاتـاڵی پەراویخـانـەکـەمـدا بۆ نەدۆزرانــەوە، کە دڵنیــاشم ماون. هەرکـاتێ بەردەستم کەوتن ئەوانیش بلاو ئەکــەمــەوە و خوا بکـات بەرچـاپی دووەمی (خاڵ) بکەوێ.

جارێ ئەمە دەقی نووسینەکەی: (أ. ژابا) یە لەبارەی (موفتی) یەوە کە جگە لەوەی لە دواترا لێ ی ئەکۆڵمەوە هی دیکەش هەڵئەگرێت: ـ

## [حکایەتا بیست و حشتێ (2)]

[نـەقـل دکـەن کو د ئەییـامێ خەلافـەفـەتـا (سـوڵتان ئەحمـەد) (3) دانێ ژ قەصـەبـا خۆشنـاڤێ، (4) (مـەلا محـــەممـەد) (5) ناڤ، مرۆڤـەکی زێـدە زەکی و ئەهلی عیلم و کەمـال پەیـدا بویی، کول وان کەنـاران شوهرەت دیتی، ئیجــارێ (6) ژ خۆشنـــاڤێ هاتیـە باژێـرێ (7) سلەیـمـانــی، و ل ویــی دەرێ ژ ی مدەیــەکــی مدەریسی کری، ساکن بویی، لاکین فەقیرولحال (8)، مالێ دونیـایێ تونینە (9)، ئیجاری ئەهلی سلەیمانی یە، دایم د گۆتنــە (مـەر محـەممـەد)ی: کو ڤنجـە (10) توو بچـەیی (11) ئستـانبـوولێ (12)، توو هنـدە فاضیـل و عالیم و کامیلی، ئەلبـەتتە دێ خونکار (13) وەطیفەیێ کە وەیــاخـو گونـدەکی ل تە (14) ئیحســان بکـەتن، ژ ڤی ژارییێ خەلاص دبی.

ئیجـارێ (مـەلا محەممەد) ژ ی تدارەکا خۆ، هەرچیە (15) دیتی یە، چوویە ئستانبوولێ (16)، دما کوداخلی ئستــانبــوولێ بوویی، چوویــە مەدرەسـەیێکی، لاکین سەروو گوهـ (17) پەریشـان، هەرچـەنـد گۆت: کو ئەز مەلامـەو، ئیبـرازی کەمـال و عەمەل و عیلم کری یە، ژ ی چەنــدان کەســەکی گوهــداری (مـەلا محـەممـەد) ی نەکـرین، هەرچـەنـد رۆژەکـان د نیڤا ئستانبوولێ ساکن بویی، گاە چوویــە نك مودەریســان و، گاە چوویـە نك شێخـولئیسـلامێ (18) ئیفـادەیی حال کری، ئیمتیحان طەلـەب کروو، هێڤیـا وظیفـەیێکی کری، ئەصلا کەس گوهـ نەدایـە، (مـەلا محەممەد)ی عەریضە دا، دیسانی توژ ێ چێ نـەبـوویـە، ناچارمایی، بخۆژ ی جوان (19) بوویـە، چوویـە چەنـد رۆژەکـا پالـەتی (20) کری یەو، چەنـد قرۆش (21) دراڤی پەیـدا کری، بریـە دایە (22) دەستـەکی لیبـاسی رەشی ئیـرسان (23) ژ سەری حەتتا پیان (24) چێ کرین، و ئینایە رۆژکی صوبەیی (25)، ئەو دەستی لیبـاسێـد (26) ئیـرسـان بەرکری یە (27)، و عەصـایـەك (28) گرتیە دەستی خۆ، راست هاتیە دهرێ شێخـولئیسـلامێ، و گۆتیـەمـرۆڤیـد ویی کو: شوولا من (29) د گەل شیخــولئیسـلامی هەیـە، لازمـە کوبچمـە حوضـــووری، عەمـــەلان ژ ی دەستـــو دایێ، (مـــەلا محـەممـەد) ڤیـافـەتـا ئیـرسان دا راست دچتە حوضوورا شێخولئسلامی، و سەر هەنگڤتە (30).

شیخولئیسلام دبێژە: کو ئیریس وەرە روینێ (31)!

(مـەلا محـــەمـمــەد)؛ رویـتینتن (32)و، ئیفـــادا شێخـولئیسـلامی دکـەتن کو: ئیشەڤە (33) من د (خەو) دیتـە کودینی ئیسـلامی حەقـە، ئەز هاتمە نك حەضرەتا وە، کو موسیلمان ببم (34).

وەکـو شێخـولئسـلام ئەڤی خەبـەری ژ ئیـرس د بهتن

(35) کەیــف خۆش بویــی شاد بتــن، گۆ(36): سەر چاڤــان هاتی، ئیـرسی ئینـا نیـزوکی (37) وکەلي مەیێ شەهــادەت (38) دبێـژ یتە (مەلا محەممە)، ـ وەکو ویا ژ نۆڤە موسیلمان دکەتن ـ گازی مرۆڤێد خۆ دکەتن: کورۆ! ئەڤی ببــەنــە حەمــامی و، دەستــەکی جلێد مەلانی (39) بکــەنــە بەرڤی مرۆڤی و بـ خۆتەذکــەرە دنـویسـە ژ بۆی خونـدکـاری کو، ژ یومن دەولــەتـا حەضـرەتا وە، ئیرۆکە ئیرسەك بـ خۆ، بـ رەضا، هاتیە و موسیلمان بوویی، من ڤرێ کریــە حەمــامی، لاکین من ناڤ دانــەنـایی یــە، مەوقووفی ئەمرێ جەنابی خونکاریە و، غەیر ژ ویی ژ ی، دیــســانـی شێخــولئیســلامی تەذکــەرە نویسی ژ بۆی صەدرولئــەعظــم (40) و، ریـجــال وکیبــاران، کو؛ ئەحوالەکی وەها قەومیە، مزگین دایە ئێکوو دوو.

خوندکاری؛ قەوی حەظ کری، ئەمر کر کو: بلانی، ناڤ لێ دانــەینن (41)، حەتتـا کو ئەز ژ ی بـ خۆ بێمـە سلاڤیا ی، ئەوی (42) ببینم و، ناڤەکی موبارەك لەوی دانێم.

خولاصــە؛ (مـەلا محــەممــەد)ی دبــەنــە حەمــامی و لیبـاسێد مەلاتی (43) فاخیر دکەنە بەرو (44)، بـ شەڤ خونـدکــار بـ خۆ تەشریف دبتە مەنزلا شێخولئیسلامی و، (مـەلا محەممەد)ی دبینتن و، پێ ی کەیف خۆش دبتن، پاشی ئیجـاری خینـدکــار (45) ئەمر دکەتن کو؛ ناڤەکی مونــاسیب ل ویی ئیــرسی ـ کو گۆیـا موسیلمــان بویی ـ دانێن، پاشی؛ ئەو مرۆڤ بـ خۆ ئیفادە دکەتن کو: من بـ خۆ قەوی مەیــلا ئیسمی (محــەممــەد) (46) هەیــە، ئیجاری خوندکار ئەمر دکەتن کو؛ بلانی، ناڤی ڤی زاتی (محەممەد ئەفەندی) بنن (47).

خولاصــە؛ ناڤی مەلا (محەممەد ئەفەندی) (48) داتینن و، خونـدکــار و، ئەرکــانی دەولــەت و، ریجــالی کیبــار، قەوی، زێر و هەدییە ئیحسان دکەن و، صوبەیی مەلایێکی تیــنن و تەنبیهـ دکــەن کو: هەر رۆژ ی وەرە ئۆطیــا (49) (محــەممــەد ئەفــەنــدی) و قنج موقەییەد ببە و، ئەوی بدە خوێندن (50)، ئیدی هەر رۆژ ی موعەللیم تێتن و دەرسا (محــەممــەد ئەفەندی) وەکو وزارۆکان (51) ئەلف و با تا ددەتە خوندین (52).

لاکین (محــەممــەد ئەفــەندی)، زانینێ کەفش (53) ناکــەتن هێـدی هێـدی رۆژ بـ رۆژ ی (مـەلا محــەممــەد) وەکوو ئیفلاطوونی (54) بـ ژوورڤە (55) دچتن، د دوو مەهــان (56) دانی، گۆیـا خەتما قورئانی دکەتن، ئیدی موعــەللیم، ئیفــادا شێخــولئیســلامی، دکــەتن، ئەڤ (محەممەد ئەفەندی): (فەیضی) بێ (57).

خولاصــە، وەهــا هێــدی هێـدی بتــەدریــج (مـەلا محــەممـەد)، دنیڤــا دوو سێ سالانــدا، لنك وان دبتــە مەلایـی مازن (58) قەوی عیـلم دانـی، فایـق دبــتـن، مەعەهازا (مع هذا) ژ بەریدا هندە سالان ئەوی مەلاتی و تەحصیـل کریـیە، ئیجـاری دیسـانی شێخـلائیسـلام ضیـافەتەکی عومومی دکەتن و، فەرمان ددەنە (محەممەد ئەفــەنـدی) فەیضی)، کو: بلێ مودەریســە (59). هەر کەس دویی مەجلیسـدا؛ ژ خونـدکاری بگرە حەتا پاشا و ریجـالی (60) کیبـاران: زێر بێ حسێب ئیحسان ژ بۆی (محــەمــەد ئەفــەندی) ڤرێکرین، میقداری سێ صەد، چارصەد کەس دراڤ پێڤکتی (61)، و هەدییە و بەهییە بێ قیـاس دانیـە (محــەمــە ئەفــەندی) و زاف (62) تەکلیف دکــریــن کو، ئەم تە بـ (زەوج) (63) ینــیـن، لاکــیـن (محەممەد ئەفەندی) ژ ین (64) و زارۆك لسلەیمانی بێ هەبوون (65) ئاشکار نەدکر.

رۆژەکی (محــەمــەد ئەفــەنـدی) چوویــە حوضـوورا خونـدکـاری، پاشی دوعاو ئەنایێ (66) ئیفادە کر، ئەڤ داعی بئەصل ژ سلەیمانی بێ مەو (76)، ل وان کەناران عیلم قەوی کێمــە، ژ سایا (68) وە، من عیلم تەحصیل کریــە، ئەز نیـاز دکــەم کوچــەنـد کرێـد گونـدان (69) لبــەنــدەیی (70) ئیحســان و بەرات بکــەی، دا ئەزبەنی (71) بچمــە وولاتێ سلەیمـــانی و لوێ دەرێ دەرســان بێژم و، نەشرا علولومان بکەم.

رجا (محەممەد ئەفەندی) بێ قوبول دکەتن.

سێ هـ کەر گوندێد (73) جەسیمە ل سەر (محەممەد

ئەفەندی) (وەقف) دکەتن و، فەرمان و بەراتان د دەنێ و بـ تکرار خوندکار و، شێخولئیسلام و، ئەفەندی و، ئەرکانی دەولــەت، هەرکــەسێــك میقـدارەکی ئیحســان ژ بۆی (محەممەد ئەفەندی) ڤرێدکەتن و، بـ دراڤ ومالکی زاڤ (محـەممەد ئەفەندی) موعەززەز و، موکەررەم، د گەل بار و بارخانە و، فەرمان و بەراتان، ژ ئستانبوولێ ڤرێدکەن و، ئەمــرنـامیـان ژی د دەنێ و، نووسین؛ کو: (محـەممـەد ئەفـەنـدی) بوان کەنـارانـدا (74) هاتیـە، هەرکـەسـەك عیززەت و ئیکرامی بکەن.

خولاصـەی‌کەلام؛ (مەلا محەممەد) پێنج سالێد ویی (75) تەمـام دبتن، ئەوژی تێتن بدەزگـاەو، ئەسبـاب و، تەجەمـول، تێتـە باژێـرێ سلەیمـانی و، ئەهـالی دچنە بەراییکی و بـ ئیکرام تێتن ل مالا خۆ ساکن دبتن و گوندان خەبط دکەتن (76) و، مودەریسی دکەتن (77).

لاکین چەنـد دۆستێـد ویی هەبوون ژ قەدیم دا، کود کەوتنــە هدی (78) ئستــانبــولی، تومزین (79) دبی و گوندان دستینی. ئیجاری ئەو (مەلا محەممەد)، بـ خەف (80) دبێـژ یتـە دۆستێد خۆ: بەلێ وەڵلا ئەز چویمە (81) ئستانبوولێ وپێنج سالا مایم و هندە ئەسباب من ئینانەو، گونـد بەرات کرینـە، لاکین حەتتـا ئەز نەبوومە ئیرس وژ نۆڤـە موسیلمـان نەبـووم، ئەڤ نە ژ بـۆی‌را مویـەسنسـەر نەبـوون، وەڵـلا ئستـانبول جهەکی قەوی قنجە، لاکین حەتتـا مرۆڤی ژ نۆڤـە موسیلمـان نەکـەن، رەغبەتا مرۆڤی ناکەن، و طشتەکی (82) نادنە مرۆڤا.

ئیــدی پاشی ویی شوولی ناڤێ (مــەلا محـەممـەد) مایی، کودگـۆتن: (مـلا محـەممـەد ئیـرسیـان) (83)، وەسانی مەشهوور بوویە، بەلکو حەتتا نهاژی ژ ئەولادێد ویی ل ویی باژێـرێ پەیـدا دبن (84)، وەڵلاهو ئەعلەم بیلصەواب (والله أعلم بالصواب)].

★★★★★

ئەمە دەقی چیرۆکەکە بوو، کە جگە لە خاڵ بەندی تیا کردنی و گونجـانـدنی هەنـدێ وشــەی بۆرێنـووسی ئێستــەمــان، کە لە منــەوەیــە، ئیتــر کوت و مت وەك سەرچـاوەکـەی وەرمگـرتـوەو، ئەمیش پوختـەیـەکی ئەم چیــرۆکــەیە بە شیـوەی (سـۆرانی) یا: زمـانی ئەدەبی یەگ گرتوومان کە لە سەر خواستی هەندێك پێشکەشی ئەکەم.

## (چیرۆکی بیست و هەشتەم)

ئەگێـرنـەوە لە سەرێنی (سوڵتان ئەحمەد) داله ناوچەی خۆشنـاو (مـەلا محەممەد) ناوێکی زاناو تێگەیشتوو بووەو، ناوبــانگی سەنــدوە، چوتــە سلەیمـانی و ماوەیـەك، بە مامـۆستـایی تیـا جێ گیـر بوە، لە هەژاریـەکەی خەلکی هانیــان داوە بچێــتــە ئەستــەمبــووڵ، کە لە پاداشی لێ هـاتـوویی و زانـاییـەکـەیـدا سوڵتـان فرمـانبەریەك، یا گوندێکی پێ ببەخشێ و لە دەسکورتی رِسگاربێ.

ئەویش کە چوەتـە ئەستـەمبووڵ، لە هەرلایەك لێ یان نەپرسیوەتەوەو چی ی بەدەستەوە نەماوە، کەوتۆتە کرێکاری و، لە پاشـەکـەوتی رۆژانـەکـەی، بەرگێکی قەشـەیانەی کریــوەو، سەرلـەبـەیـانیـەك، بەداردەستێکـەوە، چوەتـە بارەگـای شێخـولئیسـلام، وە رایگـەیـانـدوە کە تی گەیوەو بەخەو دیویەتی ئاینی ئیسلام (هەقە) و ئەیەوێ ببێتە ئیسلام.

لەسـەر دەستی شێخـولیسـلامـدا بوتـە ئیسلام، و لە لایــەن خەلیفــەو صەدرولئـەعظـەم و گەورە پیـاوانـەوە باربـوویەکی بە نرخ کراوە مامۆستایەکی بۆراگییراوە کە بە دوومــانــگ لە خوێنــدنی قورئـان بۆتـەوە، خۆی ناوی (محـەممـەد) ی لە دوای ئیسـلام بوونە درۆکەی بۆخۆی هەڵبـژادوەو گەورە پیـاوان پەسـەنـدیان کردوەو خەلیفەش نازنـاوی (ئـەفـەندی) ی پێ بەخشیوەو مامۆستاکەیشی لە زیــرەکی‌دا نازنــاوێکی تری (فـەیضی) داوەتێ چونکـە ئەوەنــدە بەهـرەمـەنـد بوە لە زیـرەکیـداو، ئەمجـا بوەتـە (محـەمەد ئەفەندی فێضی) و لەوێ کراوە بە مۆستاو دوای پێنـج ساڵ لە سەر خواستی خۆی خەلیفە سێ گوندی پێ ئەبـەخشێ و، دیسـانـەوە گەورەکـان باربوویەکی دیکەی

ئەکەنەوەو بە فەرمانی هومایوونیەوە ئەگەڕێتەوە سلەیمانی.

ئەوسایە لە ناو دۆستانیا، هەر کە باسی خۆشی و بەڵکی ئەستەمبوول و کارگوزارەکانی کرابێ (محەممەد ئەفەندی فەیضی) ئەیوت: ڕاستە وایە، بەڵام هەتا پیاو سەرلەنوێی وە نەبێتەوە ئیسلام، ناکەوێتە دڵی گەورەپیاوانی ئەستەمبوولەوە.

ئەمە بوو دەقی چیرۆکەکەی لەمەر (أ. ژابا)، لە بارەی (موفتی زەهاوی) یەوە و پوختەکەی کەئەم چیرۆکەم لەبەر نوسخەیەکی ئۆفسێتی دەسنووسی خواڵێخۆشبوو رۆشنبیری تێکۆشەرمان (مامۆستا صادق بەهائەدین ئامێدی) کوت ومت وەرگوتووەو ئەویش لە کاتی خۆیدا (ساڵی 1978ز لە شاری (ئۆپسالا) ی وولاتی (سوێد) لە بەر نوسخەی پەراویخانەی ئەوێ نووسیویەتەوە، کە بوەتە هۆی ئەوەی ئەم کەڵەپووورە بەنرخە بگاتە دەست رۆشنبیران کە من لەبەر ئۆفسێتی ئەو دەسنووسە بەسوپاسەوە لە پەراویخانەی (مامۆستا موصلیح مصطفا جەلالی) یەوە ئەم چیرۆکەم لەژێر ناوی (حکایەتا بیست و خشتێ)دا وەرگرت.

ئەوەش ڕادەگەیەنم کە لە مەلاچاك و ناوبانگەکانماندا بەر لەوەی (ژابا) ئەم چیرۆکەی دەست بکەوێ کەسێکی دیکەی ئاوەها ناودارو زانامان بەناوی (مەلا محەممەد ئەفەندی فەیضی) یەوە نەبوە جگە لە؛ (موفتی) زەهاوی.

سەرەرای ئەوەش، هەمو سروشت و ڕواڵەتی (موفتی)؛ بە پێی (خاڵ) و لێکۆڵینەوەی خۆم، لەم چیرۆکەی (ژابا) دا هاتوە وەك: (مەلا چاکی، زیرەکی، زانایی، بەڕێزی، بەناوبانگی، مامۆستایەتی دەسکورتی، خورتی، ووردی، تێزکاری (سوخریە)، یاخی گەری، نامۆیی، و بوونی لەسلەیمانی داو ناسینی سروشت و دەماری کاربەدەستانی عوسمانی، چاوقایمی ی وێوەیی، تێنەکەوتن، کاری بە ڕێی و شوێن کردن، خاوەن گوندێنی لە ناوچەی دیالە و... هتد)، کە هەمو ئەمانە ئەم چیرۆکە ئەبەستن بەخودی (موفتی زەهاوی) یەوە، بەبێ ئەوەی گومانێك لەمەدابێ و، کاری لەمە سەیرتریش لە فەرمانرەوا چەتەگەریەکەی عوثمانی قەومەوە، کە لە نەزانی و زۆرداریەوە، بۆ کەسێکی ساغی وەك (موفتی)، ئەگەر ئاوا نەیان گەیشتبێتێ مافی رەوا وەرنەگیراوە.

دوای ئەمە ئەوا نۆرەی پێشکەش کردنی ئەو پارچە هەڵبەستەی (موفتی) یە کە لەپێشەوە بەڵێنی بڵاو کردنەوەیم دا، کە ئەویشم لە کەشکۆڵێکی دەسنووسی (محەممەد سیاە) ناوێکەوە وەرگرتوە کە لە سەرەتای ئەم چەرخەدا نووسیویەتەوە، هەروەها ئە وهەڵبەستە لە کەشکۆڵێکی کۆنی پەڕپووتی دیکەمدایە، کەنووسەرو کات وشوێنی نووسینی پێوەنەماوە، حگەلەکەشکۆڵێکی کۆنی تریش، ئیستە هی بەڕێز مامۆستا (محەممەد عەلی قەرەداغی) یە، و لەهەرسێ کەشکۆڵەکەدا بەناوی (موفتی زەهاوی) یەوە نووسراوە و ئەمەش هەڵبەستەکەیە کە هێشتە چاپ نەکراوە: -

## (هەڵبە موفتی زەهاوی)

عەزیزێ پێ ی گوتم: ئەی فیکری بیکرن!
موحەللایە، بەنەحقیق و ئیشارەت
ئەمەی وا پێ ی دەڵێن: مەشرووطە، عالەم؛
لەعورفابێ، لەچی ئایا عیبارەت؟؟
جەوابم دایەوە؛ مەشرووطە مەعنای:
قوتولی عالەمەو، تالان و، غارەت..

★★★★

ئەم پارچە هەڵبەستەش کە چل ساڵ پترە دەستم کەوتوە گەلێ جار تێ ی ڕاماوم، پرکێشی بڵاو کردنەوەیم نەکردوە، چونکە؛ لەلایەکەوە، لە ناوەرۆکی هەڵبەستەکە وورد ئەبوومەوە کەوا، لەبارەی خراپی پەیرەوی کردنی مەشرووطەوەیەو، مەشرووطەش ئەو دەستوورە یەکەمینەی عوثمانی بوو، کە وەك شۆرشێکی یاسایی، لەلایەن لیژنەیەکی بیست کەسیەوە، لە ئازادی خوازانی

عوثـمـانـی، بەرپـاكـرا، لەسـاڵی (1876ز) دا و بەسـەرۆكـایـەتی (صەدری ئەعظەم مەدحەت پاشا)، كە یەكێ لە ئەنـدامـەكـانی ئەولیـژنەیە: (محەممەد ئەمین) زەنـدی)ی كورد بوو، ئەوی كە (مـوفـتی زەهـاوی) لە جێگەی كرا بە موفتی.

بەڵام ئەو دەستووره گرنگ و بەكەڵكە نەخرایەكارو هەر بە ناو مایەوەو فەرمـانـرەواییش هەتـا ئەهـات خرابتر ئەبوو لەگـەڵ گەلـەكانی ژێردەستەیدا تاكوو لە ساڵی (1908ز) دا لە لایـەن كۆمـەڵی یەكێتی و سەركەوتن (جمعیة الاتحاد والترقی) یەوە، پەیرەوی كراو بە مەشرووطەیان ناوبردو لە ئاكامدا ئەویش كەڵكی بۆ گەلان نەبوو.

عەجـەمیش لە ساڵی (1906ز) دا شتێكی وای هەیـە ئەویش ئەنجامی بێسوودی بوو.

لەلایـەكی تریشـەوە بیـرم لە ساڵی مردنی (مـوفتی) ئەكردەوە، كەوەك لە لاپەرە (7) ی (خاڵ) دا هەڵبەستێكی سوكـواری (مـەرثیـە) ی عیـرفـان ئەفـەنـدی تیـایـە كە بۆ (مـوفتی) ی ووتـوەو، ووتـەی: (غاب نجم المعالم) لەو هەڵبـەستەی عیرفان ئەفەندی دا، بەپێی نەریتی ژمارەی ئەبجـەدی؛ ئەكـاتـە (1308) كە ئەمەیش ژمارەی ساڵی كۆچی ی تیـا مردنـەكـەی (مـوفتی) یەو بەرامبـەرە لە (1890ز) و بەم پێیـە (موفتی) چوارده ساڵ دوای دانانی دەستووری (1876ز) مردوە.

جا ئەگـەر لە ووشەی (مەشرووطە) ی ناو هەڵبەستەكە مەبـەس لەم دەستوورەی ساڵی (1867ز) بێ كە بناغەی (مـەشـرووط) بوە ئەوا لەگـەڵ تەمـەنـی (مـوفتی) دا ئەگونجێ و ئەوسایە لە ژ یاندا بووە رەخنەو داشۆرینەكەشی دژ ی ئەو دەستـوورەش لەبـەر ئەوە بوە كەئـەو دەستـووره یاسای شارستانی (قانۆن مدنی) بوە نەك یاسای ئایینی ی (شەرع و دین) و ئەوەش بەپێی پایەی هەرە بەرزی ئایینی كە (مـوفتی) بوویـەتی ئەوا دژ وەستانی (موفتی زەهاوی) لەم هەڵبـەستـەیـدا لەجێی خۆیـایـەتی، بەڵام ئایـا بەو دەستـوورەی (1976ز) ش ووتـراوە: (مـەشـروطـە)؟ تا بتوانرێ هەڵبەستەكە بەهی (موفتی) دانرێ؟؟

لەلایـەكی تریشـەوە ناوەرۆك و مۆركی هەڵبـەستەكە؛ شێوەو بیری ئازادی خوازانەی رەپ و راست و سەربەستیە ئایینیـەكـەی (موفتی)ی پێوەیە ئەمەش پشتیوانی ئەوەیە كە (موفتی) خاوەنی هەڵبەستەكەیە.

بەپـاڵ ئەمـانـەشـەوە بەڵگـەیـەك لە هەڵبـەستـەكـە لە (مـەشـرووط) ی ساڵی (1908ز) بێت، كە (مـوفتی) بە (18) ساڵ بەر لەم مەشـرووطـەیـە مردوە، ئەوا ناشێ كە هەڵبــەستـەكـە هی (مـوفتی) بێ و بەرلـەم مەشـرووط یە بەوەندە ساڵە ووتبێتی.

وەنەبێ هۆی دوودڵیم لە خاوەنی ئەم هەڵبەستە كە هی (مـوفـتـی) یە یان نەء، هەر ئەوەنـدەبێ، بەشكـوولە كەشكـۆڵێكی دەسنـووسی ترا كە ئەویش ناوی نووسـەرو كات و شوێـنـی نووسینـەوەی پێـوە نیـەولە هی ساڵـە بیستـەكـانی ئەم چەرخـە ئەكات، كە لەودا بەپێچەوانەی سێ كەشكـۆڵـەكـەی ترەوە، كە هەڵبـەستـەكـەیان بەهی (مــوفتی زەهـاوی) دانـاوە، لەم كەشكـۆڵـەی چوارەمـدا هەڵبـەستەكەی بە ناوی تەنیا (زەهاوی) یەوە نووسیوە، كە ئەشـزانـرێ (مـوفتی) و (جەمیل صیدقی) ی كوریشی بە (زەهـاوی) بەنـاوبـانگن، هەرچـەنـد (مـوفتی) نازناوی (فـەیضی)و (جـەمیـل صیدقی) نازنـاوی (صیـدقی) و (زەهــاوی) یە كە (27) ساڵ دوای مەشــرووطــەی (1808ز) واتـە لە (1935ز) دامـردوە، كە ئەم تەمـەنەی لەگــەڵ هەرەتی هەڵبــەست دانــانیـدا رێـك ئەكـەوێ و هەڵبـەستیشی بە (كـوردی) وەبـتوەو چێژگەی زمانی و بیرو شێوەی ئەویش لە هەڵبەستەكەدا هەیە.

هەر لەبــەر ئەم هۆئاڵــوزانـەیـە كە چل ساڵێكـە خۆم بۆهەڵبەستەكە لە بووسە داوە و گینگڵی پێوە ئەخۆم و بەدڵی خۆم بۆم یەكـلا نەكـراوەتــەوە، بەڵام ئەم هەڵــەی ئەم لێكـۆڵینـەوەیەمی بۆ رێكەوت و ئاوا بەرێـم خست و جارێ ئەگــەر هی باوك یاكــور بێ كە هەردوو كوردن بۆیــە پێسكـەشی ئەكـەم بەگیانی ناجی مەعروف، كە هیوابارم سەری ئەم گرێیـە لەلایـەكی دیكەدە لەگەڵ هەڵبەست و ئاگەداریی ترا لەسەر (موفتی) سەر هەڵبداو ساغ بكرێتەوە

چونکـە جێگـەی شانارییە کە ووریا بوونەوەیەکی لەدووی کەلەپوور گەڕان و بایەخ پێدانی لە برەودایە.

دوای ئەمـانە ئەوا (بۆنە)ی ئەو تاکە هەڵبەستە فارسیەی (مـوفتی) کە لەپێشـەوە بەڵێنم دابـوو کە تەنیـا تاکـە هەڵبـەستـەکـە لە لاپـەڕە (66) ی (خـاڵ) دا لە ژێـر سەرەنـاوی (شیعـری سکالاْ و پەند) دا نوسراوەو لە لاپەڕە (127) یشـدا لە بەشی هەڵبـەستـە فارسیەکاندا بەبێ لێ دوانـــە کە من ئەوا بۆنـەکـەی پێشکـەش ئەکـەم، وەك لە پەراوێـزێکی فارسی درێـژی کەشکۆڵـە ناوبـراوەکـەی (محـەممـەد سیـاە) دایە، ئەم ڕوونکردنەوەیەی دواییم لە مەڕ بۆنـەی ئەو تاکـەوەیـە کە پوختەی پەراوێزەکە بەکوردی ئەمەیە: -

[لـە کاتێکـا دەستەیەك لە موجتەهیدە کانی ئێرانی دێنە بەغـدا بۆ گوفتـوگۆی زانستی ئایینی لە سەر ڕاستی ڕێگەی خۆیان، لەگەڵ (موفتی)دا، لە بارەگای والی بەغدادا، بە ئامـادە بوونی پیـاوە گەورەو زانـاو هۆنـەرانی ئەوسـا، لە ئاکـامـدا (مـوفتی) بۆڕیـان ئەداو ڕێگـەی ئیجتیهـاد کردنـەکـەیـان بەهـەڵـە دیـاری ئەکـات و کوتوپڕ ئەم تاکە هەڵبـەستـە فارسیـەی دوایی بۆدێت] و ڕوو ئەکـاتـە موجتـەهیدە بۆڕ دراوەکان، وەك تۆزێ لە دڵشکاویەکەیان لابەرێ و کەمێ دڵنەواییان بکات ئەڵێ: -

«حـەیفـا، کی دین ئەحمەد مورسەل، بەباد داد؛ دەر سوننیان تەشەییخو، دەر شیعە ئیجتیهاد».

واتـە (موخابنێ کە ئایینی (ئەحمەد) ی پێغەمبەری دابەبا، ئەوە شێخی گەرییە لە سوننیەکانداو لە شیعەدا ئیجتیهادە).

ئەمـەش ئەو تاکـە هەڵبـەستـە بوو، کە لە پەیکـاری ڕوونکـردنەوەی بۆنەکەیدام، هەرچەندە نیوباڵی یەکەمی ئەم تاکە جیاوازیی هەیە کە لە کەشکۆڵەکەدا: (ئەحمەدی مورسەل) و لە (خاڵ) دا (پاك نەبی را) یە ئەمجا پەراوێزە فارسیـەکـە لەسـەری ئەڕوات و نووسیـویـە: [یـەکێ لە دانیشتـوانی ئەوکـوڕی بۆڕ خواردنی (مـوجتـەهیـدان)ە، هۆنەری کورد (نەظیری دەدەی کەرکوکی) بوە، ئەویش کوتـووپـڕو دوابەدوای تاکە هەڵبەستە فارسیەکەی (موفتی) ئەم تاکـە هەڵبـەستـە فارسیەی دوایی خۆی لەسەر هەمان کێش و پاشبـەنـد ووتـوە کە ئەم جۆرەش نەریتێکی باوی وێژەی کلاسیکی بوە کە ووتوویەتی: -

«ئـان کەس، کی، توخم تەفرەقەرا؛ دەرمیان نیهاد: هەم چون (یـەزیـد)؛ لوقمەیی: (هەل مین مەزید باد).

واتـە: (ئـەوکـەسـەی کە تۆویی دووبەرکیو ناکۆکیی لە نێـوانـدا دانـا «چاند» با ئەوکەسە هەروەك یەزیدی کوڕی مەعاویە ببێتە لوقمە «پاروو»ی دۆزەخ «هەل مین مەزید»).

کە ئەم تاکـەی (نەظیری) گەلێ گەلێ لەوی (موفتی) وەستـایـانـە ترەولەوپـەڕی ووردەکـاریو جوانی وێـژەیی دایـە، وەك ئەوەکـەی (مـوفتی) ساکـارو سادە نیـە چونکە (مـوفتی) زانـا تربـوە لەوەی کە شاعیر تربێ، بەشکوو ئەم (جینـاس ئارایی) یەی (نـەظیری) لە (یەزید) و (مەزید) دا بەکـاری هێنـاوە کە (مـوجتـەهیـد) ەکـان و هەمـوو ئیسلامیش ئەو کارەی (یەزید) نەفرین و ئافەرۆز ئەکەن کە بە فرمـانی ئەو (حـەزرەتی حوسـەین شەهید کرا) و لێرەدا (نـەظیری) پشت گیری بیری هەڵبەستەکەی (موفتی) ی کردوە مەبـەس لەم وتـەی: (هەل مین مەزید) ە (دیاردە) ی ئایەتی 30 هەمینە لە سوورەتی (قاف = ق) ی قورئاندا کە خوای مەزن تیایا فەرموویەتی: -

(يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلْ إمْتَلأْتِ وتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدْ).

واتـە: ئەو ڕۆژەی کە بە دۆزەخ ئەڵـێین ئایـا پڕبووی لە گونـاهبـاران، و ئەویش ئەڵێ: ئایـا گوناهکاری تر نیە کە فریان بدەنە ناوەمەوە؟ و . . . هتد.

ئەمـەش ئەو ڕوونکـردنـەوەیـە بوو کە بەڵێنم دا، پێشکـەشی بکەم و بێگومان هەر هەڵبەستەی بۆنەی خۆی هەیـە کە دەروون و هەسـتـی هۆنـەر دێـنـێـتـە جۆش وهـەڵچـوون و بەو جۆرەی هەڵبـەستـەکـەی دەری ئەبـڕێ، کە بەداخـەوە لە ویکـەوتنی (بـۆنە)ی هەڵبەستە کۆنە کانماندا هێشتا زۆر لە دواوەین چونکە زۆربەیان نەنوسراونەتەوە.

ئیتر، تا یەك گرتنەوەیەکی دیکە لەسەر (موفتی)، ئەسپەردەی خوابن و ئەمیش لێکۆڵینەوەمە لەسەر ئەم باسەو بەتایبەتی لەسەر نووسینەکەی (أ. ژابا) کە بەم پەراوێزانەی دوایی پێشکەشی ئەکەم: ـ

## «پەراوێزەکان»

1) (ئەلەکسەندەر ژابا) لە ساڵانی دەوردوبەری (1959) دا شابەندەری رووس بوە لە (ئەرضروم) ی تورکیای ئێستەو عوثمانی کۆن و ئەمیش وەك هەریەکێ لە پیاوە رامیاریەکانی وێنەی (مینۆرسکی، لێرخ، ریچ، بێل، سۆن، وئیدن... و.. هتد) کەهەموو بە سەرزاری بەناوی گەشتوگوزار، یا بەدووی: مێژو، زوبان، وێژەو فۆلکلۆر گردکردنەوەوە؛ کاروباری نهێنیو جاسووسیگەریو پاڵانەچێتیە چەپەلەکەی خۆیان و هەڵبژاردنی دۆستە خراپکارەکارەکانیان لە ناو جەرگەی رەشەگەلدا بەئەنجام گەیاندوە کە ئەودەردەیان هێشتە بە نیشتمان وگەلەکەمانەوە دیاریە و پیس ترین نەفرین هەڵئەگرن..

هەرچەندە ئەو کەلەپوور گردکردنەوەشیان بوەتە هۆی پارازتنی ئەم سەرمایە نەتەوایەتیە گرنگ و لەنرخ نەهاتووەمان کە شایانی رێزن لەم لایەنەوە.

ئەوەتا (أ. ژابا) لە: پەراویی (جامع یێ ریساليان و حکایتان بـ زمانی کورمانجی) دایا: ـ

A. Jaba, Recueil de motices et recits Kourdes - Petersboug 1860.

کە برینییە لە ناونیشانی چەند خێلاتیەکمان و کۆمەڵێ ووشەو ناوی؛ کچ و کوری کوردیو چەردەیەك لە دەستووری زمان و دەقی هەندی لە چیروکی فۆلکلۆریو وێژەییو مێژوییو کۆمەلایەتیو.. هتدمان بەشێوەی بادینی، یا: (کرمانجی) ژووروو)و لە کاتی خوێدا ئەوانەی ناردوون بۆ (پۆرتگراد). ئەبێ ئەوەش دیاری بکەم، کە لە مەیانی هەڵسەنگاندنی ئەو پەراویە بەنرخەی (ژابا)دا، جێ جێ کاڵی و سادەیی و هەڵە، لە ناورۆکەکەیدا هەیە.

لەم لێکۆڵینەوەیەمدا کە چیرۆکەکەی لەمەر (موفتی) زەهاوی)م لەو پەراویە وەرگرتوە، لەم پەراوێزانەی دواییمدا هەندێ لەو ناتەواوبانەو روونکردنەوەم لەسەریان دیاری ئەکەم.

2) ـ ئەم چیرۆکە لە سەرچاوەکەی (ژابا) دا (28) هەمین چیرۆکە لە بەشی چیرۆکەکانداو ئەمەش (سەرەناو)ی دەقەکەی ئەوە.

(3) ـ مامۆستا (مەلا محەممەد ئەفەندی ـ فەیضی ـ موفتی زەهاوی) کە لە ساڵی (1208ك) = (1793ز) دا لە سلەیمانی لە دایك بوە ولە ساڵی (1308 ك) = (1890 ز) دا لە بەغدا مردوە، ئەم ماوەی تەمەنەی ئەم، رێکەوتی فەرمانرەوایی (خەلیفەیەتی)ی (سوڵتان ئەحمەد)ی عوثمانی ناکات، وەك لە دەقی چیرۆکەکەدا هاتوە، چونکە لە فەرمانرەوایی عوثمانیدا، سێ (سوڵتان ئەحمەد)ی (یەکەم) و(دووەم) و(سێیەم) هەبوە کەوا خەلیفەیەتیان کردوە کە بەریزە لە نێوان ساڵانی :ـ (1603 ـ 1617 ز) و(1691 ـ 1695 ز) و(1703 ـ 1730 ز) دا فەرمان رەوا بوون، کەوەك دەرئەکەوێ ساڵی فەرمان رەوایی چ کامێك لەمانە رێکەوتی تەمەنی (موفتی) ناکەن و بەرلەون.

کەواتە؛ بەستنەوەی (سوڵتان ئەحمەد) لەم چیرۆکەی پەراوی (أ. ژابا) دا بەژیانی (موفتی) یەوە ناگونجێو، لە نەزانی گێرەرەوەو، نووسەری چیرۆکەکەو، لێ نەکۆڵینەوەی خودی (ژابا) وە بوە، لەکارەکەدا، بەتایبەتی (ژابا) ئەوەندەی مەبەستی نهێنی چەڵی خۆی هەبوە بە پەیوەندی بەستن بەوکەسانەوە کە سادەبوون یا فولکۆریان زانیوەو ئەوانیش یەکسەر ئاگەداری باری کۆمەلایەتیو مێژ وی گەل بوون وئەوان گوڵی دیواخانان وگەرم کردنی کوری بەزم وخۆش رابواردنی رەشەگەل بوون و پەیوەندی

یەکـەوراستیـان یەکسەر بەهەمو چینەکانی گەلەوە هەبوە ، بۆیـە ، کەسـانی وەك : (ژابـا) کە لە سەرەوە خۆیان وەها پیشـانـداوە زۆر شەیـدای ئەو بەرهـەمـە فۆلکـۆریـانەن و لەژێـریشـەوە مەسیان لێ هەلبژاردنی لەبارترین کەس لەو فۆلکۆر زانانە بوە کە چاکترین سەرچاوە بوون کە بیان کەنە دەسکـەلای کارە نهێنیـەکـەی خۆیـان ، ئەگـەر راستیدا مەبـەستیـان خۆخـەریـك کردن بەم کەلـەپووروەوە نەبوە ، بەلام کردویانەتە (دێوجامەیەك)و لەپشتیەوە خەریکی گیان لەبـەربـرینی گەل و داگیـر کردنی نیشتمـان و هەلمژینی بەرهەمیان بوون .

جا بۆیەك خستنی (مـوفتی) و (سـولتان ئەحمەد) وەك لەم شوێنـەی چیـرۆکـەدا بەهەلە هاتوە من لەدواتر روونی ئەکەمەوە ، کە (موفتی) لە کاتی فەرمانرەوایی کام خەلیفە یا سولتان دا ژیاوە . لێرەدا ئەبێ بەسەرئەوەوە نەچم کە لە فۆلکـۆری کوردی و چیـرۆکـەکـانماندا ناوی (ئەحمەد ، سولتان ئەحمەد ، پیر ئەحمەد ، شێخ ئەحمەد و . . . هتد وەك (کـورە کەچـەلـە) یەکجـار زۆر دووبارە بۆتەوە کە ئەم چیرۆکەش یەکێکە لەوانە .

(4) ـ ناوبـردنی (قـەصـەبـەی خۆشناو)یش یەکێکە ، لە هەلـە کانی ناوچیـرۆکەکە چونکە خۆشناو (قەصەبە) واتە (شـارو شاۆکـەو گونـد) نیـە بەشکو راستیەکەی ئەوەیە کە (خـۆشنـاو) لە سەرەتـاوە ناوی بنـەمـالـەی (میـرەکـانی شەقلاوە) یە و لە شوێنی ترەوە هاتوونەتە ئەو ناچەیەو بوونەتە براگـەورەو دەسـەلات داری ئەو ناوچـە فراوانەی ئەکەوێتە نێـوان : (خـوارووی ناوچـەی کۆیـەو خۆراوای رانیـە (بـەردەر)و رۆژەلات وخـوارووی سۆرانـەتی) یەوە . کە لەپـاشتـرا ناو یا نازنـاوی فاملیـای (خـۆشناو) لەشێوەی : (خۆشناوەتی) دا بوەتە ناوی ناوچەکە چونکە ئەوان فەرمان رەوای بوون ، هەروەك بەهەلەیش بە خێلە کوردە جیا جیا کانی ئەم ناوچـەیـەش ئەوتـرێ : (خـۆشنـاو) کەتـەنەت هەنـدێکیـان لە کۆنـەوە دژی یەك بوون . هەروەهـا پایتـەختی ئەم ناوچـەیـە لەمێـژە شارۆکـەی جوانی (شـەقـلاوە)یـە کە لە کاتی بەیتـالیم دا لە سەرەتـای پەنجـاکـانی ئەم چەرخـەدا لەوێ ، ئاگەداریی مێژوویی وفـولکلۆری و کۆمـەلایـەتیـو ویـژەیی زۆرو بەنـرخم لەبـارەیـانـەوە لا گرد بۆتـەوەو ئاوێتـەی پەرپـووتگـەی پەراویخانەکەمن .

ئەمجـا ئەم چیـرۆکـەی (ژابـا) سەرەتێکی ژیـانی (مـوفتی) مان لێ ئاشکـرا ئەکـات کەلـە (خۆشناو)یش و رەنـگـە لە (شـەقـلاوە) ، بەسـەری بردوە کە کۆنـە شارۆکـەیـەکی زانستیمانە . و لە (خال)دا نیشانەیەك لەم بارەیەوە نیە کە پێشکەشە بە (خال) .

بەلام لە (خـال) دا لە لاپـەرە (7 ، 8)یـدا نوسـراوە : موفتی (دایکی) لە (زەهـادیـان) بووەو بە هۆی زویـر بوونی (مەلا ئەحمەد)ی باوکی (موفتی) یەوە لە حاکمی بابان ، چەنـد سالێـك بەخێـزانەوە لە (زەهاو) بوون ، کە ئەمیش ناوچـەیـەکە ئەکەوێتە ناوەند (هۆرین و شێخان و قەسری شریـن)ەوە ، لە کوردستـانی ئێـران ، وە لەو ماوەیـەدا (مـوفتی) لە مالـە خالـوانی بووەو خوێندویەتی و بەو هۆیەوە پێی ووتـراوە (زەهاوی) ، ئەگەنا لە باوکانیەوە ، ئەچێتەوە سەر (فەقێ ئەحمەدی دارشمانە) ، کە ئەمیش باپیرە هەرە گەورەی (بابان)ە کانە .

هەروەهـا لەلاپـەرە (9 ـ 14)ی (خـال) دا لە بارەی خوێندنی (موفتی) یەوە نوسراوە ، کە لە پێشا لای باوکی و دوای ئـەو لەلای (شێـخ مەعـرووفی نۆدبێیی) و پاش ئەو لەلای (شێـخ عبـدولـلای خەرپانی : 1776 ـ 1800ز) وئـەمجا چوەتە (سنە) لای (شێخ سەعیدی تەختی) و لای (شێـخ قەسیم : 1730 ـ 1818ز) خوێنـدوویـەتی و ئیجـازەی خوێنـدنی لە (سـابـلاخ) لە (مەلا محەممەدی ئیبنلرەسـوول : 1767 ـ 1830ز) وەرگـرتـوە ، تەنانەت سالێ مردنی ئەم مامـۆستایەی دوایی ی کە (1830ز) بووە ئیجـازەشی لێ وەرگرتوە ، ئەوسایە تەمەنی (موفتی) (37) سال پتر نەبوە ، بەشکوو بەر لەوە بە شەش سال ئیجازەی تەواوکـردنی خوێنـدن و رێدانی دەرس ووتنەوەی وەرگرتوە کە لە لاپـەرە (16)ی (خـال) دا نوسـراوە : (پاش ئیجازە وەرگرتنی هاتۆتەوە سلەیمانی) .

بەڵام بەپێی ئەم چیـرۆکـەی (ژابـا) ، کەلێنێـك لە ژیـانـی (مـوفـتـی) پڕ ئەبـێتـەوە کە لە دوای ئیجـازە وەرگـرتنـەکـەی وادیـارە لە (خـۆشنـاو) بە مەلایـەتی گیرساوەتەوەو مەلایەکی چاکیش بوە .

بۆیە من ئەتوانم بڵێم لە دوای مەلایەتی خۆشناویەوە ، کە ئەشێ ئەوسایەش باوکی (موفتی) لەگەڵ حاکمی بابان دا ئاشت بوتەوەو ئەمجا (موفتی) گەڕاوەتەوە سلەیمانی بۆ لای باوك و خێزانی ، کە ئەم بۆچوونـەی منیش ، لەتەك چیـرۆکـەکـەی (ژابـا) دا ئەگـونجێ کە لە : (خۆشناوەوە هاتـۆتـە سلەیمـانی)و بەشکـو بەراوەژ ووی نووسینـەکەی (خاڵ) یش نیە وەك لە پاشترا ئەمە ڕوونتر ئەکەمەوە .

(5) ـ موفتی خۆی ناوی (محـەممـەد) بوە ، کە بوەتـە (مـەلا) ، بە (مـەلا محـەممـەد ) ناسـراوە ، وبەهـۆی مانـەوەی سەردەمێکی ناو ماڵـە خاڵـوانی لە (زەهـاو) بە (زەهــاوی) ناویکـردووە کە لە ئەستـەمبـوولێش نازنـاوی (ئەفەندی)و پێناسەی (فەیضی)ی وەرگرت وکاتێ بوویشە (مـوفتی) ئیتـر بوو بە (مـەلا محـەممـەد فەیضی ئەفەندی موفتی زەهـاوی) وە دووبارە کردنەوەی ئەم ئاگەداریانەم لە سەرچاوەکانیەوە بە درێژ دادری نابینم ، چونکە بڕوام وایە هەنـدی لە خوێنـدەوار وگەنجـەکـانـمـان ، لە بەر ئەوەی سەرچـاوەی ئەم ئاگـەداریـانـەیان لەسەر (موفتی) ئەوەندە دەس نەکـەوێ ، بۆیـە بە گرنـگ وپێـویسی ئەزانم کە سەرپـۆتێکی ئەم ئاگـەداریـانـەیـان لەوسەرچـاوەیانەوە بۆ دووبـارە ئەکـەمـەوە بە تایبەتی هەندێ لهم ئاگەداریانەش بەنـدیـوارییـان بە یەکدییەوە هەیە کە لە ناوبردنی ئەمیاندا دەست نیشان کردنی ئەویانم پێ ڕەوایە .

(6) ـ ئیجارێ = ئەمجار ، ئەمجا ، ئەوجا ، ئیجا و . . . .

(7) ـ باژێـر = شار ، هەرچـەنـد لەسۆرانی : (کرمانجی ناوەڕاسـت)دا باژێـر ، مەبـەسـت لە (بـازار)و ئەمیش لەوەوەیە کە لە (شار) دا (بازار) هەیە نەك لە (گوند)دا .

ئەمجـا ناوبـردنی (بـاژیـری سلەیـمـانی) مەبەسی لە چوونـەوەی (مـوفتی) بۆئـەوێ و بوونـە مامۆستاییەکەیەتی لەوێ ، کە لە چیـرۆکـەکـەی (ژابـا) دا هاتـوەو ، ئەبەسترێنەوە بە نووسینەکەی (خاڵ)ە وە ، کە لە پێشـەوە دیاریم کردو کەلێنە نادیاریەکەی ژیانی ئاشکرا ئەبێ و پڕیش ئەبێتەوە

(8) ـ فەقیـرولحـال = هەژار ـ وە ئەم هەژاریتی ودەست کورتیـەی (مـوفتی) بە درێژی لە (خاڵ) دا ڕوونکراوەتەوە پێـویست بە دووبـارە کردنـەوەی نابینم ، نەنـانـەت لەم چیرۆکەی (ژابا) شدایە

(9) ـ تونینە = هیچی نیە . چیی‌نیە ، هەژاربوە . .

(10) ـ قنجە = چاکە ، جوانە ، باشە بافتی ئەوەیە . . .

(11) ـ بچـەیی = بچیت . وە لەدەقی چیـرۆکـەکەدا هەر (بـچـەیـی) هاتـوە ، کە من بەپێی ئاگـەداریـەکم لە شیـوەکانی (بادینی) یا (کرمانجیی سەروو) وای بۆئەچم ئەم چیـرۆکـە بە زارگـوت ، یاشێـوەی زمانیی (گۆییانە) بێت کە لە ناوچەی ئەودەوروبەرەدان ئەم چیرۆکەیان لێوە نووسراوەتەوە

(12) ـ ئستـانبـول = ئەستـەمبـووڵ ، ئەستـەمـول ، ئەستـانـە ، ناوی پایتـەختی عوثمانی بووەوئێستە شارێکی مەزنی تورکیـەیـە و نیـوەی بەر (ئاسیا) ونیوە کەی تری بەر (ئەوروپا) کەوتوە ، وگەرواوی (بۆسفۆر) شارەکەی کردوە بە دوو بەشەوە .

(13) ـ خونـکـار : ئەم ووشـەیـە نازنـاوی خەلیفـەو سوڵتـانـەکـانی فەرمـانـڕەوایی عوثمـانی بوە ـ گوایـە لە (خـوداوەنـدکـار ، یا لە خودادەنگـار)ەوە هاتـوەو بۆیـە (خـونکـار) بەواتـە (خـوێن کار) کە ئەمـەش پڕ بە پڕی سروشتی ئەو خەلیفانەیە کە نەك هەر بەرامبەر بە گەلەکانی ژێـردەستیـان خوێن کار بوون ، بەشکـو هەر لە سەرەتای بوونیانەوە بەخەلیفە ؛ هەرچی براو خوشك ومام وئامۆزاو برازاو خزمی نزیکی خۆیـان بوە بەجـارێ کوشتـویـانن ، نەوەك بەربـەرەکـانی یان بکەن لە کورسیە کەیاندا ، کە بە ناویش خەلیفـەی ئیسـلام بوون ، وبە دەگمـەن بوە ئەم ڕەوشتە خوێن ڕێژ یەیان نەبووبێ .

(14) ـ ل ته = لته = بۆتۆ .
(15) ـ هەرچیــە دیتی یــە = مەبــەس لەوەیــە هەرچی کەبــوویــەتــیو بۆی هەڵــســووڕاوە ، بۆچــوونــە ئەستەمبوولەکەی بردوویەتی .
(16) ـ دما = دەمێ ، کاتێ ، گارێ ، گاڤێ ، گاڤا . . .
(17) ـ سەروگوهـ = سەروگوێلاك .
(18) ـ شێخــو لئیســلام = فرمـان بەرێکی هەرەگــەورەی عوثمــانیو هاوشــان وهــاو پایــەی سەرەك وەزیـران بوە ، چونکــە فەرمــانــرەواییەکەی عوثمانی بەسەرزاری بەناوی ئیسلامەوە فەرمانڕەواییان کردوە ، بۆیە ئەم پایەیەیان داناوە ، لەراستیشدا وەك لەم چیرۆکەی (ژابا) دا دەرئەکەوێ ، هەمو : گەمژەو نەزان و کورسی پارێز بوون لەژێر پەردەی ئایینەوە .
(19) ـ جوان بوویە = واتە خورت و بەخۆوەو گەنج بوە ، لەڕاستیشدا وەك لە (خاڵ) دا هاتوە ؛ (موفتی) زۆری حەز لە یاری و بەهێزبوە . لە زۆر خانەیش دا دەستی بوە ، کە ئەمــەش لەنــاو فەقێ ی ئەوسادا باوبوە هەندێکیان مەشقی زۆر خانەیەن کردوەو هەموو یاریەکیان کردوە ، وەك لە دوو چامــە گرنگــەکــەی (نــالی وسالم) وهەڵبــەستی دیکــەی هۆنــەرانمــانــدا هاتــوە وتەنــانەت مامۆستا ومەلاچاکێکی دیکــەمــان : مەلا شەریف (شــەهیــد) کە هۆنەرو باپیری (مــاجیــد مصطــەفــا)ی شالیـار بوە ، ئەویش سەرەڕای مەلایــەتیــەکــەی پاڵــەوانــێکی کەم هاوتــا بوە ، کە سەرگــوزەشتــەیــەکی پاڵـەوانێتی ئەوم لایــە بەرمبــەر بە پاڵــەوانێکی ژێــرکــەوتــووی ئێــرانیی دا بارەگــای پاشای باباندا لە سلەیمانی .
(20) ـ پاڵەتی = کرێکاری ، کارگەری . . .
(21) ـ قرۆش = پارەیەکی ئەوسای عوثمانی بوە .
(22) ـ دایــە = داوێتێ ، پیێداوە ، (پیێ کــریــوە)ی مەبەستە .
(23) ـ ئیــرس = عورووس ، رووس ـ بەڵام مەبــەسی لە (قەشە)ی فەلە (گاور) بوە ، کە لە سەرتاپای چیرۆکەکەوە ئاشــکــرا ئەبــێت کە (مــوفــتی) خۆی لە فەرمـــان بەرە مەزنەکانی عوثمانی وخونکاریش کردۆتە (قەشە) .
کە لێرەدا (قەشە) بە ئیرس واتە (رووسی) ناوئەبات ، ئەمە لەوەوەیە لەناو کورداندا باوە کەئەوی ئیسلام نەبووبێ بە زۆری پیێیان ووتوە عورووس )ئیرس) یا مسقۆف ، کە مەبــەس لە غەیــرە ئایینێکی زۆر کافــرە ، ئەمــەش لە فۆلکــۆرەکــانمــانــدا هاتوەو لە ئەنجامی ستەمکاری قەراڵەکانی رووسەوە پەیابوە . . . . . هتد .
(24) ـ ئەم ووتــەی (حــەتتــاپیان) دووجار لەسەریەك لەم شوێنــەی دەقی چیــرۆکــەکــەدا دووبــارە بۆتــەوە ، من یەکێکیــانم لابــرد ، وبەهەڵەی دەستی ی خوالێخۆش بوو مامــۆستــا صادق بەهــائــەدینم دانــا ، کە مەبــەس لە : هەتاکوویێ (قاچ)و ئاودامانیتی بەرگی (قەشە) یانەیە .
(25) ـ صوبەیێ = سبەیێك ، سبەبنێیەك ، بەیانیەك ، سپێدەیێ . . .
(26) ـ ئەو دەستی لیبــاسێــد ئیــرســان = ئەو دەستە بەرگە قەشەیەتیەی .
(27) ـ بەرکری = کردیە بەری ، لەبەریکرد (بۆ بەرگی مەبەستە) .
(28) ـ گرتیە = گرتوویەتی ، مەبەسی لە بەدەستەوگرتنی داردەستە . بەلام لە دەقەکەدا (کرتیە) نوسراوە .
(29) ـ شوول = کار ، لە (شغــل)ی عارەبیــەوەیــە . واتە کارم پیێ هەیە
(30) ـ سەر هەنگڤتە = سەردانەواو ـ مەبەس لەوەیە کەوا شێخــولئیسلام نەیناسیتەوە کە لەوەپێش بەناوی مەلایەتەوە هانــای بوبــردبــوو ، لیێ نەپــرسیبــوەو ، وە مەبــەسی لە (بێ پەروایی) یە لە بارەگای شێخولئیسلامدا .
(31) ـ ڕوینێ = دانیشە ـ وەلە دەقەکەدا (رونی) نوسراوە .
(32) ـ روبــتیــنــتــن = لەرووی‌دێت ، رووی ئەهێنێ ، پرکێشی ئەکا .
(33) ـ ئیشەڤە = ئەم شەوەکە ، ئەمشەو . . .
(34) ـ ببم = ئەم ووشــەیــە لە دەقەکەدا (بەبم) نوسراوە و زۆرجــاریش ئەمــەم لە کەشکــۆڵــە کۆنــەکــاندا دیوە کە لە

رێنووسی کۆندا (بەبم) نووسراوە
(35) ـ دبـهـتن = دەبیستێ ، گوێی لێ ئـەبێ ، لێی دەبیەت .
(36) ـ گۆ = گوتی ، کوتی ، ووتی .
(37) ـ نیـزوکی = نێـزیکی ، لەدەقـەکـەدا چەند جاری تریش هەر (نیزوکی) نوسراوە
(38) ـ شەهادەت = شایەتمان ، ووتەی : (أشهد ان لا اله إلاّ الله و أشهد ان محمداً رسول الله) ، کە دەربڕینی نیشانەی یەکەمی ئیسلامە .
(39) ـ مەلانی = مەلایانە ، وەك هی مەلایان .
(40) ـ صەدرولئـەعظـەم = پایـەیێکی فەرمـان بەری عوثمانی بوە . بەرامبەر بە (سەرەك وەزیران) .
(41) ـ دانـەینن = دانـەنێن ـ مەبـەسی لەوەبـوە ناوی لێ نەنین هەتا خەلیفە خۆیشی ئامادە ئەبێ .
(42) ـ ئەم ووشـەی (ببیتم)ە لە دەقـەکـەدا بەشیـوەی (بەبینم) نوسراوە ، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (34) لەپێشەوە

(43) ـ مەلاتی = مەلایانە ، مەلایەتی ـ ئەمە بەڵگە یەکی ترە کە لەبەرگی (قەشە)دا چوەو خۆی کردوە بەئیسلام کەوا بەرگی (مـەلاتی) یان لەبـەرکـردوەو ، ئەگـەر وەك هەر فەلـەیـەکی تری جگـە لە قەشـەدا بچـووبـایـە ، بەرگی مەلایەتیان پێ نەئەدا .
(44) ـ ئەم دووبـارە کردنـەوەی ڕستـەیـە کەلـە پیشیشـدا باسی بردنە حەمام و بەرگی مەلایانە لەبەرکردن هاتوە ئەمە شێـوەیـەکـە لەفۆلکلۆری هەموو گەلاندا هی کوردیش دا پەیڕەوی ئەکرێ وئەم دووبارە کردنەوەیە یاریدەی زوو لەبەرکردنی دەقـەکەو ، لەبیرنەکردنی و درێژ بوونەوەی دەقەکە بۆ زۆرتر کات پێـوە رابـواردنیو ، زوو ئەنجـام بە دەستـەوە نەدان و جوانیەکی وێژەییشی تیایە و . . . هتد و ڕواڵەتی فۆلکۆرە کە دیـارە ئەم چیـرۆکەش ئەوسایە سروشتیەکی فۆلکۆری وەرگرتوە .
(45) ـ ئەم ووشـەی (خینـدکـار)ە لە دەقـەکـەدا وەهـا نووسـراوەو مەبـەسی لە (خـونـدکـار)ە ، ئەشێ ئەوسـایە (خینـدکار)یش ووترابێ ، بۆیە ؛ وەك خۆی هێشتمەوە . بەتـایبـەتی کەمن نوسخـەی ئەم چیـرۆکـەم بەرێنـووسی لاتینی لەبـەردەستـانیـە ، کە بڕوام وایـە ئەوسـایـە چەندو چۆنی دەقی چیـرۆکـەکـەو ئەم پەراوێـزانـەشم وەك ئێستە نەئەبوون .
(46) ـ لێـرەدا ووریـایی (مـوفتی) دەرئـەکەوی ، کە لەم دەور بینینی خۆبـەقەشە کردنەیدا تێ نەکەوتوە و، زیرەکانە لەم گێـژاوی ناوی ئیسـلامی لێ نـانـەیـدا هەرنـاوی (محـەممـەد)ەکـەی خۆی هەڵبـژادوتـەوە ، نەخـوازەلا لەروانگـەی ئیسـلامیـەوە کەنـاوی پێغەمبەری ئیسلامە ، بەرگـریـیی ناکـرێ ، بۆئـەوەی کە ناوێکی دیکـەی لێ دابنێن .
(47) ـ ووریـایی (مـوفتی) ماوەی نەدا (خـەلیفـە) کە ناوێکی جگـە لە ناوەکـەی خۆی لێ بنێ و ناچـار نازناوی (ئـەفـەنـدی) کەبـە ڕۆشنبیـران ووتـراوە پێی بەخشی ، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (5) لە پێشترەوە .
(48) ـ داتینن = دائەنێن ـ واتە ئەو ناوو نازناوەی لێ دائەنێن .
(49) ـ ئۆطیا = ئۆدەکەی ، هۆدەی ، ژوورەکەی .
(50) ـ ئەم ووشەی (خوێندن ـ یا خویندن)ە لە دەقەکەدا بەشێوەی (خوندن) نووسراوە .
(51) ـ زارۆکان = منالان ، بچووکان ، قوتابیانی منداڵ
(52) ـ ئەم ووشەی (خوندین)ە ش لە دەقەکەدا وانوسراوە بڕوانە پەراوێزی ژمارە (50) لە پێشەوە .
(53) ـ کەفش = ئاشکرا ، دیاری ، دەرختن ، خستەڕوو ، لام وایـە ئەم ووشـەیە پەیوەندی بە (کەشف)ی عارەبی یەوەبێ کە ئەم واتـایـانـە ئەدات و هەڵگـەرانـەوەی وەك : (قـەڵـەم ، قەمـەڵ)و (جـومعـە ، جوعمـە) و (فـەقەط ، فەتەق) بێت .
(54) ـ ئیفلاطوون ـ یا ـ ئەفلاتوون Platon (427 ـ 347 پێش زایین) هەرە بەنـاوبـانگـترین فەیلەسـووفی یۆنـانی وقـوتـابی سۆقـراط و مامۆستای ئەرەستاطالیس بووە و گەلێ پەڕاوی بەکەڵکی داناوە .

(55) ـ بژ وورڤـه دچتن = بەرەژ وور ئەچو، سەرئەکەوت لە خوێندنەکەیدا ، وەك ئیفلاتوون .

(56) ـ مەه = مانگ (دوومەهان = دوو مانگان) .

(57) ـ بروانە پەراوێزی ژمارە (5) و (47) لەپێشترەوە .

(58) ـ ئەم (مـازن)ە لە دەقـەکـەدا وانـوسراوە ، بەواتە : مەزن ، گەورە ومەبەس لە (مەلای چاك)ە .

(59) ـ لەم کردنەی (موفتی) دا بە مودەرریس دەرئەکەوێ کە نازنـاوی (فـەیضی) یەکـەی کە مامـۆسـتاکـەی لە بەرهـرەمـەنـدیەوە پێ‌ی بەخشسبوو ئیتر بە سەریابراوە هەر لەئەستەمبوولەوە .

(60) ـ ریجالی کیباران = (پیاوێی مەزنان)ی ئەوێ .

(61) ـ پڤ کتی = کۆکرایەوە ، بەهەف کەوت . . .

(62) ـ ئەم ووشەی (زاف)ە کە لە دواترا بە (زاڤ) یش لە دەقـەکـەدا هاتوەو هەردووکیشیان ئەشێن بەواتە (زۆر)و لە (زەبــەنــگــە)ی وەیــە ، کە لە بەشــی دوەمــی ووتــاری (شوێنەواری کورد لەژ ووررووی ئەفەریقادا) کە لە گۆڤاری (بـەیـان) دا بەشی یەکـەمیم بلاو کرۆتـەوە ، ئەم ووشەی (زاف)ەم شی کردۆتـەوە کە لە وولاتی (مـەغـریـب) یشدا بەزۆری بەکـاری ئەهینن بەواتـای (زەبـەنگە) ووشەیەکی ئیمـەیـە کەوتۆتە ناویانەوە ، بروا ناکەم لە (بالضعف) واتە دووچـەنـدانـەی عارەبیەوە بێ چونکە (مەغریب) لە گەڵ رەگی (بــەربــەر) یشـدا بەعـارەب پتـر تێکـەڵ بوون کە بەکـارهێنـانی (بـالضعف)ەکـەیـان پێ گران نەئەبو ئەگەر (زاف) لەوەوە بێ‌و هی خۆیان بووبێ . . . وهتد .

(63) ـ ب زەوجینین = ژنت بۆبهێنین ، ئەمــەش گوایـە خونــدکــارو شێخــولئیســلام وگەورەپیـاوانی عوثمـانی ویستویانە لە ئەستەمبوول ژ ن بۆ (موفتی) بهێنن و ئەولیش نەیتـوانیـوە ئاشکـرای بکات کە ژ ن ومناڵی لە سلەیمانی هەیـە ولێـرەشـدا لە فێڵەکەیدا دیسان سەرکەوتۆتەوە ، کە بەلای کەمـەوە یەکێ لە دوو کەنیـزەکـەکـانی (موفتی) کە (رەنــدێ)و (رێـحــان) بوون لە ئەستــەمبــوول پێ‌ی بەخشرابێ ، چونکە خۆی دووژنی هەبوە کە (گولناز) یان خەڵکی سلەیمانی‌و (پیرۆز) یان خەڵکی کۆیە بوە ، وئەم (پیـرۆز)ەیـان دایکی هۆنـەری مەزنمان (جەمیل صیدقی زەهـاوی) یە کە شێـخ رەضـای تاڵەبانی ناوو ناتۆرەی پێوە هەڵبـەستوون و ئەووەش لە دوشمنایەتیەوە یا لە راستی ناوو ناتــۆرەکـــانــەوە ، نەبــوە . بەشـکــوو تەنـیــا باوێکی سەردەمەکەبوە ئەگەنا چ شێخ رەضا و چ (جەمیل صیدقی زەهــاوی)و چ (شـوکـری فەضلی)و . . . هتـد کە شەرە جوێنی خەستــوو خۆڵیـان لە نێـوانـدابـوە هەمـوو دۆستی گیــانی‌و هادوەمی یەکــدی بوون و ئەمــەم لە گەلالـەی پەراویەکم دا لەم بارەیەوە جێ‌گیرو یەك لا کردۆتەوە ئەمجا لێـرەدا بەهـەل و پێـویستی ئەزانم کە چواربالیەکی (شێخ رەضـا) و (بـۆنە) کەی ئاشکرا بکەم کە تاکوو ئێستە لە بەر نەزانینی بۆنـەی چواربـاڵیـەکـەونەزانینی تاکی دوەمی ئەو چواربـاڵیـە خەڵکی بەلایـانەوە وایە کە ئەوتاکەی یەکەمی بەبێ بۆنـە لە دیـوانـە چاپکراوەکانی (شێخ رەضا) دا بلاو کراونـەتـەوە گوایـە پیس ترین جنێوە بە هەموو (کۆییان)ی داوە وەلـە راستیشـدا وەك لەسـاڵی (1936 ز) دا لە دەمی مامۆستا (مەلا عەبدوڵلای رەشەکانی) یەوە ئەوچواربالیەم وەرگـرتـوە کە بەفـەرموودەی مامۆستام بۆ (جەمیل صیدقی زەهاوی)ی ووتوە نەك بۆ کۆییان کەئەمەیە :ـ

ئەوکەسەی ئەصل و میزاجی فیتنەیی‌و بەدگۆییە
دەستی (ح‌حبو )یشی هەبێ ئەمجا بە تەحقیق کۆییە
گەر (جەمیل)یش بێ مەکەی ناوی کە دۆخێنی شلە
خاڵ وەڵــەد (پیــرۆز)ە ، هەرکێ‌ی هاتـە (کن) پێ‌ی خۆییە .

لە دیــوانــە چاپــەکـانیـدا لە جێگـەی (ئـەوکـەسـەی) (هـەرکـەسێ)و لە شوێنی (دەستی) (دەستـە) یان تیایە وە تاکی دوەمی کە هێشتـە چاپ نەکراوە ، ناوی (جەمیل) و (پیرۆز) خانی دایکی کە کۆیی بوە دیاریی کردوون و تیایا دیاردیی پەندی پێشینانی (کوییەتی‌و خۆییەتی)ی کردوە .

منیش بە دووری نازانم کە (موفتی) (پیرۆز خان) یانی لە کاتێکا مارە کردوە کە وەك لەم چیرۆکەی (ژابا) داهاتوە لە (خوشناو) بوە ، یا بەهۆی ئاشنایەتی ئەوسایەوە دەستی کەوتــوە رەنگــە ئەویی لە ئەستـەمبـوولیش بە کەنیـزەکی

وەریگرتبێ (ڕەندێ) یا (ڕێحان)یش بووبێ ، کە لام وایە ڕەندێکە وابوە .

(64) ـ ئەم ووشەی (ژ ین)ە لەدەقـەکـەدا وەهـا نوسـراوە مەبەستی لە (ژ ن)ە

(65) ـ ئەم باسی بوونی ژ ن و منـاڵـەی (مـوفتی) لە سلەیمـانی و ئاشکـرا نەکـردنی وەك چیـرۆکـەدا هاتووەو لە لاپـەڕەکـان (39 ـ 42)ی (خـاڵ) دایـە ، ئەمانە دەرگای ئەوەم لێ ئەکەنەوە ، کە ئەم چەند بۆچوونەی دوایی خۆم بخەمە سەر ئەم سەرچاوەیانەو بڵێم :ـ

ئەشێ یەکێ لە کەنیزەکەکانی بە تایبەتی (ڕەندێ) یانی لە ئەستەمبوول وەرگرتبێ ، (موفتی) لە ترسی ئاشکرا بوونی فێڵ کردنەکەی کە خۆی بە (قەشە) داناوەو (قەشە)ش ژ ن ناهێنن وڕەبـەنن بۆیـە نەیتـوانیـوە بڵێ من ژنم ناوێ وژنم هەیە، بە ناچاری لە شیخولئیسلام ئەو(ڕەندێ) یەی وەرگرتبێ ،

وە بەتێکرایی (موفتی) لەو دووژ ن و دووکەنیزەکەی (13) کوڕوسێ کچی بوە وەك :ـ

لە (گوڵنـاز)ی خەڵکی سلەیمـانی ، بەر لە چوونی بۆ ئەستەمبوڵی (عەبدوڵلا)ی کوڕە گەورەو ئەشێ (حەلیمە) کچیشی هەبـــووبن ، کە لە ئەستـــەمبـــوول ئاشکـــرای نەکردوون .

لەوانەیە (پیرۆز) یانی هەر لە خۆشناوەتیەوە مارە کردبێ بەڵام هەتـا چوونە بەغدای (موفتی) پیرۆز خان نەکەوتۆتە سك وزا یا لەدوای بوونی (مـوفتی) لە خۆشنـاوەتی مارەی کردبێ .

کە (مـوفتی) لە ئەستـەمبـووڵ گەڕاوەتـەوە سلەیمانی و لەوێ لەسـەر چاوپیـاو هەڵنـەهـاتنی هەنـدێك و بەدکاری وچـوغـولی لێکردنی وەك لە (خاڵ)دا ئەمە بەدرێژ ی باس کراوەو ، لە دواتـریشـدا دەری ئەخەم ، لە سلەیمانیەوە ، چوەتـە کەرکـووك ، ئەشێ کە لە وێش نەماوە لەبەر کەڵك وەرگـــرتن لەگـەنـدەکـانیـەوە بووبێ بەهـۆی دەسـەڵاتی (والی)یەوەو دۆستایەتی نیوانیان .

چونکە لە دەوروبەری ساڵی (1257ك) = (1841ز) دا چەنـد ساڵێك (موفتی) لە کەرکووك مامۆستا بوەو لەوێ (عەبدولحەکیم)ی کوڕی لە (گوڵناز) یان بوەو دوای ئەوەی کە (مـوفتی) چوەتـە بەغدا ، ئیتر لە هەردووژ ن و هەردوو کەنیـزەکـەکـەی هەمـوو منداڵەکانی تری لە بەغدا لە دایك بوون ، وەك لە (خـاڵ) دا سەرگـوزەشتـەی ژ یـانـی هەمـوانیـان بەکـورتی نووسـراوە کە (جـەمیـل صدقی زەهاوی) پاشە بەرەیانە .

من وای بۆ ئەچم (مـوفتی) لەدوای چوونـە بەغـدای (ڕێحان)ی کەنیزەکی لە یەکێ لەوالیەکان و پیاوەگەورانەوە پێ بـەخشـرابێ . ئەگـەر لە ئەستـەمبـووڵەوە نەیهێنابێ کە لەویـان (محـەممـەد سەلیم)ی کوڕی بەر لە (جـەمیـل) لەدایك بوە و هیوابارم ئەمانە باشتر جێ گیر بین .

(66) ـ ئەم سپـاس و ستـایشـەی (مـوفتی) بێگـومـان پارچـەیـەکی باڵای وێژەیی بوە لەبەرهەمەکانی (موفتی) و هەرچـەنـد بە مەرایی کارانـەش بژمێـردرێ لام وایـە وەستـایـانـەو لەبنەوە ڕاستیی بەرنـەداوە ، وخـۆزگـە بنوسرایەتەوە ، کە بەهەزاران شتی وامان لەکیس چوە .

(67) ـ ئەم دان پیـانـانـەی (موفتی) کە بەئەصل خەڵکی سلەیمانی بوە ، لە سەرەتای ئەچیرۆکەشەوە کە نوسراوە : (مـەلا محـەممـەد)یك لە خۆشنـاوەتی پەیـابـوە . ئەوە ئەگـەریـەتێ کەدوای ئیجـازەی خوێنـدن وەرگرتنەکەی ، یەکسەر چوەتە خۆشناوە ، وەك لەپێشترا ئەمەم شی کردەوە

(68) ـ بەڵام کە ئەڵێ : لەو ناوچـەیـە زانستی کـەمـە . ئەمەیان ڕاست نیەو ، یا ناشێ (موفتی) وەهای ووتبێ ، یا لەبـەر کار سەرپێگـرتنی خۆی وای ووتوە ، ئەگەنا زانستی ناوچـەی سلەیمـانی ئەوسـایـە هاوتـای زانستی شارە گەورەکـان بوە . بە گەواهی دانی (مستـەریـچ)وزوربەی پەراویـە مێـژ وییـەکـان وتـەنـانەت خوێندنی خۆێشی لە دەرەوەی سلەیمانی لەبەر ناکۆکیەکەی باوکی و پاشای بابان بوە .

(69) ـ داوای گوند کردنەکەی بەشێوەی (وەقف) بوە ، بۆ ئەو مزگـەوتـەی دەرسی تیـابڵێتـەوە ، تا مزگەوتەکەو خۆی

ببـات به رێـوه ، كه ئەوسـایـه ئەوه باوبوه ، بەتـایبـەتی پاشاكانی بابان ئەوەیان كردوه .

لێـرەدا (چـەنـدكرێد) بەواته چەند پارچه یەكه . كر = پارچه ، كەت ، تاك ، یەك . . .

(70) ـ بوونی ، یازۆر بەكـارهێنـانی ئەم جۆره ووشـەی بەنـدەگێنی یـه له شێوەی (كرمانجی ژ وورو)دا ئەگەرێتەوه بۆ شیوه فەرمانرەوایيه ستەمگەری‌و چەوتەكەی عوثمانی كه تەنـانەت پاشاو پیاوه گەورەكانی فەرمانبەرانیان له بەندەی زەرخریدەبوون وەك : مەماليك و یەنی‌چەری‌و هتد .

(71) ـ ئەزبەنی = من بەندەی تۆم و(ئەز = من) و (بەنی = بەنـده ، عەبـد) وەیـا : (ئـاوەهاش) ئەگرێتەوه واته من بەوجۆره (ئاوەها) بچووك و بەندەتم

(72) ـ ببێژم = ئەم ووشەیه له دەقەكەدا (بەبێژم) نوسراوه بروانه پەراوێزی ژماره (43 و 42) لەپێشترەوه .

(73) ـ كە خونكـار تكـای (مـوفتی) ئەگـرێ‌و ئەم سێ گونـدی گەورەیـەی له سەر (مـوفتی) وەقف كرد وەك له لاپـەره (18 و 19)ی (خـاڵ)دایـه كه (مـوفتی) له ساڵی (1296 ك ـ 1878ز) دا له كاتـی گرانیـه كەدا كاكـه حەمـەی حاجی مەلا رەسـووڵی كردوتـه وەكیلی خۆی له سەر زەوی وزارەكانی له (دیاله) كه نه له (خاڵ) داو نه له (ژابـا) شدا ناوی ئەوگـونـدانـه نەبـراوه تەنیـا (خـاڵ) ناوچەكەی . به (دیاله) داناوه ، وادیاره ئەوسێ گونده كه دراوێتێ لەوناوه بوه ، بۆیەش چۆته (بەغدا) یەكەم شاری گەورەیـه ئەمجـا جێ‌ی ئەوی مەزنی تیـابـۆتەوه ، دووەم بۆ چاكتـر دەس گەیشتن بەسـەر ئەوگوندانەیدا بوه ، ئەمەش دیسانەوه لەگەڵ ئەوه یەك ئەگرێته وه كه له لاپەره (35)ی (خـاڵ) دا نوسـراوه كه (مـەدحـەت) پاشـا) زۆر تكای له (مـوفتی) كردوه كه موقـاطەعەی (بەلەدرووز)ی بداتێ كه بەپێ‌ی سەژمێـری گشتی 1957 دانیشتـوانی ئەونـاوچـه (نـاحیـه)یـه 18956 كەس بوون وبەپـێ‌ی مێـژ وو ناوچەیەكی كوردستانه بەڵام (موفتی) فەرموویه : نامەوێ نەوەك زۆر دەوڵـەمـەند ببم و لەدوای خۆم مناڵەكانم یا من ببن و رووله خودا وەربگێـرن . كه (بـەلەدرووز)یش هەر له (دیـالـه) یەو دیـاره نزیكی گونـدەكـانی بوه . ساغ كردنەوەی ئەمەش گران نیه .

(74) ـ واته نوسراوه ؛ بەسەر هەركوێی‌ی‌كدا تێ‌بەرێ له گەرانـەوەی بۆ سلەیمـانی دا میـوانـداریی بكـەن وڕێزی لێ‌بگرن .

(75) ـ بەرامبەر بەم ناوبردنی پێنج ساڵ مانەوەی (موفتی) له ئەستـەمبـووڵ ، ئەمـەوێ ئەم لێكـۆڵـینـەوەو ، شی‌كـردنـەوەیەی خۆم دیاری بكەم وجێ‌ی بكەمەوه ، كه كەی‌و لەسـەرێـنـی كام سوڵـتـان و . هتـد دا چوەتـه ئەستـەمبووڵ وهەندێ (بۆچوون)ی نوێی دیاری بكەم . بەپێ‌ی پەراوێـزی ژمـاره (4) ی سەرەوه دەركـەوت كه (مـوفتی) له دەوربـەری (1830 ز) دا ئیجـازەی تەواو كردنی خوێنـدن و دەرس ووتنـەوەی وەرگـرتـوه و لەپێشا له (خـۆشنـاو)و دوای ئەوه لەسلەیمـانی مامـۆستـا بوه ، كه ئەشێ ئەوماوەیـه له (1830 ـ 1834 ز) دا بووبێ كه له دواوه لەم ساڵی (1834 ز) هەتـا ئیجـازه وەرگـرتنـەكـەی (1830ز) ئەوماوەیـەی ژیـانی رێكـەوتی فەرمـانـرەوایی (سـوڵتـان سەلیم)ی سێ‌یـەم : (1789ز ـ 1807) و (سوڵتان مصطفا)ی چوارەم : (1807 ـ 1808ز) و 26 ساڵی فەرمانرەوایی (سوڵتان مەحمود)ی دووەم : (1808 ـ 1839ز) ئەكات كه هەموو سووڵتانی عوثمانی بوون ، ئەمـەش پەراوێـزی ژمـاره (3)م له سەرەوه جیگـر ئەكات كەوا (مـوفتی) لەوسەردەمـەی خوێنـدنـەیـدا (سـوڵتـان ئەحمەد) ناوێكی خەلیفەی عوثمانی فەرمان رەوا نەبوه .

له لاپەره (15 ـ 18)ی (خاڵ) دا یه كه (موفتی) كاتی دەرس ووتنـەوەی لەسلەیمانی هەندێ بەدكار خۆشیان لێ نەهـاتـوه ، لەوانـه حاجی مەلا رەسـووڵ ناوێك كەلەلای مەحموود پاشای بابان كه له ساڵانی (183 ـ 1834ز) دا فەرمانرەوا بوه ، وەك له پێشەوه نیشانەم بۆكردوه ئەوحاجی مەلا رەسـووڵـه له لای پاشـای سلەیمـانی چوغـوڵی له (مـوفتی) ئەكـات ولـەوساوه پاشـا رووسـاردێی له گەڵ (موفتی) دا نواندوه له لاپەره (35 ـ 36)ی (خاڵ؛ دا زۆر چاك لەدەسكورتی و هەژاری (موفتی)

لەسلەیمانی لەسەرەتای مەلایەتی ی دا دواوە ، دەری خستوە کە (موفتی) دڵی بە سلەیمانیەوە نەماوە .

لە سەرەتای ئەم چیرۆکەشەوە دەرکەوت کە لە بەر هەژاریتی (موفتی) و لەبەر (مەلاچاکێتی) بوە کە خەڵکی سلەیمانی هانیان داوە بچێتە ئەستەمبوڵ . تا لە پاداشی ئەو زاناییە بەرزەیدا سامانێکی دەسکەوێ و لەو دڵگرانی و تەنگاویە رسگاربێ . ئەمجا هەژاریەکەی و ، تەنگاو بوونی بەدەست ئەوانەوە کە چاویان بە (موفتی) دا هەڵنەهاتووە و هاندانی خەڵکیش بۆ چوونە ئەستەمبوڵی و بەخۆداراپەرموونی کاریان تێ کردوە . ئەوە بوو ؛ چوە ئەستەمبوڵ و بەفێڵی ئیسلام بوون ، پێگەیشت و بەرێز و سامان‌وخاوەن گوندی یەوە گەرایەوە سلەیمانی کە ئەو گەشتەی ؛ پینج ساڵی خایاند ، کە ئەو پێنج ساڵەش بەر (1834 ـ 1838ز) ئەکەون و دیسان ئەو سەردەمەی ژیانی (موفتی)ش هەر بەر فەرمانڕوایی هەمان (سوڵتان مەحموود)ی دوەمی عوثمانی ئەکەوێ کە (موفتی) فێڵەکەی لەم سوڵتانە گێلەو شیخولئیسلام کەمژەیەو صەدری ئەعظەمە گەلحۆیە کردوە کە چارەنووسی ملێونە هاکەس لە قەڵەمرەوی جیهانی کۆندا لە بن دەستی زۆردایی ئەو حەپۆلانەدا بووە و کەڵکمان لە مێژوو وەرنەگرتوە . بەڵام (موفتی) کە لە راستی ی ئەو فەرمان رەوایانەو باری جیهان و درۆزنیان گەیشت کە بەناوی ئاینەوە بەری جیهانێکی ئاوافراوان و کەسانی بە نارەوایی ئەمژن کە شایانی ئەوەنین ئەویش یاخی بوو ، وە خۆی کردە (قەشە) و بەو جۆرە پێ یان پێ کەنی و چنگی لە مافی رەوای خۆی گیرکرد .

هەروەك لەچیرۆکی (ژابا)دا هاتوە (موفتی) لە ئەستەمبوڵەوە بۆ جاری دووەم گەرایەوە سلەیمانی بەزەنگینیەوە ، چونکە ژن و ماڵ ومناڵی لەوێ بوون ونیشتمانی بوو .

بەڵام وا دیارە هەمان کەسانی کە لە (موفتی) یان خۆش نەهاتوە ، کەوتوونەتە کنە لێ کردن ، لە لایەکی تریشەوە وەك لە لاپەڕە (18 ـ 20)ی (خاڵ)دایە کە ئەحمەد بەگی موسلیم کە باپیری حسەین بەگی نەوتچی بوە ، بۆ (موفتی)ی نووسیوە کەببێ بە مودەرریسی مزگەوتی (موسلیم) لە گەرەکی (قوریە)ی کەرکووك و ئەویش کە جێگەی خۆی بەئاسوودە نەدیوە بە خێزانەوە بۆ دواجار سلەیمانی ، جێ هێشت و چوە کەرکووك و لە ساڵی (1841ز)دا لەوێ (عەبدولحەکیم)ی کوری لە دایك بووە و لە ناوەندی ساڵانی (1841 ـ 1844ز)دا بەئێجگاری لە کەرکووکیشەوە چوە بۆ بەغداو لە ساڵی (1844ز)دا لە بەغدا مودەرریس بووە و پاشتر رەئیسی مودەرریسین و ئەمیش ئاکامی لەدوورە وولاتی دا سەرنانەوەکەی مەولانا خالیدو نالی و حاجی قادری کۆیی و ئەمین فەیضی و شێخ رەضاو ئەمین یومنی و . هتد بووە بە چارەنووسی .

هەروەك دەرکەوت (خاڵ) و (ژابا) لەم ساغ کردنەوەیەی سەرەوەمدا ئەگەنجێن و بەراوەژ ووی یەکدی نین و ئەم ساڵانەی (1830 ـ 1844ز)ی ژیانی (موفتی) ڕێکەوتی یەك ساڵ لە فەرمانرەوایی (سوڵتان مەحموود)ی دوەمی ناوبراوو پانزە ساڵ لەفەرمانرەوایی (سوڵتان عەبدولمەجید)ی یەکەم : (1839 ـ 1861ز)ی کردوە ، دیسان تائیرەش ژیانی (موفتی) بەر فەرمانرەوایی (سوڵتان ئەحمەد) نەکەوتوە .

(موفتی) لەساڵی (1853ز)دا پایەی (موفتی)یەتی دراوەتێ و هەتا ساڵی (1890ز) کەتیا مردوە هەر بەموفتیەتی لەبەغدا ماوەتەوە ئەو ماوەیەی ژیانی بەر فەرمانرەوایی (سوڵتان عەبدولعەزیز) : (1861 ـ 1876ز) و (سوڵتان مراد)ی پێنجەم : (1876ز) و (سوڵتان عەبدولمەجید)ی دووەم : (1876 ـ 1909ز) کەوتوە ، لە مەشدا دەرئەکەوێ تاکوو پاش ژیانی ئەویش هەر (سوڵتان ئەحمەد) ناو خەلیفەیەتی ی عوثمانی ی نەکردوە کە لە چیرۆکەکەدا ناوی هاتوە .

منیش لە ناوەرۆکی (خاڵ) و (ژابا) و پەراوێز مێژوویەکانی ئەو سەردەمە ئەم یالانم بۆ ساغ بوونەوە و لە تێکرای ئەم چیرۆکەی (ژابا) و بەسەرهاتی (موفتی)

لەگـەڵ پیـاوە گەورەکـانی عوثمانی دا، پووچی و لەگاوی و بۆگــەنـانــەی ئەوانمـان بۆ دەرئـەکـەوێ کە لە مێـژ ودا بە (پیـاوینـەخـۆش) ناوبراوە و زیرەکی و ووریایی (موفتی) مان بۆ ئاشکــراو روون ئەبێتــەوە کە چۆن توانیــویــەتی زانـایـانـەو لە ڕێگـەی ڕاستی ئایینـەوە کەڵـك لەونەزان و ناشیـانـە وەرگـرێ و زیانییان لەدەست نەکات و کەڵکێکی زۆر بە خەڵکی بگەیەنێت و بناغەیێ بنە ماڵەیەك دابنێ کە هەتـــا هەتـایـە گەلی کورد شانـازیی پێـوە بکـات و گەلێ (عیبـرەت)ی تر لەم چیـرۆکـەی (ژابـا)و ژیانی (موفتی) وەردەگیـرێت و گەلێ لێکــدانـەوەو لێکـۆڵینـەوەی تریش هەڵئـەکرێت و کوا (خاڵ)ێکی کە؟ (76) ـ خەبط دکەتن = دەستــی تێ وەردەدات، خەریـکـی کاروباری ئـــەبێ مەبەس لە هی گوندەکانیەتی.

(77) ـ دکەتن = ئەکات، واتە بەپاڵ گوند داریەکەیشیەوە مامۆستایەتی کردوە.

(78) ـ هدی = باسی، لێدوانی..

(79) ـ (مـــزین)، لەدەقـەکـەدا وا نوسـراوەو مەبـەس لە (مەزن)و بەواتە: (گەورە)و (تومەزن) = کەگەورە..).

(80) ـ بـ خف = بە نهێنی، لەپـەنـاوە، بەدزیەوە، بە بێ دەگی و ئەم ووشـەیەش لە (خەفەکردن) = بێدەنگ کردنی کوردی یەوەیە نەك لە سەر چاوەی عارەبیەوە.

(81) ـ چویمە ـ لە دەقەکەدا (چومە) نوسراوە.

(82) ـ طشتەکی = چشتێك، شتێك، چتێکی.

(83) ـ ئەم نازنـــاوەی (مــوفـتـی) کە گوایــە بە (مـــەلا محـەممـەدی ئیرسیان) بەناوبانگ بوە، وەك لەم چیرۆکی (ژابـا)یـەدا هاتوە ئەمە لە سەرچاوەیەکی تر ودەمدەمیش د انیـــەو ئەشـێ لە ناو هەنــدێ لە هادال و دۆستی نزیکی (مـوفتی)دا کە نهێنیـەکـەی لێ ئاشکـرا کردون، وەهـای پێوترابێ بۆپێکەنین و خۆشی و ئەوەش شتێکی ئاساییە.

(84) ـ وادیـارە، گێرەرەوەی ئەو چیروکەو نووسەرەکەیشی لە ژیـــانی (مـــوفتی) لە (سلەیمـانی) بەولاوەی ئاگـەدار نەبـوون، بۆیـە، بەلایانەوە وابوە کەهەر لە (سلەیمانی)دا ماوە، وە نەوەی ئەویش لەوێن.

ئیتـر دەسکێ گوڵ ودەسکێ نێـرگـز، مەرگی کەستـان نەبینم هەرگیز.

**ـ سلاوی گەرم بۆ دایکی شەهیدان .**

**ـ ئافرەتانی عیراق ، قارەمانان پێ ئەگەیێنن**

**ـ عیـراق مەزنـە بە گەلـەکـەی ، مەزنـە بە سوپـاکـەی مەزنـە بە سەرکردەکەی صدام حسێن .**

# ڕۆژمێری کوردی

نافیع کاکە

لەبەر ئەوەی کوردستان بەگشتی لە مەلبەندێکی سەختی کوێستانی ساردو سەرمادا هەلکەوتووە ، چیاو کێوو کەژەکەکانی ، دارستانی چروزەبەندو ، رووبارو چەمی خوری ، دەورێکی ناهەمواریان لە دابەش کردن و دابرکردن و پچر پچری دانیشتوەکانی دا گێراوە بەرەنگێ کە ئەم هەرێم پەیوەندی بەوهەرێمی ترەوە کزبووە ، تەوەنی هاتووچۆکردن لە نێوانیاندا باریك و لاواز بووە کە لە ئەنجامدا ئەم بارودۆخە چەپ گەردە کارێکی بەتینی کردۆتە سەر تێکرا مەیدانەکانی کۆمەلایەتی ، ئابووری رۆشنبیری ، کۆمەلگەی کوردی جا بۆیە ئەگەر لەم کلاورۆژنەوە بروانینە ناوی مانگە کوردی یەکان . ئەبینین ئەم ناوانە بە جۆراوجۆر دێتە پێش چاو ، هەر هەرێمێك ناوێکی تایبەتیَ بۆ ئەم مانگانە داناوە . جا هەر چەندە ئەم ـ ناوانە لە تان و پۆدا جیاوازن بەلام لە ریشەدا هەمووی یەکن .

ئەم لێکۆلینەوەی برای بەرێز (نافع کاکە) وەکو خۆی دەری ئەخا زۆربەی لەدەم و زمانی کۆمەلانی خەلکی وەرگرتووە ، لە کانیاوی مەلبەندێکی دیاری کراوی کوردوستاندا هەلبژاردوە ، بۆیە لەم هەلوێستەدا ئێمەش داوا لە رۆشنبیرانی کورد ئەکەین کە چاوێ بخشێنن بەم لێکۆلینەوەیەدا ، تا بیروڕای خۆیان لەم بارەیەوە دەرببرن تا بتوانین بە پشتیوانی هەموو لایەك ئەم باسە پێزترو دەولەمەند تر بکەین تا ناوی مانگە کوردیەکانمان بە شێوەیەکی یەکگرتوویی بخەینە بەردەمی خوێندەواران ، ئیتر چاوەروانی ئەرکی پیرۆزو بیری والابێژو کۆششی بە پێزتانین

« رۆشنبیری نوێ »

هەر لە کۆنەوە مرۆڤ بۆ زانینی ئەو ماوە کاتی یەی تیایدا ژ یـاوە هەوڵی دانـانی ئامـاژ و هۆیـەکانی ناسینەوەی داوە دەربـارەی سوورانـەوەی چەرخـەیـەکی تەواوی کاتی دیـاری کـراو ، لە کاتی دەست پێ کـردن چەرخـەکـە تاکو دەگـەڕێتـەوە سەر بارو کاتـێکـی وەکـو جارانـی ، کە سەرەتـاکەی ، کەی بێت و دووایی یەکەی چۆن بێت ، بۆ ئەو مەبـەسـتـە سوورانـەوەی زەوی و بارسـتـایـی یـە ئاسمـانی یـەکان و چۆنیەتی جووڵانیان وەکو سوورانەوەی زەوی بەدەوری خۆرداو سوورانـەوەی هەیڤ و هەڵهـاتن و ئاوا بوونـی ئەسـتێـرەکـان . سەرەرای هەمـوو ئەوانـە بارودۆخـی ئاووهـەوا بایـەخـێکی گرنگی هەبـووە لەو مەیـدانەدا سەبارەت بە جیاوازیی پلەی گەرمایی ، بەوەی سووڕانـەوەی چەرخێـك ئەگـەر سەرەتـاکـەی ئاووهەوای ساردبێ ئەنجـا ئاووهـەوای فێنك و دووایی بە ئاووهەوای گەرم و دووبارە بەرەو فێنکی دەچێ تاکـو باری ئاووهـەوا سارد دەبێ ، لێرەوە هەست بە سەرەتاو کۆتایی جەرخێکی تەواو دەکـرێ بەپێ ی ئاووهـەوا . جا ئەو ماوە کاتی یـەیان کردووە بە دووانزە (12) بەش سەبارەت بەوەی کە بۆشایی ئاسمـان بەشێـوەیـەکی بازنـەیی یاخـۆد گۆیی لە دووانـزە (12) بەش پێکهاتووە کە خۆر هەر جارێ دەچێتە یەك لەو بەشانە یەك لەدوای یەکدا کەوا خۆریش هۆی سەرەکی ی گۆرینی ئاووهەوایەو بەوەوە دوورو نزیکی دەبێت لە زەوی لەو کاتەی خۆر دەچێتە یەکەمین بەش کاتێکە شەوو رۆژ ی تێـدا بەرامبـەر دەبن و بە هەر یەك لەو بەشـانە دەڵێن کەلوو (بـورج) ، هەر کەلووەك لە کۆمەڵە ئەستێرەیەك پێکهاتووە کە ئەو ئەستێرانە بە جۆرێکی وا ریز بوونە لە سەر شێووی وێنـەی چەنـد شتێك یان گیانەوەرێك کە ئەوانەن (کوور ـ گا ـ جمك قرژال ـ شێر ـ گوڵەگەنم ـ تەرازوو ـ دووپشك ـ کەوان ـ گیسك ـ دۆڵچە ـ نەهەنگ) . بۆیەش ئێستا ساڵ دووانـزە مانـگـە جا دابـەش کردنـی چەرخـێـکـی ئەو ماوەکـاتی یـە بۆ ساڵ و مانـگ بە رووکەش نەبووە ، بەڵکو چەند هۆکارو ئاڵ وگۆرە پێشخستن و رەخنەی بە سەردا هاتووە .

گەر لە مێـژ ووی ساڵـی زایـیـنـی وورد بینـەوە کە (1984)ە ئەوە دەبێ هەروا خۆرایی بەکـار هێنـرا بێ ؟ سەرەتـای دەست پێ کـردنی ئەو مێـژ ووە دەگـەرێتـەوە بۆ ساڵی لە دایـك بوونی (عیسا) کە تا ئەمرۆ ئەوەندە ساڵەی بەسـەردا تێپـەریوە ، ئەوەش بە پێ ی چەند رێکەوتنێك لە سەری یەك دەنگن . هەروەهـا مێـژ ووی ساڵی کۆچیش لەو ساڵـەوە دەست پێ دەکـات کە پێغـەمبەری ئیمە (د) لە شاری مەککەوە کۆچی کرد بۆ شاری یەسرەب کەوا ئەمرۆ (1404) ساڵی بەسـەریـدا تێپـەریـوە ، لەم بووارەشـدا رۆژ ژمێـرو ساڵنـامـەی تر زۆر هەیە جا مەبەستی من لێردا رۆژ ژمێـری ساڵی کوردیـیە ئەوەی کە باسیش کرا تەنهـا چۆنیەتی ناونان و دەست پێ کردنی بوو .

دانـان و رێکخستنی رۆژ ژمێـر کارێکی سادە نییـەو پێـویستی بە هەوڵـدان ولێ دووان و کۆربـەستن هەیـە ، بەڵام تا ئێستا هیچ هەواڵ و کۆشش بۆ ئەو باسە نەدراوە ، بۆیـە دەبـینـین رۆژ ژمێـری کوردی لە ناوچـەیـەك بۆ ناوچـەیـەکی تر جیـاوازی هەیـە یان جێگۆرکێ دەربارەی مانگەکان، حەفتەکانی لە نێوان زۆرە ، هۆی ئەوەیە کەوا لە کۆنـەوە دەزگای راگەیانەن نەبوە کە وابکات هەموو وەکو یەك بن ولـە رۆژ ێکی دیـاری کراو لە هەمـوو ناوچـەکـان دەست پێ بکـرێت ، ئەوەش ئاشکـرایـە کەوا خەڵکی هەرێمـە لە یەکتـر دوورەکـان بە ساڵ یەکتـریان نەبینیوە تا زانیاری یەکتر لەو بارەیەوە بزانن .

سەرەتـای دەست پێ کـردنی ساڵی کوردی دەگەرێتەوە بۆ سەرەتـای دامـەزرانـدنی دەوڵـەتی (مـاد) کەوا باپیـرە گەورەی کوردن ئەو ساڵـەش دانی پیـانـراوە کەوا حەوت سەدە بەر لە زایینـە ، جا کەوایـە مێژ ووی دامەزراندنی لە گەڵ مێـژ ووی ئەمـرۆی زانیینی کۆ دەکـرێتەوە و مێژ ووی ساڵی کوردی دەردەچێت .(2684) .

سەرەتای دەست پێ کردنی یەکەم رۆژ ی ساڵی کوردی لە رۆژ ێکی وایە کە هەموو کەس دەبینێ ئاگر لەسەر لوتکە بەرزەکـانی وولاتـەکەمان مەشخەڵی بەرز دەبێتەوە بە دەم ئەو هۆنراوەی پیرەمێردی نەمر

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە

کەواتــە لە ڕۆژی بەر نەورۆز سنبــلك دەرواتـ و نەنجــا ساڵی نوێ دەست پێ دەکـات کە دەکـاتە ڕۆژی یەکەمی مانگی یەکەم (١ ـ ١ ـ ساڵ) . ڕۆژی نەورۆز لەو کاتەی ساڵــدایــە کە خۆر دەچێتە کەلووی کاوور کە شەووڕۆژی تیادا بەرامبەر ـ واتە دووانزە کاتژمێر شەوە دووانزەش ڕۆژە مەگەر بەچەند خولەکێك جیاواز بن . سەر ڕای ئەوەی کە ڕۆژی نەورۆز جەژنــی سەری ساڵــمــانــە و ڕۆژی سەر کەوتنی گەلی کوردمانە بەسەر زۆردار داو دەست پێ کردن وەرزی بەهارو جەژنی دارو درەختیشە .

دەربارەی ناوی مانگە کانی ساڵی کوردی کەوا دووانزە مانگن هەر ـ یەکــە ناوی تایبــەتی خۆی هەیە کە بە ڕێك و پێکی لە گەڵ ئەو کات ودەمەی ساڵ دەگونجێ واتاکەشی هەر لەو کات و دەمە هاتووە بە پێی دۆخ و باری سروشتەوە .

بەڵام هەنــدێ ناوەکــان لە . شوێنــێك بۆ شوێنێکی تر دەگــۆڕێن سەبــارەت بە یان و بەرینی ی وولاتــەکــەمــان و نەبــوونی هۆیــەکــانی بلاو کردنــەوەو جیاوازی ئاووهەوا لە هەرێمێك بۆ هەرێمێکی تر ئەمەش ئەوەندە کار ناکاتە سەر گۆڕینی ناوێــك یان زیــاتــر تەنهــا بۆ مانگێــك ، کاتێ بۆ مانگێــك دوو ناو یان زیــاتــر هەبــوو ئەوە هەردووان ڕاستن بەڵام بۆ ڕۆژ ژمێرێکی ڕێك پێویستە یەك لە ناوەکان هەڵ بژێــرین کە کامیــان زیــاتــر دەگــونجێ یان زۆرتــر بەکــار دەهێــنرێت دەیان کامیان بەردەوامی زیاترە بە پێی درێژی مانــەوەی کاتــەکــە ـ بۆ نمــوونە مانگی یەکەمی ساڵ چەند ناوی هەیــە (خــاکــەلێــوە ـ ئاخــەلێــوە ـ نەورۆز ـ ئادار) خاکەلێوەو ئاخەلێوە یەك ناون جیاوازی یەکە لە نێوان (خاك ، ئاخ) دایە هەر دووانیش بە واتای زەوی لە (خاك + لێوە) پێکهاتووە بە واتای خشاندنی لێوی ئاژاڵ لە خاك لە کاتی لە وەڕین سەبارەت بە پەیدا بوونی گیاو گۆڵ و سەوزایی . دەبینین خاکەلێوە بەردەوامی زۆر نیە چونکە ئەو مەبەستە بۆ سەرەتای شین بوونی لەوەڕ (گیاو گۆڵ) گیاو گۆلیش هەروا بە کورتی و ساوایی نامێنێتەوە بەڵکو بە ماوەیەکی کەم کاتێ سەری خۆی لە خاك دەرهێنـا دەبێتــە لەوەڕێکی تەواو گەر ئاژاڵ بشیخوات لێوی لە خاك ناخشێت ناوی (ئادار)یش لە (ئـاو + دار) پێکهـاتــووە کە لەو کاتــەی ساڵ پەیــوەندی نێوانیان زیاد دەکات و دار تەڕاتی بەلەشی دا دێت ودەست بە چەکەرە دان دەکات سەرەڕای ئەوانە (نەورۆز) ناوەکەی زۆر بلاوو ڕوونــە کەس نیــە نەیــزانێ وەیــان لە کام کاتی ساڵــدایــە بۆیــە زیاتر جێ ی خۆی گرتووە و پەسند تر کراوە لەســەر ناوەکــانی تر . بەو شێوەیە ناوی مانگەکانی تریش ئەگــەر لەــەك ناو زیــاتــر بوو ئەوا گونجــاو ترینیــان پەسند دەکــرێت ، ناوی مانگــەکــان ناوی ناســادەن (لێکــدراوو تێکــەڵ) ئەو ناوە ناســادانــەش لەســەر چەنــد بنچینــەیەك دروست بوون :ـ

1 ـ ناوێك و ئاوەڵناوێك .

**وەکــو نەورۆز (ڕۆژی نوێ) ، پووش کاڵ ، سەرماوەرز ، ڕەشــەمێ جۆزەردان ، ڕێبــەنــدان ، بەڵام دوو ناوەکەی دووای بە یارمەتی (ان)ی کاتی دروست بوونە وەکو لە (شەو ـ شەوان)دا دەبینرێت .**

2 ـ ناوی تێکەڵ (دووناو)

**لەو شێوەیــەدا ناوەکــە دروست دەبێت بە یارمــەتی فرمــانی بێ هێــزی (5) وەکــو خاکــەلێوە ، بانەمەڕ ، بەختەباران ، ئادار گەلاڕێزان . بەڵام ئەوەی دووایی بە یارمەتی (ان)ی کاتی دروست بووە**

**3 ـ لە چاوگی تێپــەڕ بە وەرگــرتنی ڕەگی فرمــان هەنــدێك جاریش بە هاوکــاری (ان)ی کاتــی :ـ پووش پەڕ ، خەزەڵ وەر ڕەزبــەر ، باران بران ، بەفــرانبــار دوو ناوی دووایش بە هاوکاری (ان)ی کاتی دروست بوونە .**

**4 ـ هەنــدێــك ناویش تەنهــا لە (ناو) لەگەڵ (ان)ی کاتی دروست دەبن وەکو گوڵان ، خەرمانان ، زەخیران .**

**هەر وەکو ووتمان سەرەتای ساڵی کوردی بە ڕۆژی نەورۆز دەست پێ دەکات و کە مانگی نەورۆزیشە . وە بە مانگی ڕەشــەمێ ساڵ کۆتــایــی دێــت ، شەش مانگی بەرایی هەریــەکــەیــان (31) سی ویــەك ڕۆژ ن شەشەکەی تریش**

هەریەکەیان (30) سی ڕۆژ ن تەنها مانگی ڕەشەمێ نەبێ کە مانگی کۆتایی ساڵە (29) بیت و نۆ ڕۆژە بە چوارساڵ ئەویش دەبێتە (30)سی جارێك لەبەر ساڵی پر (کبیسە).

مانگەکانی وەرزی بەهار:-

بەپێی ڕۆژ ژمێری کوردی بەهار یەکەمین وەرزە لە چوار وەرزی ساڵ خۆر تیایدا دەچێتە کە لووی (ماوورگا. جمك) یەك لە دووای یەك لە (21)ی ئازارەوە تا (21)ی حوزەیران مانگە کانیش ئەوانەن:-

1 ـ نەورۆز.

مانگی یەکەمی بەهار و یەکەمی ساڵە بەرامبەر کەلووی شەك نەورۆز لە (نەو + روز) دروست بووە بەوانا ڕۆژی نوێ کە سەری ساڵی پێ دەست پێ دەکات وجەژنی دار و درەخت و سەرەتای پەیدابوونی بەرهەمی ئاژاڵێ و چەکەرە داتێ رووەکە هەروەها ئەو مانگە (خاکە لێوەو ئاخەلێوەو ئاداریشی پێ دەڵێن

2 ـ گوڵان: مانگی دووەمینی بەهار و دووەمینی ساڵە بەرامبەر کەلووی (گا) (بانەمەڕ)یش بەو مانگە دەڵێن گوڵان لە (گوڵ + ان)دا پێکهاتووە کاتێ لە مانگی ڕابووردوودا سەرەتای شین بوونی هەندێ بەروبوومی کشتوکاڵ بووە بەتایبەتی (جۆ)، جا لەو مانگەدا ئەو دانەوێڵەیە دەست بە دروست کردنی گۆل دەکات (فەریك) کە پێی دەڵێن (گوڵەجۆ یان فەریکەجۆ) و پێکهاتنی مادەیەکی ڕەنگ شیری لینج لە ناو گوڵەکە، کەوا سەرەتای دروست بوونی دانی فەریکە ـ کەیە، ماوەیەك دووای گوڵە جۆ ئەنجا گوڵە گەنمیش پەیدا دەبێت لەبەر ئەوەی لەو مانگە گوڵی دانەوێڵە پەیدا دەبێت بۆیە پێی دەڵێن مانگی گوڵان بە کۆکردنەوەی (گول) لەگەڵ (ان)ی کاتی دا بە واتای کاتی پەیدا بوونی گوڵی جۆو گەنم وجۆرەکانی تری دانەوێڵەی ئەو پۆلە (بانەمەڕ)یش ناوێکی تێکەڵە لە (بان + مەڕ) دروست بووە بە یارمەتی فرمانی بێهێزی (هـ)، یان بەواتای دەشت و دەر، لەو ماوەیە دا ئاژەڵداران مەڕو ماڵاتیان دەبەن بۆ بانان و زۆر بەکەمی دەیان گەڕێننەوە ئاوایی چونکە لەوەرگەو پاوان لەو ماوەیەدا زۆرە پێویست بە ئالیك دانیان ناکات لە ماڵەوە هەر لە بان تێر خۆرە دەبن و خۆشیان بەخۆ بە کەل و پەلی پێویست نیمچە ماڵێك لەگەڵ خەویان دەبەن جا لەبەر ئەوەی ئەو کاتەی ساڵ ئاژەڵداران بە خۆیان و ئاژاڵەکانیان لە ماڵ دەردەچن و دەچنە (بان)، بۆیە دەڵێن بانەمەڕ.

3 ـ جۆزەردان:-

مانگی سێیەمی بەهار و سێیەم مانگی ساڵیشە بەرامبەر کەلووی (جمك) هەروەها (باران بران)یش پێ دەڵێن. جۆزەردان لە ناوێك و ئاوەڵناوەکەی دروست بووە بە یاریدەی (ان)ی کاتی. هەرکە مانگی ڕابووردوو (گوڵان) کاتی پەیدا بوونی گوڵی جۆو گەنم و دانەوێڵە بوو ئەوە لەو کاتەدا گوڵەمان تەواو پێ دەگەن و ووشك و ڕەق دەبن ئەنجا ڕەنگیان زەرد هەڵ دەگەڕێ، بەتایبەتی گوڵەجۆ لەوانی تر زووتر پێدەگات کەواتە (جۆزەرد بوو). لەگەڵ (ان)ی کاتی دا دەبێتە ناوی (جۆزەردان). بۆ ناوی (باران بران)یش لە (باران + برین) هاتووە بە وەرگرتنی چاوگی تێپەڕ (بڕ) ئەنجا لەگەڵ (ان)ی کاتی دا دروست بووە (باران + بر + ان). هەروەها لەو کات و دەمەی ساڵ جۆرە باڵندەیەك دەر دەکەوێ ناوی (باران برە)یە لە بنکی گوێ سەبانان و کونە دیواران هێلانە دەکات هەرگیز ناتوانێ لە سەر زەوی بروا ئەگەر کەوتە سەرزەویش ناتوانێ هەڵ ـ بفرێ تاکو یەکێ بەدەست هەڵی نەدا ئەو کاتەش کاتێکە کە باران کەم دەبێ و خەریکە کۆتایی بێ ـ واتای ناوی (باران برە) ئەوەیە کە کاتێ ئەو باڵندەیە پەیدا دەبێت هەر لەودەمانە دایە کە ئێتر بارانیش چی تر نابارێت. ئەو مانگە بەختەباریشی پێدەڵێن کە لە (بەخت + باران) پێکهاتووە ناوێکی تێکەڵە، کاتێ دەڵێن فلانەکەس بەختی هەیە، هەر بەو واتایەوە ئەو بارانەی کە لەو کاتەی ساڵدا دەبارێت بەختە چونکە لەو کاتەی ساڵ باران بە شێوەیەکی ئاسایی نابارێت.

مانگەکانی وەرزی هاوین:-

هاوین دووەمین وەرزی ساڵە بە پێی ڕۆژمێری کوردی لەو وەرزەدا خۆر دەچێتە کەلووی (قرژال ـ شێر ـ

گوڵەگەنم) یەك لە دووای یەك کە 22 /ی حوزەیران ـ تا 22 /ی ئەیلول.

4 ـ پوش پەڕ:ـ

یەکەمین مانگی هاوین وچوارەم مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی (قرژاڵ) (پووش کاڵ)یشی پێ دەڵێن. پووش پەڕ لە (پووش پەڕین) هاتووە بە واتا لەوکاتەی ساڵ پووش لەبەر گەرمیی هەتاوزۆر ووشك و ناسك دەبێت هەر شتێکی پێ بکەوێت وەکو قاچی ئاژاڵ و چارەوی ئەوە دەوەرێ یان دەپەرێت بە وەرگرتنی چاوگی تێپەڕ بووەتە (پەڕ) (پووش پەڕ). پووش کاڵ لە ناوێك و ئاوەڵناوەکەی پێکهاتووە (پوش + کاڵ) کاڵ بە واتای گۆڕانی ڕەنگی گیاو گوڵ و پوش و پەراشی ووشك لەبەر زەبری گەرمی هەتاو (کاڵ) هەڵ دەگەڕێت، (پووش کاڵ بوون) جا بووەتە (پووش کاڵ). هەروەها چلەی هاوین لە 25 /ی ئەو مانگەرا دەست پێ دەکات کەوا بۆماوەی (40) چل ڕۆژ ئاووهەوا زۆر گەرم دەبێت.

5 ـ خەرمانان :ـ

دووەم مانگی هاوین و پێنجەمینی ساڵە بەرامبەر کەلووی (شێر چەند ناوێکی تریشی پێ دەڵێن کە ناوەکانیان یەك واتان وجیاوازیان ئەوەندە نیە وەکو (جۆخینان) زەخیران، خزیران). ئەو مانگە هەمووی دەکەوێتە بەر چلەی هاوین لە (خەرمان + ان) دروست بووە دووای ئەمە بەرووبوومی دانەوێڵەی وەکو گەنم وجۆدروێنە دەکرێت ئەنجا لە پارچە زەوییەکی تەختایی کۆی دەکەنەوە کە ڕێکخراوە بۆ ئەو مەبەستە پێی دەڵێن (جۆخین)، پاش کوتای بەرهەمەکە بە گێرەو جەنجەرکردن ئەنجا دانەوێڵەکە لە کاو کۆت و کۆزەرەکەی بە شەنە باکردن لێك جیا دەکرێتەوە بە بەرهەمی تازە پەیدا بوو دەڵێن (خەرمان). بۆیە دەڵێن (خەرمانان یان جوخینان) چونکە کاتیانە. هەروەها (زەخیران وخزیران)یش هەردووی یەکن لە (زەخیران)ەوە هاتووە زەخیران واتای هەڵگرتن و عەمبارکردنی بەرووبومی دانەوێڵەی پێویست بۆ زستان، جا کاتی ئەو دەمەی ساڵ کاتی ئەعەمبار ـ کردنی زەخیرەیە بۆیە دەڵێن (زەخیران) بەهۆی (ان)ی کاتی جا بەئاڵ و گۆڕ کردنی شوێنی (ز ـ خ) لەگەڵ یەکتر گۆڕاوە بوویتە خەزیران ـ یان دەڵێن خزیران.

6 ـ گەلاوێژ :

سێیەم مانگی هاوین و شەشەمین مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی گەڵەگەنم ئەو مانگە تەنها (٥) پێنج ڕۆژی لێ بەر چلە دەکەوێت، لەو کاتەی ساڵدا ئاووهەوا گۆڕانی بە تەواوی بەسەردا دێت بە تایبەتی لە کۆتاییدا فێنك یان سارد دەبێت وکاتی تەواو هەڵهاتنی ئەستێرەی گەلاوێژیشە بۆیە هەر بەوناوەش ناسراوە ئەو ئەستێرەیە زۆر ڕۆشنە بە ئاسانی جیادەکرێتەوە لە شەوی (45) چل وپێنجەمینی هاویندا واتە لە دوای نیوەی خەرمانان پاش ئەستێرەی تەرازوو هێشتا شەوی دەمینێ هەڵدێ.

مانگەکانی وەرزی پاییز:

پاییز وەرزی سێیەمە، لەو دەمەی ساڵ خۆر دەچێتە کەلووی (تەرازوو، دووپشك، کەوان) یەك لەدوای یەکدا لە 23 /ی ئەیلول تا 21 /ی کانون یەکەم.

7 ـ ڕەزبەر.

یەکەمین مانگی پاییزەو حەوتەمین مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی تەرازوو. ڕەزبەر لە (ڕەزبەردان) هاتووە بە کۆ کردنەوەی ڕەز لەگەڵ ڕەگی فرمانی بەردان (بەر) بە واتا ئەو دەمەی ساڵیە ڕەزو باخ و میوەجات دێتە بەرهەم.

8 ـ گەلاڕێزان.

دووەمین مانگی پاییزەو هەشتەمین مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی دووپشك (گەلا + ڕێز + ان) ناوێکی تێکەڵە بە یارمەتی (ان) گۆڕاوە بۆ شێوازی کاتی لەو کاتەی ساڵ خەڵك گەلاو چرۆی داران کۆدەکەنەوەو ڕیزیان دەکەن و هەڵیان دەگرن بۆ ئالیکی زستانیی مەڕو ماڵات لە (گەلاڕیز کردن) وەرگیراوە ئەو دەمەی ساڵ یاخود ئەو مانگە (خەزەڵ وەریشی پێ دەڵێن خەزەڵ واتای گەڵایە کەواتە گەلاوەرین چونکە ئەو کاتەی ساڵ دارو درەخت کەم کەم دەست بە گەڵا وەرین دەکەن خەزەڵ وەر لە (خەزەڵ

وەرین) هاتووە بە وەرگرتنی چاوگی تێپەڕی وەرین (وەر) ئەوە دروست بووە.

9 ـ سەرماوەز:

مانگی کۆتایی پاییزو نۆیەم مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی کەوان (شەستە باران)یش بەو دەمەی ساڵ دەڵێن سەرما وەرز لە ناوو ئاوەڵناو دروست بووە واتە وەرزی سارد چونکە ئەو دەمەی ساڵ ئاووهەوا سارد دادێت وباران دەبارێت بە زۆری سەبارەت بە زۆر باران بارینیش پێی دەڵێن (شەستە باران) بە واتا باران شەستی دەکات واتە زۆر باران دەبارێت شەستە باران ناوێکی تێکەڵە.

مانگەکانی وەرزی زستان.

وەرزی کۆتایی ساڵە بە گوێرەی ڕۆژ ژمێری کوردی لەو وەرزەدا خۆر دەچێتە کەلووی (گیسك، دۆڵچە، نەهەنگ) یەك لە دوای یەکدا لە 22/ی کانونی یەکەم تاکو 20/ی ئازار

10 ـ بەفرانبار.

مانگی دەیەمینی ساڵ ویەکەمی زستانە بەرامبەر کەلووی (گیسك) لە (بەفرباڕین) هاتوە بەوەرگرتنی ڕەگی فرمانی بارین بووەتە (بەفربار). (ان)ی کاتیش بەدوای (بەفر)ەکەوە تکاوەو ناوی بەفرانبار دروست بووە واتای کاتی بەفربارین. هەر کاتێ (25) بیست وپێنج ڕۆژ بە سەر ئەو مانگەدا تێپەڕ بووین دەکەوینە سەر چلەی زستان کە ئاوو هەوا زۆر سارد دەبێت.

11 ـ ڕێ بەندان:

دووەم مانگی زستان و یانزەمین مانگی ساڵە بەرامبەر کەلووی دۆڵچە ڕێ بەندان لە (ڕێ بەند بوون)ەوە هاتوە بە یارمەتی (ان)ی کاتی. بەواتای ڕێگا گیران و داخران لەبەر بوونەوەی بەفر لەسەر ڕێگەکاندا یان ئەوەتا بەفر زۆر دەبارێت هەموو دەشت و دەر دادەپۆشێت و هیچ وشکایی دیار نابێت لەبەر بەفر، بۆیە خەلك ڕێگەیان لێ دەگۆرێت جا گەر لە کاتی وادا لە ماڵ دەربچن لەوانەیە بە شوێنی نزمایی وادا بڕۆن کە بە بەفر پڕ بووتەوەو تێوەی بچن ولەناوبچن، لەوکاتەی ساڵ هات وچۆ نامێنێ یان کەم دەبێت بۆیەش بەو کاتە دەڵێن (ڕێبەندان).

12 ـ ڕەشەمێ:

سێیەم مانگی زستان و مانگی کۆتایی ساڵە بەرامبەر زستانە هەوا خۆش دەبێت و بەرەو بەهار دەچێت و تیشکی خۆر بەهێزتر دەبێت بۆیەش وا ناونراوە چونکە لە ناوچەی هەورامان ئەگەر ئافرەت لە بەر هەتاو دا بمێنێتەوە ڕەنگی دەم و چاوی ڕەش هەڵدەگەڕێت لەبەر ئەوەی ڕەنگی خۆیان سپی یە کاتێ پێستەکەی دەم و چاویان نەختێ ڕەش دەبێت لێوەیان دیاری دەدات بۆیە دەڵێن (ڕەشەمێ)، لە ناوێك وئاوەڵناو دروست بووە کە لە (مێ + ڕەش + بوون)ەوە هاتووە هەروەها ڕەشەمێ لە شوێنی تر بەووەوە دەڵێن، کە لەو کات و دەمەی ساڵ گیانەوەری وەکو پشیلەو ڕێوی بە (با) دێن یاخود بە (فاڵ) هاتن وپەڕین، لەو ماوەیەدا بەکۆمەڵ کۆمەڵ دووای یەك دەکەون و هەڵ بەرزودا بەرزو شەڕەشەقەیەکی وادەکەن بەتایبەتی پشیلە بەسەر بانان و دیواران دەکەون و ڕۆژە ڕەشەیەکی وا دەکەن کە حەسانەوە لە خەڵك حەرام دەکەن بۆیە دەڵێن ڕەشەمێ بە واتا مێیەی پشیلەکان بە با دێن بە با هاتنیش ئەو شەڕەشەقەی لەگەڵدایە. هەروەها ئەو ناوە لە (ڕەشەماە)یشەوە دێت چونکە ئەو کاتەی ساڵ زەوی لە هەندێ شوێن لەبەر شین بوونی گیاو گوڵ ڕەنگی زەوی ڕەش هەڵدەگەڕێت (ماە) بەواتا مانگ، کەواتە (ڕەشەمانگ) یاخود (ڕەشەمە) ئەو ناوە (ڕەشەمێ یان ڕەشەمە) لە ناوێك و ئاوەڵناوەکەی پێکهاتووە (ڕەش + مێ) (ڕەش + مە) ئەو مانگە (29) بیست و نۆ ڕۆژە بەلام بە چوار ساڵ جارێك دەبێتە (30)سی ڕۆژ لەبەر ساڵی پڕ. مانگی ڕەشەمێ پێنج (5) ڕۆژی سەرەتای لێ بەر چلە دەکەوێت. دەربارەی چلە لە ڕۆژ ژمێری کوردی جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی تر چونکە حیسابی کوردەواری چل (40) ڕۆژی ناوەڕاستی زستان یان هاوین بە چلە دادەنێت کاتێ (25) بیست و پێنج ڕۆژ

بەسـەر مانگی یەکـەمی زەمتـان دا تێپەڕی واتە لە 25/ی بەفـرانبـار را لەگـەڵ مانگی دووەمی زستـان هەمـووی کە مانگی رێبـەنـدانـە لەگـەڵ (5) پێنـج ڕۆژیش لە مانگی ڕەشەمێ چلەیە کەواتە چلەی زستان لە 25/ی بەفرانبار تا 5/ی ڕەشـەمێ بۆ چلەی (هـاوین)یش بەو شێـوەیـە چل (40) ڕۆژی ناوەڕاستی سێ مـانگی هاوین چلەی هاوینە لە 25/ی پووش پەڕ تا (3)ی گەلاوێـژ. گەلاوێـژ تەنهـا (3) ڕۆژی بەر چلە دەکـەوێت چونکـە مانگەکانی هاوین هەر سێ یـان (31) ڕۆژن. بۆیـە لە ڕۆژ ژمێری کوردیدا تەنها یەك چلە هەیە لە هەر یەکە لە زستان و هاوین بەڵام هەنـدێ کەس دووای ڕێـچکـەی ڕۆژ ژمێـری عارەبی کەوتوون بەوەی چلەی گەورەو چلەی بچوك بەکار دەهێنن لە ڕۆژ ژمێـری کوردی کەوا (40) ڕۆژی بەرایی زستـان یان هاوین بە چلەی گەورە دادەنێن وچل ڕۆژی دوواییش بە چلەی بچوك دادەنێن.

جا ئەگـەر بەو شێـوەیـە بێت ئەوە چلەی زستـان لەگـەڵ حیسـاب کردنی حەوتـەکـان ناگـونجێ چونکە حەوتەکان بریتین لە چەنـد هەفتـەیـەك کە تیـایـاندا ئاوو هەوا یاخود کەش زۆر سارد دەبێت وپلەی گەرمی زۆر نزم دەبێتەوە کە لە هەفتــە هەرە زۆر ساردەکـانی ساڵن جا ئەگـەر چلەی گەورەو چلەی بچـوك هەبێت ئەوە حەوتــەکــان تەنهــا سێ یـانیـان بەر چلەی گەورە دەکـەون بەتـەواوی وئەوانی تریش بەر چلەی بچوك دەکەون. چلەی گەورەی زستان ئاوو هەوای زۆر ساردە بەڵام چلەی بچـوك هەنــدە سارد نیـەو بەرەو بەهـاریش دەچێت. جا ئەگـەر سێ حەوتـەی سەرەتـا بەر کۆتـایی چلەی گەورە بکـەون واتـە بەر نزیك بوونــەوەی سەرەتـای چلەی بچـوك دەکـەون و ئاوو هەوا کەمتر ساردەو حەوتەکانی تریش بەر چلەی بچوك دەکەون بەتـایبـەتی حەوتـەی (بەرخندەو مێرەم) کە لە حەوتە هەرە ساردەکـانن دەبێ بکـەونە ناوەڕاسێ چلەی گەورە جا گەر چلەی گەورەو بچـوك هەبێت ئەوە لەگــەڵ حەوتــەکـان ناگـونجێن وە لەبـەر ئەوەی ژمێرە کردنی حەوتەکان تەواوەو دەکـەونـە ناوەڕاستی چلەی زستـان ئەوەش ئەو کاتـە تەواو دەگونجێت کە چلەی زستان چل (40) ڕۆژی ناوەڕاست بێ گەر وانـەبێت ئەوە ژمێرە کردنی هەمو حەوتەکان هەڵە دەردەچێت هەروەهــا جێگــەو بەرواری هەر حەوتـەیـەك تەواوە جا بۆیــە دەبێت لە ڕۆژ ژمێــری کوردیدا گەورەو بچـوك نەبێت و شوێن پێی کەس نەکـەوین چونکـە هەر شوێـنـێ لەگــەڵ هەر شوێـنـێکی تر بە گوێــرەی شوێنی جوگــرافی ئاوو هەوای جیـاوازی هەیــە کەواتـە دەبێت حیسـاباتی جیا جیاشیان هەبێت سەرەڕای ئەوەش دەبێت تێکـرایی ئاوو هەوای وڵاتـەکەمان وەربگرین وحیسابی بۆ بکـەیـن نەوەك بەشێکی لێ جیـا بکـەینــەوەو لە گەڵ حیسـابێکی تر بەیەکیان بگەیەنین، گەروابێت لەگەڵ ڕۆژ ژمێرێکی ڕێك ناوگونجێت.

حەوتە: دەربارەی ناوی (حەوتە) لەگەڵ (هەفتە) جیاوازە هەفتـە بریتی لەو حەوت ڕۆژەی بە درێـژایی ساڵ دووبارە دەبێتـەوەو بە شەممە دەست پێ دەکات و بە هەینی کۆتایی دێت. بەڵام (حـەوتـە)ەکـان تەنهـا لە ماوەیـەکی دیاری کراوی سالــدا هەن کە کەش لەو ماوەیــەدا زۆر سارد دەبێت و دەکـەونـە چلەی زستـان کە هەریـەکەیان حەوت ڕۆژەو مەرج نیـە بە شەممـە دەست پێ بکـەن و لە هەینی کۆتایی یان بێت بۆیە لە ژماردنی ڕۆژگاری ساڵ بەکاریان دەهێنن لەبـەر زۆر ساردیو گرنگی ئەو ڕووداوە سروشتی و ناسرو- شتیانەی کە لێ یان دا ڕوویان داوە، جا ئەوە وایان کردووە ببنــە هۆیــەکی ناسینــەوەی کات و دەمی ساڵ ئەوانـەش بریتین لە چەنـد حەوتـەیـەك کە هەریەکە ناوی تایبەتی خۆی هەیە، ناوەکان وژمارەی حەوتەکان لە هەمو شوێنێکی وڵاتـەکـەمـان وەکـو یەك نیە چونکە وڵاتەکەمان فرانـەوەو لوتکـە شاخی زۆر بەرزو شیـوو دەشتی کاکی بە کاکی تیـادایە کەوا دیارە ئەوانەش کار دەکەنە سەر دابەش بوونی نا چۆن یەکـانــەی ئاوو هەوا، بێ گومـان لوتکـە شاخی بە بەفـر داپۆشراوو لاپاڵ و قەدپاڵ و نسارو دەشتی گەورەو فراوان ئاوو هەوای زۆر ساردو فێنـك و گەرمیـان دەبێت. ئەو ناوچـەیـەی ساردە لە کاتێکی دیاری کراوەوە ناوێکی هەیـە، بۆ حەوتـەی شوێنـە فێنك و گەرمەکانیش

هەریەکەیان لە کاتێکا ناوێکیان هەیە . ئەو هۆیانە وایان کردووە لە شوێنی سارد زووتر دەست بە حیسابی حەوتەکان بکرێ درەنگتریش کۆتایی‌یان پێ بهێنرێ بە حەوت حەوتەی دوای یەك لە هەرێمە فێنکەکان و فێنکەکانیش زووتر لە هەرێمە گەرمەکان ئەوە وای کردووە ژمارەی حەوتەکان لە هەرێمە ساردەکان زیاتر بێت لە هەرێمەکانی تر ، ناوەکانیشیان بە پێی کات لەگەڵ هەرچیێکی تر جیاوازی هەبێت . سەرەرای ئەوەش لە کۆندا هۆی راگەیاندن نەبوە کە وا بکات ناوی حەوتەکان وەکو یەك بێت و لە رۆژێکی دیاری کراویش بەیەکەوە دەست پێ بکەن ئەوە ئاشکرایە نەبوونی رێگەی هات و چۆو هۆیەکانی گواستنەوە راستەوخۆکاری هەیە ، کەوا خەڵکی هەرێمە لە یەکتر دوورەکان بە ساڵ یەکتریان نەبینیوە مەگەر بەدەگمەن نەبێت تا زانیاری یەکتر لەو بارەیەوە بزانن بۆ نمونە دەبینین ئیمرۆ حەوتەیەك لێرە ناوێکی هەیە بە پێی ناوچەیەی وا تیان . لە شوێنێکی تر لەوانەیە پاش چەند رۆژێکی تر بە هەمان ناوەوە دەستی پێ بکەن لەگەڵ ئەوەش ناوچەی وا هەیە هەفتەیەك لە ئێمە زووتر بە هەمان ناو بە سەریدا تێپەریون یان وا دەبێت ناوەکان وەکو یەك نینە بەڵام هەمان واتا دەگەیەنێ و لە جێگەی هەمان حەوتە بەکار ـ دەهێنرێت سەرەرای هەموو ئەوانەی باسمان کردن پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین کەوا ناوو بەرواری ئەو حەوتانە یەکێ لە یەکێکی تر وەرگیرتووە یان لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی تر بە هۆی قسەوزارەوەیە لەوانەیە هەندێ لەبیربکرێت یان زیاد بکرێت وە یاخود کابرای قسەکەر لەوانەیە زانیاری‌و ئارەزووی خۆی تیا بەکاربهێنێ ، چونکە نەنووسراوەتەوەو تۆماریش نەکراوە ، کەواتە بێ گومان ئاڵ و گۆڕو زیادو کەمی تیادا بووەو تا ئێستاش نەوە دوای نەوە هاتووە . لەوانەیە لە هەندێ شوێن یان لای هەندێ کەس چەوتیش ببێت هەر بە راستی دەزانن چونکە کابرا وای وەرگرتووەو لێهاتووە ئەگەر لەسەر قسەی خۆی سووریش بێ ناحەقی نی‌یە سەبارەت بەوەی کە کابرا لەوە دڵنیایە کە خۆی هەڵەی لێ ناکات و باوەریشی بەو کەسە بەهێزە کە لێ‌ی وەرگرتووە . جا ئەگەر حەوتەکان زۆربن وەیا کەم بن ، ناوەکانیان راست یا چەوت بن ، کاتەکەی زوو دەستی پێ‌کردبێت یان درەنگ ، سەرەرای پاش و پێشخستنی ناوەکانیان جگە لەوانەش چەند رۆژێکی سنووردار هەیە لەناو هەندێ لەو حەوتانە کە هۆکاری سروشتین یاخود داستانن زۆر کەس ئەو رۆژانەش هەر بە حەوتەکان دادەنێن و لەگەڵیان دا رێکیان دەخەن وەکو ئەوەی ـ برایمی مەلای زێندینان ـ رۆژێکە لە رۆژ هەرە ساردەکانی حەوتەی (بەندو بەندرخە)دا کەوا ئەو کابرایە پاڵەوانی داستانێکە بەناوی خۆیەوە ، جا ئەو رۆژە زۆر کەس بە یەکێك لە حەوتەکانی دادەنێن ، یاخود بەفری پیرەژنێ رۆژێکە لە زۆر شوێن حیسابی حەوتەی لەگەڵ دەکرێت ، هەروەها پشکووی هەواو پشکووی ئاوو پشکووی زەوی هەر بەو شێوەیە بە حەوتەیان دادەنێن . لە دوو حەوتەی پیت و پاڵۆز ـ دا دەڵێن (پیت و پاڵۆز ساڵ بو ئاڵۆز) هەر لەو کاتەشە پشکووی هەوا لە حەوتەی (پیت) وپشکووی ئاو لە حەوتەی (پاڵۆز)دا دەبێت چونکە پشکووی هەوا یان پەنگری هەوا لە یەکەم رۆژی مانگی رەشەمێ یەو حەوتەی (پیت)یش لە نێوان 27/ی رێبەندانێ تا 3/ی رەشەمێ یە پەنگری ئاویش دەکەوێتە (پاڵۆز) لە 4 ـ تا 10/ی رەشەمێ یە ، بەوە دەردەکەوێت کە پشکووەکان (پەنگرەکان) حەوتەنین بەڵکو هەریەکەیان دەکەونە کاتی یەکێ لە حەوتەکانی (پیت و پاڵۆز) ، یاخود لە حەوتەی (خدر)دا دەڵێن (کە هات خدر عارد دەبێ پەنگر پەیدا دەبێ کەنگر) بەوە دەرکەوت پشکووی زەوی لە حەوتەی (خدر)دایە نەوەك حەوتەیەکی سەربەخۆبێت وە پشکووی زەوی دەکەوێتە 14 ـ 15/ی رەشەمێ ، ئەوەش روونە کە حەوتەی خدر دەکەوێتە نێوان 11 ـ 17/ی رەشەمێ دەربارەی ناوی حەوتەکانیش هەروەکو وتمان لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر دەگۆرێت یان هەمان واتایان هەیە وە یان بە چەند پیتێك لە یەکتر جیاوازان یان پاش و پێشیان هەیە . دەربارەی ژمارە ـ شیان لە هەندێ ناوچە ژمارەیان (8) هەشتە وە لە شوێنی تر ژمارەیان زیاتر

، بەلام بەگوێرەی ڕێکخستن و تەواوی کاتەکاندا ژمارەیان (10) دەیە کاتێکیش دەست پێ دەکەن کە دوو هەفتەی تەواو بەسەر زستان تێپەری کەواتە لە 15/ی مانگی بەفرانبار واتە مانگی دەیەمین ، بەلام هەندێ شوێن لە 10 ـ 15/ی بەفرانبار را دەست پێ دەکەن وە بە شێوەیەکی ڕێکخستنی تەواو حەوتەکان بەو شێوەیەی خوارەوە رایزدەکرێن و بەرواری کاتی ڕێکەوتیشیان لە بەرامبەریانە :ـ

1 ـ بێل 15/ی بەفرانبار تا 21/ی بەفرانبار مانگی بەفرانبار مانگی دەیەمینی ساڵەو یەکەمین مانگی وەرزی زستانە کە تیادا بەفر دەبارێ لە شوێنە زۆر ساردەکانی وڵاتەکەماندا جا لە گەڵێ شوێن لەو دەمەی ساڵدا بەفر زۆر لەسەربانی خانووەکان کۆدەبێتەوە، جا ئەوەش پێویستی بە لابردن هەیە بەهۆی بێلی تایبەتی (بێلە بەفر)کە بەفری پێ رادەماڵن لەسەر بانەکاندا ، بۆیە بەو ناوە ناو نراوە چونکە لەو ڕۆژانەدایە کە بەفرەکە ناتاوێتەوە ، بۆیە بە کرداری راماڵینی بەفر هەڵ ـ دەستن بە (بێڵ)، ئەو کاتەش سەرەتای دەست ـ پێ کردنە بەو کارە تا وەرزی بەفربارین کۆتایی دێت سەبارەت بەوەیە ناوی (بێڵ) لەو حەوتە نراوە .

2 ـ بێڵندە ـ بێرندە 22 ـ 28/ی بەفرانبار .

ئەو دوو ووشەیە هەردووکیان وەکوو یەکن لە واتادا تەنها بە پیتی (ڵ ـ ر) جیاوازن لەیەکتر [بێڵ + ندە] (بێر ـ ندە) ئەگەر بێت و جیاوازی یەکان لە (ڵ ـ ر) دابێت ئەوە وا دەگەیەنێت هەردووکیان یەك ناوبن چونکە لە هەندێ ناوچەدا لەگەڵێ ووشەدا (ڵ) دەگۆرێت بۆ پیتی (ر)، وەکو لە ووشەی (کۆڵان) دەبێتە (کۆران)و ماڵ دەبێتە (مار) . . . وە هەروەها (بێڵ) بوویتە (بێر) کەواتە (بێڵندە ، بێرندە) لە (بێل ، بێر) وەرگیراوە . بێڵندە لەراستییەکدا (بێل بەندە)یە بە کرتاندنی (بە) بۆ ئاسانی سەرزار بێرندەش هەروا لە (بێربەندە) وەرگیراوە . لە کاتێکدا حەوتەی رابوردوو (بێل) بوو بەواتا ئەو حەوتەی بێلی تیاخراوە کارو لەو حەوتەیەش دا کەش ساردتر دەبێت و زۆرجار بۆی هەیە بەفر و بێلەکە لەبەر ساردی بیبەستێت ئەگەر ماوەیەك بێ جوولان بێلەکە بمێنێتەوە ، کەواتە بێلەکە بەندبووو بەستای یان (بەند) دەبێت بە بەفرەکەوە جا ناوی بێڵندە یاخود بێرندە لەوەوە هاتووە .

3 ـ بەند 29/ی بەفرانبار تا 5/ی ڕێبەندان .

لە بەندبوون یان داخران هاتووە بەو واتایەی لەو حەوتەدا ڕێگەی هاتوچۆ دەگیرێ بەهۆی زۆر بارینی بەفرەوەو ئیتر هاتوچۆ نامێنێ تا تێپەربوونی مانگی ڕێبەندان، واتا لەو حەوتەیەدا (ڕێبەند بوون) دەست پێ دەکات کەوا سەرەتای مانگی ڕێبەندانە .

4 ـ بەرخندە ـ بەندرخە 6 ـ 12/ی ڕێبەندان .

ئەوە لە راستی یەکەدا (بەرخندە)یە بوویتە (بەندرخە) بەهۆی جێ گۆرکێ ی پیتەکانی ، لە (بەرخ + ندە) کەوا لە (بەرخ بەندە)دا هاتووە بە کرتاندنی (بە) بۆ ئاسانی سەرزار. واتا لەو چەند ڕۆژەدا کەش تێنی ساردایی زۆر زیاد دەکات ئەوەندە سارد دەبێت و کار لە ئاژاڵ دەکات بە تایبەتی ئاژاڵی ئاووس لەوانەیە ئەو ساردییە زیان بە بەرخی ناوسکی ئاژاڵ بگەیەنێ بێتە هۆی لەناوچوونی و بەرهاویشتنی مەرەکە (واتە فرێدانی بەرخەکە بە مردوویەتی) جا بۆیە دەڵێن (بەرخ بەندە) واتە لەبەر ساردی بەرخ لەناو سکی دایکی لەساردیان دەمرێت .

5 ـ مێرەم 13 ـ 19/ی ڕێبەندان .

لە چەند ڕۆژێکی ئەو حەوتەیە کەش دەگۆڕێت خۆش دەبێت و لەپڕێکەوە ساردیو ستەمی دایدەگرێتەوەو باو باران و ڕەهێڵە هەندەی تر ساردی دەکات وزۆر حەستەم و دژی دەکاتن ، لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ئەو حەوتەیەدا ژنێك (مێرەم) ناودەچێتە کۆڵێ (جل شوشتن لەسەر کانیدا ، ئەو کاتەی مێرەم چووە کەش خۆش بوە چاوەروانی ڕۆژێکی وا دژی نەکردوە بەلام دوایی بارانی بەسەردا باریوەو ڕەشەباو بۆران هەڵی کردوە ڕێگەی لێ گیراوەو شەوی بەسەردا هاتووە ، پاش گەڕان و سووڕان و ماندووبوونەکی زۆر هیچ پەناو پەسیوەکی نەدۆزیتەوە کە خۆی تیا حەشار بدات لە تەڕو ساردی

رزگــاری بێت تەنهــا ئەوە نەبێت کە لاشـەیـەکی رەشـە وولاغـێــك دەبـیـنـێ و ووڕگی هەڵــدەدڕێت و دەچێتــە ناوی‌یـەوە، بۆیـە بەو حەوتـەیە دەڵێن (مێرەم). لە هەندێ شوێن دەڵێن (سـەرمـای پیرەژنێ)، هەندێ جاریش هەر بەکەیان بە حەوتەیەکی سەربەخۆ دادەنێن.

6 ـ ئۆغەن 20 ـ 26/ی ڕێبەندان.

حەوتـەی شەشـەمـە ناوی مێردی مێـرەمێ‌یـە لە حەوتەی رابـردوو کاتێ مێـرەم دەچێتـە کۆڵ کردن ئیدی ناگەڕێتەوە (ئـۆغەن)یش کاتێ لەو حەوتەیەدا دەگەڕێتەوە بەوە دەزانێ بۆیە بەدوایا دەچێت کەوا کەش و هەوا خۆشتر دەبێت پاش گەران بەمـردوویی مێـرەم دەدۆزێتـەوە لەناو لاشەی رەشە وولاخێــك . بۆیــە ووتـوویـانـە (مێـرەم دەبینێ ئۆغـەن دەشکێنێ) واتە لە حەوتەی مێرەمێ ساردی‌و تووشی هەیە بەڵام حەوتەی دوایی کە ئۆغەنە ساردی‌و ناخۆشی دەشکێنێ.

7 ـ پیت 27/ی ڕێبەندان تا 3/ی رەشەمێ.

برینی‌یە لە هەفتەی نۆیەمینی زستان و هەفتەی حەوتەمینی حەوتـەکـان دەڵێن (پیت ئەگەر لە خوێ نەڕیت بە کەرتك دەبـیـت ، پیـتێ پیت کرد ساڵی فیت کرد) بە واتــا تا ئەو حەوتـەیـە ئەوەی لە ساردی‌و دژی رزگـاری بوو ئەوە رزگار بوو بێ نەخـۆشی‌و نارەحـەتی ئەوەی تریش بەو حەوتـەیـە کۆتـایی بە نارەحـەتی ساردی دەهێنێ و ئیتـر لەمەودوا ئاوو هەوا خۆش دەبێت .

8 ـ پالۆز ـ پالۆس 4 ـ 10/ی رەشەمێ.

هەردوو یەك ناون تەنهـا بە (س ـ ز) جیـاوازن . حەوتـەی دوای پیتــە ناویـشی هەردەم لەگــەل (پیت) دێت دەڵێن (پیت و پالـۆز ساڵ بوو ئالۆز) یان (پاڵ دەپالێنێ) بە واتای گۆڕانی ئاوو هەوا هەروەها پەنگری هەواو ئاو یەك لە دوای یەك دەکـەونـە حەوتـەی (پیت و پالۆز) چونکە لە حەوتەی (خـدر)ی دەڵێن (کـەهات خدر عارد دەبێ پەنگـر پەیـدا دەبێ کەنگــر) کاتێ پەنگـری عارد (پشکـووی زەوی) لە حەوتـەی خدربێت ئەوە بێ گـومـان پەنگری ئاوو پەنگری هەوا دەکــەونــە پێشتـرو هەر یەکـەیـان دەکـەونـە یەك لە

حەوتـەکـانی پیت و پالۆسە چونکە بەر لە حەوتەی (خدر) حەوتـەی پالـۆسـەو پیتیش لە پێش پالـۆس دایـە . کەواتە حەوتـەی پیت پەنگـری هەوای تیـادەکـەوێت و حەوتـەی پالـۆسیش پەنگـری ئاو، بەووەوە حەوتەی خدر پەنگری تیا دەکەوێت ، بەگوێرەی حیسابی هەندێ حیسابگر پەنگری (هــەواو ئاو) ناکـەونـە (پیت و ـ پالـۆس) چونکـە پیت بە هەفتـەی حەوتەمی زستان دادەنێن و پالۆسیش بە هەفتەی هەشتــەم ، مێــرەم و ئۆغــەنیش بە هەفتــەی پێنجـەم و شەشـەمی زستان دادەنێن بەڵام راستیەکەی پیت و پالۆس دەکـەونـە هەفتـەی نۆیـەمین و دەیەمینی زستان ، مێرەم و ئۆغـەنیش دەکـەونە هەفتەی حەوتەم و هەشتەم . مامۆستا عەبـدول ـ رەحمـانی زەبیحی لە قاموسی زمانی کوردی‌دا دەڵێ (بـەنـد) هەفتـەی پێنجـەمی زستـانە (بەندرخە)ش هەفتەی شەشەمی (بەندرخە هەفتەی شەشەمی زستانە بە حیسابی کوردەواری لە مەڵبەندی هەولێرو دەکەوێتە نێوان بەنـدو مێـرەم)، کەواتـە ئەگـەر بەندرخە هەفتەی شەشەم بێت و بەنـد هەفتـەی پێنجـەمـە مێـرەمیش دەبێتە هەفتەی حەوتــەم وە هەروەهـا دەڵێ ئۆغـەن هەفتـەی هەشتـەمی زستـانـەو دەکـەوێتـە نێـوان مێـرەم و پیت) . کەوابـو پیت هەفتەی نۆیەمی زستانە بەووەش پالۆس هەفتەی دەیەمینە .

بەڵام هەروەکـو ووتمـان ئەو حەوتـانە لەکاتێك را دەست ـ پێ دەکەن کە دوو هەفتە بەسەر زستاندا تێپەربن، ئەو کاتە دەردەچێت (بـەنـد) کە هەفتـەی پێنجـەمی زستانە دەبێتە حەوتـەی سێ‌یـەمی حەوتـەکـان، بەنـدرخـەش هەفتەی شەشەمی زستانە دەبێتە حەوتەی چوارەمی حەوتەکان. بەو شێـوەیـە. ئەوانی تریش . . . مێـرەم حەوتـەی پێنجەم ، ئۆغـەن حەوتـەی شەشەم پیت حەوتەی حەوتەم پالۆسیش حەوتەی هەشتەم. بەووەوە بەشێوەیەکی تەواو حەوتەکان لە دوای‌یەکن تەنها چوار حەوتە ماوە ئەوانیش (بیل ، بیلندە ـ خدر، ئەلیـاس)ن ئەوانــەش هەریـەکـە جێگـایـان زۆر ئاشکرایە چونکە (بێل) حەوتەی یەکەمە دەکەوێتە هەفتەی سێ‌یـەمی زستان (بێلندەش) لە دوای بێلە کەواتە ئەویش هەفتەی چوارمی زستانەو دەبێتە حەوتەی.

دووەمی حەوتـەکـان، (خـدرو ئەلیـاس)یش حەوتەکانی کۆتـاییـن حەوتـەی خدر هەفتەی یانزەمینی زستان و دەبێتە حەوتـەی نۆیەمی حەوتەکان ئەلیاسیش دەکەوێتە هەفتەی دوانزەمین کەواتە حەوتەی دەیەمینی

حەوتـەکانە جالە کاتێکا پەنگری هەوا ڕێکەوتی (1/ی ڕەشـەمێ‌یـە کەواتـە دەکـەوێتـە حەوتەی پیت لە (27/ی ڕێبـەنـدا تا 3/ی ڕەشـەمێ هەروەهـا پەنگری ئاو (8/ی ڕەشـەمێ)یـە دەکـەوێتـە پالۆس (4 ـ 10/ی ڕەشەمێ)، پەنگـری زەوی (15/ی ڕەشـەمێ) یە دەکـەوێتە حەوتەی (خدر) (11 ـ 17/ی ڕەشەمێ).

9 ـ خدر 11/ی ڕەشەمێ ـ 17/ی ڕەشەمێ.

بریتی‌یـە لە هەفتـەی یانـزەمینی زستـان حەوتـەی نۆیەمی حەوتـەکـان هەمیشـە ناوی لەگـەڵ ئەلیـاس پێکـەوە دێت (خدرو ئەلیاس) کە دەڵێن (خدرو ئەلیاس ساڵ خلاس).

10 ـ ئەلیاس 18 ـ 24/ی ڕەشەمێ

هەفتەی دوانزەمینی زستان و حەوتەی دەیەمینی حەوتەکانە واتە حەوتەی کۆتایی‌یە، هەروەك و ووتمان خدرو ئەلیاس هەردەم ناویـان پێکـەوە دێت (خـدرو ئەلیـاس ساڵ بوو خلاس) بۆیـە وا دەڵـێن چۆن حەزرەتی خدرو ئەلیـاس فریای خەڵك دەکەون لە کاتی ناخۆشی و تەنگانەدا ئاواش لەو دوو حەوتەیە خەلك لە دەست سەرماو سۆڵەو ناخۆشی زستـان ڕزگـار دەکـەن. واتـە لەو دوو حەوتەیەدا ئاوو هەوا خۆش دەبێت بە تەواوی، (کە هات خدر عارد دەبێ پەنگر پەیـدا دەبێ کەنگـر) وەهـەروەها (کە هات ئەلیاس سەرما دەبێ خلاس) ئیتـر ئەو ناخـۆشی و زەقیقـە ـ تەی پێشتـر نامینێت. حەوتـەی ئەلیـاس لە 24/ی ڕەشـەمێ کۆتـایی دێت ئەو کاتـە خولێکی ساڵ بەرەو کۆتـایی دێت وچەنـد ڕۆژێـکـی کەم دەمـینێ بۆ خلاس بوون تاکـو خول نوێ دەبێتـەوەو سەرەتـای ساڵی نوێ بە ڕۆژ ی نەورۆز دووبـارە دەست پێ دەکاتەوە جا بۆیە دەڵێن (کە هات ئەلیاس ساڵ دەبێ خلاس). جا پێش ئەوەی بگـەینـەوە نەورۆز پێنـج شەش ڕۆژ دەمـێنێ کە خۆر هەمـوو ڕۆژ ی جێگـەی ئاوا بوونی خۆی دەگـۆڕیت بە برێکی زۆر بەو چەنـد ڕۆژەش دەڵێن (بـازەبەران) لە ڕاستی‌یەکەیدا (باز بردن)ە بە واتای بازدان لە شوێنی خۆی بۆ شوێنێکی تر. بەو جۆرە کۆتایی بە مانگی ڕەشەمی دێت کە مانگی کۆتایی ساڵە 29 ڕۆژە لە ساڵی پریش دەبێتـە 30 کاتێ ئەو مانگـە کۆتـایی هات ئەنجا بە ڕۆژ ی نەورۆز ساڵی نوێ دەست پێ دەکاتەوە.

منیش لێـرەدا کۆتـایی بە باسەکەم دەهێنم سەرەڕای ئەوەی هەوڵی ئەوەم داوە بەرێـك و پێکی بیهینمـە بەر، بەڵام لە وانـەیـە لە هەڵـە بە دوور نەبێت چونکە زانیاری یەکانم لە دەمی خەڵکەوە بیستووە، زانیاری وانیش هەمووەکو یەك نەبـووە. جگـە لەوەش تەنهـا زانیاری یەکی کەمە چونکە زانیـاری هەموو ناوچەیەك نیە لە سەرانسەری کوردستاندا بەڵکـو زانیـاری بەشێکی کەمی وڵاتـەکـەمانە وە هەروەها نووسینی شتێـك دەربارەی ئەو باسەم لا دەست نەکەوتووە تەنهـا ئەوە نەبێت بۆ چۆنیـەتی ڕیـزکـردنی و ڕێکخستنی مانگـەکـان سوودم لە قامـوسی زمـانی کوردی عەبدول ڕەحمـانی زەبیحی و فەرهـەنگی کشتـوکـاڵی مەعـروف قەرەداغی وەرگـرتـووە، هەروەهـا بۆ ڕیـزکـردنی حەوتـە کانیش سودم لە قاموسی زمانی کوردی وەرگرتووە.

جا بەو پارچـە نووسینـە هیوادارم کەمێك لەو بابەتم ڕوون کردبێتـەوە یانـە خۆ ئەو باسـەم سەرنجی هەندێ کەسی وا ڕابکێشێ کە لەو بابەتەوە شتێ دەزانن و بە بیریان بێتەوە کە ئەو بابـەتـە کەلـەپورێکی زانیاری گەلەکەمانە پێویستی بە پاراستن و لێ کۆلینـەوە هەیـە وە هیـوادارم ئەوەی هەڵـەیە ڕاست بکرێتەوە بۆ بەرهەم هێنانی ڕۆژ ژمێرێکی کوردی ڕێك.

بنوارە :ـ

---


قامـوسی زمـانی کوردی هەردوو بەرگ دوو بەرگ عەبدول ڕەحمان زەبیحی لاپەڕەکانی

ـ فەرهەنگی کشتوکاڵ.

مەعروف قەرەداغی مەردۆخی دوو بەرگ

ـ ڕۆژمێری (پیرەمێرد ـ هاوسەر ـ ساڵنامەی ئاشتی).

# ژیانی کوردەواری

دانانی : توما بوا
لێکۆڵینەوەی : عبدالرقیب یوسف

کتێبی ژیانی کوردەواری یێ دانەری فرنسی تومابوا یە بەرێـز کاك حەمـە سەعـید حەمـە کریم لە عەرەبی یەوە کردوویەتی یە کوردی ولە ساڵی 1980 ولە 289 لاپەڕەدا (دەزگـاری رۆشنبیـری‌و بڵاوکـردنـەوەی کوردی) چاپی کردووە. بێ گومـان ئەم کتێبـە زور بە نرخـە چونکـە زانیـاریـەکی زۆری تێـدایـە دەربـارەی : رەگەزی کوردو ژیـانی کۆمـەڵایـەتی لە کوردستـان و ، ئایین وئەدەبی کوردی هەنـدێـك مەوزوعی تریش . توما بوا هەندێ لەو زانیـاریـانـەی لە سەرچـاوەکـان وەرگرتووە وهەندێکیش لە کوردستـان بەخـۆی ، هـنـدێك جاران زانیاری زور وردی تێـدا دەکـەوێتـە بەرچاو کەجێگەی رێزگرتنە بەڵام هندەك شتی کزیش دکـەویتـە بەرچـاوکە لەم هەڵسـەنگـانـدن و لێکـۆڵینـەدا هنـدەکیـان دیـار ئەبن . دەزگـای روشنبیری‌و بڵاوکـردنەوەی کوردی داوای لێ کردم کە هەڵسەنگاندن و لێکـۆڵینێـك بنـوسم دەربـارەی ئەم کتێبـە بەڵام لە بەر نە بوونی کات نەم توانی کتێبـەکـە هەمـوی بەوردی بخوێنم تەنیـا (100) لاپەرەم لێ خوێندەوە وتێبینیەکانم پەیوەندی بەم سەد لاپەرەوەیە کە دەگاتە کوتایی بەشی چوارەم ، ئیتر داوای لێ بوردن ئەکەم .

تیبینی ورەخنـەکـانمـان هەمووی ناگەرێتەوە وەرگێری کوردی بەلکـو هـنـدەك لەو رەخنـانـە لەوەرگێـری عەرەبی ئەگرێ وهندەك لە دانەریش :

1 ـ ئەوەی بۆم روون بووە لە خوێـنـدنـی ئەم (100) لاپـەرەیـە ئەوەیە کە دەبوو وەرگێر وردتر ئەم کارەی کردبایەو ناوی شارو جێگـایـەکـانی راست کردبـایەوە چونکە ناوی زۆریـان لێ تێك چووە کە بەلاتینی نوسراوون یان بلێن لە ئەسلە فرەنسی یەکـەیـدا بە هەڵـە هاتـوون، ئەگـەرچی ئەمـەش پێـویستی یەکی سەر شانی وەرگێری عەرەبی یەکە بوو. بۆ نمـوونـە ئەگـەر یەکێـك لە منی پرسیبـاو بیگـوتبـا (مالاتای) لە کوێیە من وەڵامم نە ئەزانی ، یان دەم گوت شاری (مـەرتیـا) ـ مەلـەتێی ـ ملطیـە)یـە کە شارێکی گەورەی کوردستـانی تورکی یە ونەم ئەزانی مالاتای (مەلتا ـ ملطا)یە لە نیزیك دهوك کە زۆر جارم دیتوە . ئەگەر یەك زۆر شارەزایێ مێـژ وو جوغرافیایێ کوردستان نەبێ نازانێ (گـارزان)(1) (وکیماه) لەکوێنە ؟ تا ئێستا دانەرو وەرگێرە کوردەکـان بە شێـوەی گشـتـی بایـەخ نادەن بە ناوە مێـژ وویـەکـان و ناوە جوغرافیەکان هەروها ناودارەکانیش خۆیـان مانـدوونـاکەن وەکو دانەرو وەرگێرە عەرەبەکان بۆ روون کردنی ئەو ناوانـە بە پەراوێـزی پر سوود ، ئەمـەش بەلگەیەکە بۆ دوا کەوتنمان وسادەیی کتێبەکانمان لە بارەی شێوەی ئەکادیمی و بەحسی علمی یەوە .

2 ـ وەرگێـری کوردیـیـەکـە دەسکـاری ناوی کتێبـەکـەی کردووە لە «مـع الأکـراد»ەوە کردوویـە بە «ژیـانـی کوردەواری» . ئەوەی راستی بێ دەبـوایـە بنـووسێت « لە گەڵ کوردەکـان» بەبێ دەسکـاری کردن، هەروەکـوو دانەرەکەی : (تومابوا) ئەم ناوەی لێ ناوە بۆچی دەسکاری ناوی کتێبی خەڵـك بکـەین وبیگـۆرین بە تەواوی‌و یان هندێکی لەسەر زیاد بکەین؟ وەکو بەرێز کاك سەعید ناکام کە بەرگی چوارەمی سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی وەرگێراوە بۆ کوردی وها لە سەری نووسیوە

«کورد لە مێژ ووی دراوسێکان دا .
سیاحە تنامەی ئەولیا چەلەبی» .

من ئەم جۆرە دەسکاری کردنە بەراست نازانم، هەروەها وەرگێر کاك حەمە سەعید دەسکاری ناونیشانی بەشی سێیەمی کتێبەکەشی کردووە : «کیف یعیش الأکراد» کردوە بە «ژیانی کوردەواری».

3 ـ لە ل 14 دا دەربارەی بەرزایی شاخی (نەمرود) (3000م) هاتووە لە باتی (3200م) تەماشا تەرجەمەی عەرەبی ل (3) بکە دوورنییە هەڵەکە چاپی بێ ، لە گەل ئەمەش لە هێندێك سەرچاوە تورکییە نوێیەکاندا بەرزایی ئەم شاخە لە (3050م) تێپەر نابێ وەکو کتێبی :

HUSEYIN SARACOOGLU :

TURKIYE COGRAFYASI UZERINE ETUDLER DOGUANADOLU

بەرگی (1))، ل 259 استانبول 1956 . دوورنییە دانەر بەخۆی لە بەرزیی شاخەکان دا راست بۆی نەچوبێ وەکو شاخی (ئارارات)کە نووسیویە (5000م) کە لەراستیدا (5165) مەترە یان (5168) مەترە هەروەکو شاخی (سیپان) ئەوەی ئەکەوێتە سەر قەراخی (دەریاچەی وان) راسەری شاری (ئەلجەواز)ێ نوسیویەتی بەرزایی (3500م) بەلکوئی راست ئەوە کە بەرزترە و (4434م) هەروەکو لە هێندێك سەرچاوە تورکی بە نوێیە کاندا نووسراوە . هەروها شاخی (جودی) لە باکووری زاخۆ و لە رۆژهەلاتی جزیرا بۆتانە کە بە (2000م) بەرزی داناوە بەلکو بە (89م) لەمەندە زیاترە، هەروەکو لە سەرچاوە تورکییە نوێیەکاندا هەروها نووسیوە کە پیرەمەگرون (3000م) بەلکو بەلای کەمەوە (500م) زیادترە ولە هندێك سەرچاوەدا ئەبێ بزانین کە جیاوازی دەبێ بە چەند مەترێك ویان شتێکی کەم لە نمرەی بەرزایی جێگە جوغرافیەکاندا لە سەرچاوەکانی نوێش دا . تێبینی یەکی تریشمان ئەوەیە کە باشتر بوو دانەر تومابوا دیاری کردبایە کە مەخسەدی بە شاخی «نەمرود» کام شاخە ؟ چونکە دوو شاخ لە کوردستان بەم ناوە هەیە یەکەم نەمرودی رۆژهەلات کە ئەکەوێتە نك دەریاچەی وان نیزیك شاری (تەتوان) ولە روژ هەلاتی (بتلیس)کە لە سالی (1441) زایینی دا (بورکان)ی لێ هەستا و لە ماوەی (300کم) دیاری ئەکرد . لەسەر شاخەکە دەریاچەیێك هەیە (6000متری دووجایە) دورنییە لە دەمی بورکانەکەدا دروست بووبێ . لە هاوینی 1977دا کەچووم بو ئەو ناوچەیە بیستم کە ئێستاش هەڵم لە جێگایەکی هەڵدەستێ شاخی (نەمرووود)ی تر بابلێین نەمرووودی رۆژئاوا دە کەوێتە رۆژئاوایی رووباری فورات لە ولایەتا (ئەدیەمان) لە ناحیێ (سینجك) بەرزایی (2000م)ە زۆر هەلکەنراوی گەورە گەورە گەورەی دەولەتی کوماگەنKommagen (69) پێش زایینی تا 38 زایینی لە سەرە وهادیارە کوردەکان بەخورایی ناوی ئەم دوو شاخەیان نەکردووە بە «نەمروود» . جا دەبایە تۆمابوا دیاری کردبایە کە نیازی بە شاخی نەمروود کامەیانە . من وا هزر ئەکەم کە نیازی نەمروودی رۆژهەلات بێ لە بەرپلەی بلندایەکەی .

4 ـ لە ل 17 لە پەراوێزدا ئاواز زەنگەنە دەربارەی ناوی «بێنگول» ئەلێ مانای هەزار گۆمە ویان هەزار گوڵە بەلام راست ئەوەیە کە مانای هەزار گۆمە چونکە لە ناوچێ بینگول دا یەك گۆمی گەورە هەیە وەکو دەریاچەیەکی بچکۆلە بە تورکی پێ ئەلێن (GoL BeHRi) و زور گۆمی بچووکیش هەیە وشەش رووبار لێ هەڵدەقولێ و لە ئەفسانەکانی ئەرمەنی دا بهەشت کە لە ئینجیل دا هاتوە بینگولە ئیتر لە بەر ئەمە پێی ئەلێن بێنگول هەروەکو لەم سەرچاوە تورکییە دا هاتووە : HAYAT : TURKIYE ENSIKLOPEDISIB ل (286) سالی 1970 . هەروها (دائرة المعارف الاسلامیە)ش باسی «بینگول» دەکات . بینگول یش ناوێکی نوێ نییە بەلکو بەلای کەمەوە لە سەدەی شانزدەهەمدا هەبووە چونکە شرفخانی بتلیسی مێژ وونووس ناوی لە (شرفنامە ل 464)دا هێناوە .

(چاپی قاهرە بێ فارسی) بە لام لە سالی 1945 دا ئەم ناوە لە شاری (چەپەقچور) نرا چونکە بۆچەق (مرکز)ێ ولایەتی بێنگول کە جاران تەنیا ناوی ناوچەکە بووە لە فۆلکلوری کوردیشدا ناوی بینگوڵ زۆر هاتووە .

5 ـ ل 27 : دانــەر ئەڵــێ لە کوردســتــان داری سەروو سنەوبەر (نادر) نییە . . من ئەمە بەراست نازانم بەلکوزۆر کەمەو تا ئێستا نەمان زانیوە داری سنوبەر هەبێ لە غەیری سێ جێگــە لە کوردستــان . . زاویتــەو ئەتــروش لە . ناوچــەی بادینـان و(گـەڵیی بێنـات) لە ناوچەی (بۆتان) . (3) دەربـــارەی بوونی درەختی سەرویش نەم زانیــوە کە هەبێ بەلکو هەڤرست (عرعر) هەیە کە لە فەسیلەی سەروە .

6 ـ لە (ل 7 عەرەبــی)دا دەربــارەی مەعــدەنــی مس لە کوردستــان دا هاتــوە : «وقد وجـد منه ایظ في پالو (PALU) في ضواحي وان عقـره» . (واو)ێ عطف لیـره دا کەوتوە ، راستی‌یەکەی ئەوەیە . « . . . وفي ضواحي وان وعقره» وا دیــارە وەرگێــری کوردی کاك حەمـە سەعیـد هەستی پێ کردوە وخوی لە هەڵەکە رزگار کردوە تەماشا ل 23 بکە .

7 ـ لە ل 27 دا ناوی «کیمیـاە» هاتــوە بەخـەلـەتی لەباتی «کیمــاە» لە ل 7 عەرەبییــەکــەیــدا مەخســەدی شاری (کـەمـاخ)ە کە مەرکەزی قەزاییکی ولایەتی (ئەرزنجان)ە لە کوردستـــانی تورکییـــە دا ودەکـــەوێتـە سەر رووبـاری (قەرەسو) کە لقێکی رووباری فوراتە ، هەروها دەکەوێتە رۆژئــاوی ئەرزنجــان ولــە سالی 1965 دا نیشتــوانی (1800) کەس بوو . مەعــدەنی قورقــوشم (رصـاص)و چەنـد مەعـدەنێکی تری لێ هەیە . ناوی کیماە یش هەر راست نیـە ودەبێ لە تورکی وەرگیـرابێ بەلام پیویست بوو چی وەرگێــری عەرەبی و چی وەرگێـری کوردی راستیـان کردبــایـە وجێگـاکـەشیـان دیـار کردبـایـە بۆ ئەوەی ناوی شارەکــانی کوردستــان بە خەلـەت نە کەونـە بەر دەستی خوێندەواری کورد . هەروها دوور نییە (گیچی)ش کە لە کتێبەکەدا هاتووە (گەنج)بی کە قەزاییکی بێنگولە .

8 ـ لە ل 24 دا = ل 7 عەرەبی خوشکـە ئاواز لەپـەراوێزدا نووسیــویــە : «ایـلازك اسم مدینه ترکیة أی العزیز» ئیتر وەرگێری کوردی گوتووە : مانای خوشەویستی‌یە . وادیارە مەبـەستی تێنـەگـەیشتـووە کە ناوی شارەکـە بە کوردی «ئەلعەزیز»ە .

ئەلعـەزیـز بە پێنـج کیلۆمـەتـر نیـزیـك شاری خەربوت ـ (خــربــوط ـ حصن زیـاد) هاتــوە ئاواکـردن ومـەرکـەزی ولایەتێکی کوردیی گەورەیە .

9 ـ لە ( ل 34 دێــری 12 )دا هاتــووە دەربـارەی بە خێـو کردنی ئاژەل لە کوردستانی کۆن دا ناوی «کاور» کەوتووە کە لە ل 13 عەرەبی دا « خروف» هەیە وبە کەوتنی مانای عبـارەتی کتێبـەکە تێك ئەچێ دەبووهابایە « . . . بەڵام کاور لە بەر گۆشتـەکـەی» هەروەهـا ئەگـەر (غنم) لە باتی خروف لە عەرەبیەکەیدا هاتبایە جوانتر بوویانی فەصیح تر بو .

10 ـ لە (ل 35 دێری 9) دا هاتووە «شارستانێتی ئەکەدی لە نازو لە یورغان تەپە لە سەر یای نەزیر لە پیرەمەگرون کە کەشتی یەکـەی گلگـامیش لێ وەستـا دیـارە» . لێرەدا ئەم تێبینیان مان هەیە .

أ ـ ناوی (کـرکـوك (عـرفـە)ی) لێ‌فـرێ دراوە چونکـە لە عەرەبی دا وهایە : «الحضارة الأکدیە موجودة في کرکوك (عرفه) في نازو (NAZU) یورغان تەپه وعلی جبل نزیر في پیرەمگرون حیث أوقفت سفینه گلگامیش . »

ب ـ ئامـرازی لێکـدەر (حـرف العطف) لە عبارەتە کەوتوە چونکە ئەبا وهابایە « . . . لە یورغان تەپەو لە سەرچیای نەزیر» .

ج ـ دەبــوایــە دانــەر گوتبــای کەشتی‌ی نوح چونکــە کەشتی‌یـەکـە ێ گلگـامیش نییە بەلام گلگامیش لە نوح (اوتـونبشتم) گەراوە بۆ ئەوەی نهێنی‌ی ژیانی پێشانی بداو بۆ ئەوەی مرۆڤ هەر زێندوو بمێنێ لە سەر رووی زەمین .

ناوی شاخی نەزیر (نصیر ـ نسیر) لە ولاتی گوتو (کورد) لە مەلحــەمــەکـەی دا هاتــووە وهنـدێـك لە زانـایـەکـانی ئەرکێولۆجی بە شاخی پیرەمەگرونیان زانیون . تەماشا ئەم کتێبانە بکە : محمد امین زکي / تاریخ الکرد وکردستان ل 88 ، طه باقـر وفؤاد سفـر / المرشد الی مواطن الآثار والحضـــاره : الـرحله الـرابعـة ل 28 ، و احـمـد سوسـه فیضـانـات بغـداد في التاریخ ب 1 ل 160 ، ئەوەی کە تومـا بوا گوتـویەتی لە (ل 3 عەرەبی)دا کە کەشتی‌یەکە لە

سەر چیای (ئاارارات) نیشتووە ئەوە بەپێی قسەی (تەوراتە)، وکەشتی وچیای (جودی) ئەوە هەر بەناوبانگە وهەندێکیان هەر چیای «نسیر» بە جودی دەزانن.

د ـ دانەر لەو عیبارەتەی خوێی پێشودا بە هەلە چووە چونکە ئەو شارستانیەی (نوزی) لە یورغان تەپە نیزیکی کەرکوك هێ (ئەکەدی)یەکان نەبووە بەلکوێ (حوری ـ خوری)یەکانە لە نیوەی یەکەمی هەزاری دووەمی پێش زایینیدا، حوریش (حیتانی) یەکانی رۆژهەلات بوون و لە نەتەوە کۆنەکانی کوردستانن، نوزی کە لە هەزاری سێیەمی پێش زایینی ناوی (کاسور) بووپایتەخت ویان مەرکەزێکی گەورەیان بووە (5000) کلیشەی مسماری لێ دۆزراوە تەوە دەربارەی بازرگانی، وقەرز، باج و، ژن هێنان و، یاساو، بریارەکانی دادگا، دزی وە تابگرە لیستەکانی رۆژانەی کرێکارەکان بەلام بە داخەوە ئەم گەنجینە مسماریەوئەوباسانەی لە رۆژئاوا لەم بارەوە بلاوکراونەتەوە تائیستا نەك هەر بۆکوردی بەلکوبۆ عەرەبیش تەرجەمە نەکراون وبەشیکی زۆری مێژومان لا ئاشکرا نیە ئەوەی بابەتی گوتنە (شمشارە)و (باسموسیان)یش لە دەشتی بتوین لە رانیە گرنگی حورییەکان بوون (5) ئیتر دیارە تومابوا لێرەدا زور بە هەلە چورە ویەك لە هەردوو وەرگێرەکانیش ئەم هەلەیەی راست نەکردوتەوە. بوئەم مەبەستەش تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە:

جورج کونتینو / الحیاة الیومیة في بلاد بابل وآشور ل 155 ـ 156 وەرگێری سلیم طه التکریتي وبرهان عبد التکریتي 1979. مەزوعی (الأعمال التجاریه في نوزا)، سبتون لوید، آثار بلاد الرافدین ل 171، 206، وەرگیری سامي سعید الأحمد 1980، محمود الأمین / الکاشیون ل 25. 1963، ئی. م. دیاکونوف / میدیا ل 155 ـ 156 بە زمانی کوردی وەرگێرانی برهان قانع 1978، المرشد ـ الرحله الرابعة ل 11، هەروها گوتارێکی ئیمە بەناوی: «کردستان ومکتبة نوزي الأثریه وأقدم خریطة طوبوغرافیه معروفة» لە التآخی 21 شباط 1974

11 ـ ل 36 دێری 7 ووشەی «میتانی» بوویتە «میتالی».

12 ـ لە ل 36 دا هاتووە کە سەرۆکەکانی (کاشی) کە لە رەگەزی کورد بوون (ویان بلێن کوردەکانی لور کە ئیحتمالیکی نیزیکە) ودەوری (500) سال حوکمرانییان لە عراق کردووە ـ «سەرۆکەکانیان لە گەل میتالی (بەلکوو میتانی) یەکاندا لە دەوروبەری سالی (450) دا کچەکانیان بەژن و ژن خوازی شوویان کردوە بە فرعەونەکان». دو خەلەت لێرەدا هەیە:

أ ـ مێژووی (450) خەلەت دەبێ (1450) پێش زایینی بێ.

ب ـ وا دەزاندرێ کە فرعەونەکان سەرۆکی میتانیەکانن. هیچ گومانێك نیە کە هەندێك لە عبارەتی دانەر/لە تەرجەمەی عەرەبیدا کەوتووە ویان شلەژاوە چونکە عبارەتەکە وهایە «وکان رؤساؤهم قد تصاهروا مع المیتانیین حیث تزوجت الفتیات من الفراعنه نحو عام 450» و دەبی مەخسەدی تومابوا ئەمەبێ کە کاشییەکان خزماتییان لە گەل میتانیەکان (کە دەولەتیان لە باکووری سوریادا بووە ولە گەل فرعەونەکانی (میصر) لەومێژوەی سەرەدا پەیداکردووە. دەربارەی خزماتیی کاشی وفرعەونەکانی میصر لەهەندێك سەرچاوەدا هاتووە کە (امینوس ێ سیەم 1413 ـ 1377 پ. زا) کچی (کریندا ش)ێ سەرۆکی کاشییەکانی هێناوە (تەماشای کتێبی (الکاشیون ل 9) بکە) دوورنییە مەخسەدی تومابوا ئەم خزماتیەبێ بەلام مێژووەکە هندێك لە پێشە.

ج ـ وەرگێری کوردی مێژووی (450) لە دوای فرعەونەکان هلگرتووە وپێشی خستوە ولە دوای میتانی یەکانی داناوە، ئەمەش خەلەتی پەیدائەکات.

13 ـ لە ل 36 ( = ل 15 عەرەبی) دا: «دەربەندی وامکان» هاتووە یانی بەپیتی (واو) بەلکوو یاراست «دەربەندی امکان»ە بەپیتی (رێ) مەبەستیشی (دەربەندی رانیە) یە. لە بەرئەوەی کە کورد ئیستا پێ نالێن دەربەندی رامکان ئیتر نازانم ئەم ناوە چۆن وکەی کەوتوتە نێو کتێب؟ هێندە ئەزانین کە (دبلیو. آر. های)

ئەم ناوەی بەکــار هێنــاوە لە کتێبــەکــەیــدا : (سنتــان في كردستان ب 1 ل 174 کە فؤاد جميل لە 1973 کردوویە بەعــەرەبی وکتێبــەکــەش بە ئینگلیــزی لە ساڵی 1921 دا چاپ کراوە ، ئیتر نایزانم ئەوە یەکەم کەس بووە بۆ جاری یەکــەم ئەم ناوەی خستــۆتە نێو کتێب ، یان نا؟ لە پاش ئەو ئەم ناوە لە چەنــد کتێبــەکی تریش دا ئەبینین وەکــو (کرد ، ترك ، وعرب ل 196 ) یێ ئەدموندز کە هەندێك زانیاری لە «های» وەرگرتوە دەربارەی رانیە بەلام بخوش چووە لە ئەم دەربــەنــدە کە پادگــانی ئینگلیزەکانی لێ بو ، هەروەها طه باقــرو فؤاد سفــر بە ناوی دەربــەنــدی رامکــان ورامكەوە) ناویــان هێنــاوە لە ( المــرشــد ـ الــرحله الــرابعــة ل 33 وهــەروەهــا هەندێکی تریش . ئەمانە هەموویان ئەگەرچی نەیــان گوتــووە مانــای (رامکــان) چی یــە بەلام وابــۆم دەردەکــەوێ کە ئەم ناوە لە ناوی عەشیــرەتی «رەمــك»ە وە هاتبێ چونکــە خەلکی دێ دەربـــەنـــد بەخــۆی لەم عەشیــرەتــەنــە هەر وکــو ل دێ قورەگــۆ ، تۆبــەکــاران ، وهندێك دێهاتی تریش هەن . ئەوی بابەتی باسکردنە لە دێی قەلاتــوکــە وئــەبوبەکر لە پشت سەنگەسەر لە ناوچەی مەنگوران گردێك هەیە بە ناوی «گردی رمکان» .

ئەوی بابــەتی ووتنە لەم دەربەندەدا شارێکی کون هەبووە لە ساڵــی 1973 دا من ئەم شارەم دۆزی یەوە کە شوورەکــان و قوللەکــانی . . . بە ئەرزەون تەخت بوون (6) .

14 ـ ل 36 دانــەری کتــێــبــە کە بە هەڵــە چووە کە هەلکــەنــراوی حریــرو باتاس بە یێ ئاشووریەکانی زانیوە چونکــە زانــایــانی ئەرکیــولــوجیــا بە هي ئەوانیــان نەزانیوە چونکە شێوەی بە یێ (فرثی) یەکان ئەچێ (248 پ زا ـ 226 پا زا) تەماشای المرشد ـ الرحلة الخامسة ل 13 بکە .

15 ـ ل 38 «سیکرازی» هاتوە لە باتی «سیکزار» کە ناوی پادشایەکی میدی یە .

16 ـ ل 39 دانــەر : تومــابوا عراقی بە میدیای گەورە ژمار دووەکــە ئەمـــەش راست نییــە بە گوێــری هنــدێــك لە سەرچــاوەکانی مێژ ووی کۆن بەڵکو کوردستانی عراق یان بەشێکی لە میــدیای گەورەیە : کە ئەزربێجان تا هەکاری وتــانیـــزیــك هەمـــەدان وولـــەم لاوەش تا هنـــدێــك لە کوردستــانی باشــووری گرتــوەتــەوە میدیای بچووکیش لە هەمــەدان و تا کێــوی ئەلبــورزو(قــوم) بووە . ( تەماشای کتێبی بەرنـــرخی (میــدیــا) بکــە ل 127 ـ 145 دانــایی دیــاکونوف) هەروەها لە گەڵ تەعریفی (مەروخ)یش (7) ناگونجێ ، ئەگەر گوتبایە (عیراقی عەجەم) راست بو

17 ـ ل 41 وەرگێری کوردی « ساری ـ بول»ی کردووەبە (شاری بول) وئەمە راست نیە چونکە مەخسەد بە ساری ـ بول «ســەر پول»ە یانی سەرپــولی زەهــاو ودەبــایە خوشکە ئاواز زەنگەنە ئەم ناوە راست بکا تەوە بۆ ئەوەی خوێندەوار بیــزانیبــایە چییەو کوێیە . دانەر ئەلێ ئەشکەوتی ( دوکانی داود) لە لای (ســەرپــولی زەهــاو) لە ئاساری میدیەکانە . مردوخیش باسی دوکانی داودی کردووە لە مێژ ووی کوردو کوردستان ل 77 دا .

18 ـ ل 43 ناوی «ارتــاکسیــرس» بوەتــە « ارتــاکسیــری» دوورنییە هەڵەیەکی چاپی بێ .

19 ـ ل 43 ناوی «ئــورارتــو» بووەتــە «تــورارتو» دوور نییە ئەمەش هەڵەیەکی چاپی بێ .

20 ـ ل 46 ژمـــارەی (598) کەوتـــوە کە لە ل 22 تەرجەمەی عەرەبی دا هەیە ئەمەش ژمارەی ئەو کوردانەیە کە (هنــری ڤیلد) تاقی کــردنەوەی زانستی ڕەگەزی لە سەر کردوون ، جێگــەی ژمــارەکەش دێری (20 ـ 21)ە بەلام ژمارەکە نیە .

21 ـ ل 53 . وەرگێر کاك حەمە سەعید ووشەی «گامری» کردووبـــە «مـــانگـــایێ مردوو» و(گـــاویستی) کردوەبـــە (مـــانگـــایێ مانــدوو) «گــاویستی» ش راست نییە بەڵکو « گاوەستی» یە ئەگــەر چی «أبقــار میتة» و «أبقار تعبة» هاتوە لە عەرەبییــەکەیدا بەلام ئەبایە هەر بەوشێوەیە لە کوردی بۆ کوردی وەری نەگێــرایــە ، چونکــە لە کرمــانجی سەروودا (گــا) هەر (گــا)یــە ومــانگا «چێلەك»ە وئەگەر مەخسەدیان مانگابایە ئەگوتن (چێلەك وەستی) . . دەبارەی (BAMiri) کە

وەرگێـری عەرەبی گوتـوە یانی (آباء أموات) ـ نەم بیستووە ئەمە هەبێ بەلام هەردو گوتنی تر هەیە .
22 ـ ل 55 تومـابـوا ئەلێ (دووکـەڵ کێش) لە خانـووی کوردەکـان دا نییە . من ئەمە بەنسبەت هەموو ناوچەکانی کوردستـانـەوە بەراست نازانم چونکـە لە هێندەك ناوچەدا هەیــە ورێــك وپێکیشـە وپێ ی ئەلین (کـولینـك) وەکـو ناوچەی بوتان .
23 ـ ل 55 وەرگێــر «حــور» گۆڕیــوە بو «چنـار» بەڵکـە یاراست «سپینـدار»ە ناوی چنـار لە کتێبـەعـەرەبیـەکان دا (دلب ، صنـار ، ضرا) هاتوە هەروەها «جنار»یش هاتووە تەمـاشـا ئەم کتێبە پزیشکی یە بکە : «تذکرة اولی الألباب والجـامـع للعجب العجـاب ل 92 ) لە باسی «دلب»دا دانـانی داود الأنطـاکی . ئەوی بابـەتی گوتنە وەرگێر لە ل 92 دا (حور)ی بەشێوەییێکی ڕاست کردووە بە (سپی‌دار) هەروەها لە ل 55 دا ووشەی «لبن» کە بەخەلەتی لە باتی «تـبـن» هاتــووە لە تەرجــەمــەی عەرەبـی دا ل 27 دا ـ سەراست کردوە ووەرگیراندووە بو «کا» .
24 ـ ل 58 «سریر حدیدي» کە لە ل 27 عەرەبی دا هاتوە ـ گوراوە بۆ «جێگــایــەکی نوستن» ئەمــەش ناگــونجێ هەروەهـا ناگـونجێ لە گەڵ مەبـەسی دانەر چونکە نیازی ژمـاردن و باس کردنی شتومەکی نێو مالە دەوڵەمەندەکانی شارەکـــانـە یەك بە یەك وەکـو دولاب ، قەنـەفـەو کورسی وتـەختی ئاس ، بەرە یان مافـور . . ئیتـر دیـارکردنی هەر شتێك بە ناوی خوێەوە پێویستە بۆئەوەی بزانرێ شتومەکی نێـومال چی‌وچی‌یە لەوکاتەدا وبۆئەوەی بزانری کە تەختی ئاسن یان قەروێلە کەوتوتە جێگەی تەختی داری جاران و گۆڕییێك پەیدابووە لە هەندێك شتومەکی نێو مال .
25 ـ ل 58 «قـدر أو انـاء کبیر» تەرجەمە کراوە بە «قاپلەمە ویان قاپێکی گەورە» . بەلای منەوە دەبایە «وەری گێرایە بە » «مەنجەڵ یان مەنجەلی گەورە» چونکە مەبەستی تومابوا ئەوشتەیە کە تێشت تێیدا دێتە کولاندن کە کورد لە ناوچەی سلێمـانی وزۆر ناوچەکانی تری کوردستان بەو شتە ئەڵێن (مـەنجـەل) وپێ نالێن (قـاپ ـ قاپی گەورە) چونکە قاپ جودایـە وەکو قاپی کەتێشت تێیدا دە خورێ بەلام قاپلەمە بۆ مەنجەلی بچووك ئەگوترێ لە هندێك جێگادا . هەروکو من لە چەنـد مسگـەرێکی سلێمـانی م پرسیـوە وکووەستا نوری حاجی سعید وەستا حسین وەستا حەمە رشید .
26 ـ ل 58 «طـاس»ی بە «لـەگـەن» تەرجـەمـەکردووە . طاس ئەگەرچی بۆبچووك و گەورەش دەبێت بەلام لەگەن تا جامی ئاو خواردن .
تەماشە : محمد التونجي المعجم الذهبي پیتی «ط» بکە بەلام لێــرەدا مەبـەسی دانـەر لەگـەن نییـە چونکـە ناوی «أطبــاق وصحــون»یشی هێنــاوە کە صحــون لەگـەن ئەگرێتەوە لەبەر ئەمە دەبێ مەبەستی ئەو لە طاس (تاس)ە یانی جامی ئاو خواردن چ بچووك وچ گەورە .
27 ـ ل 58 : دانەر لە نێوشتومەکی مالی دەوڵەمەندەکانی شار مووشە دەمەی (منفاخ) هیناوە بۆگەشاندنەوەی ئاگر . من باوەڕ ناکــەم شتـی‌وا هەبێ بەڵکــو ئاسنگــەرەکــان مووشـەدەمـە یان هەیـە وئەگەر هەبێش ئەبێ زۆر زۆر کەم بێ بە شیوەیەك کە ئەبایە بە زور کەمی لە قەلەم دا بایە .
28 ـ ل 28 لە تەرجـەمـەی عەرەبی ووشەی «سماوەر» لە بەینی دو کەوان دا دانــڕاوە لە دوای ووشی (منقلە) یانی منقلە بە سەمـاوەر زانـراوە ئەمـەش خەلـەتە نایزانین دانەر وایکـردوە یان وەرگێـری عەرەبی ؟ دەبایە وەرگێری کوردی باسی ئەمـەی کردبـایـە وگوتبای مەنقەلی ئاگر سەماوەر نیە بەلام بخـوی ووشـەی مەنقـەڵی نەهیناوە تەنیا سەماوری هێناوە یانی (مقالە ـ مەنقەل) فرێداوە تەماشا (ل 58) بکە

29 ـ ل 61 وەرگێـر عبـارەتی «وجـز الخرفان» کە لە دێری 21 ل 28 عەرەبیــەکــەیـدا هەیـە ـ نەهێنـاوە ونـەکـردوە بەکوردی ومانایيش «خوری برین»ەو دبایە لە دێری (17) هینابا .
30 ـ ل 62 دا «اللبن الـرائب» وەرگێـرانـدوە بو «مـاستی کۆن» بەلکـو بەتـەنیـا مانای «ماستە»ە ئیتر چی کۆن وچی تازە وبـەعـەرەبی فەصیح «لبن» شیرە و«رائب» ماستە . لە غەیر ئەمەش ئەیزانین لێرەدا مەخسەدبێ ماستە یێ هچیی

تر چونكــه كه شيـر گەرم ئەكـرێ بۆماست دروستكـردن
كەمێـك ماست ئەخـرێتـه نێو شەرت نيه كۆن بێ وئەمەيه
مەخسەدی دانەر .

31 ـ له لا 62 (= 29 عەرەبی)دا دانــەری كتێبــەكـه له باسی دروستكــردنی پەنيـری سپی ( الجبن الأبيض دا) تووشی هەڵەيێك بووه ويان عبارەتی شڵژاوه چونكه ئەگەر مەخســەدی به پەنيــری سپی (شيـرێش) يانی (ژاژی ـ ژاژك) بێ وەكوپێ ئەچێ چونكه گوتويەتی گيای بونداری ئەخــرێتـه نێـو ـ ئەوا ناخـرێتـه ژێـر شتێكی قوری وەكـو گوتويەتی چونكه كيسەی (دۆ)ێ گەرم پاش پالاندنی ويان گوشينی خالی ئەكـرێته سەر سەبەتەيێك بۆئەوه بەتەواوی بپالی ئەوجا گيای بونداری ئەخرێته نێوكه مەيله وشك بو ئەخـرێتـه نێـوپێستـەوه ووردە پەنيـريش تێكه ل ئەكرێ .
ئەوی بابەتی گوتنه (شواريز : جمع شيراز) يانی شيرێش ـ ژاژی مادەيێـك بوو له بازرگــانیی كوردستان ئەنێررا بو ولاتــانی دەرەوه له سەدەی دەيــەمی زايينیدا وەكـو قەزوان وگـــەزو ، گوێـــزومازیو ، پەنيـــر ، وخــوری وچــەرم ، ئەسپ و . . . هەروكـو (مقـدسی) ئەلی له كتێبـەكـەيدا (أحسن التقاسيم في معرفه الأقاليم ل 145) چاپی ليدن 1906 . بەلام ئەلێن مەخســەد به «ژەكی شيـر ئەدەن به گوێـرەكـه» «ويستعمـل مصل الحليب للعجول» كه هەر لەم جێگـەدا هاتـوه ئەلێن ئەگـەر گوێـلـك سەربەخۆشيری دايكی بيخـوێ له رۆژی يەكـەم ودوەمدا كه بەوشيره ئەلين (ژەك) ـ دەمـرێ ئەگـەر زۆری بيخـوێ ئيتـر شيرەكەد دوش وكـەمێـك دەيخـەنـه دەمی ويـان تێكـەل شيری تر ئەكەن ئەدەنــه پێ چونكــه ژەك زورخەستـه له رۆژی يەكـەم و دەوەمدا له زايينی مانگا .

32 ـ ل 65 = ل 30 عەرەبی وەرگێر ئەم عبارەتەی بەجێ هێـلاوه ويان باشی وەرنەگێراوه بۆكوردی : «بناء السطوح المسنـدة بواسطـه حيطـان صغيـرة» پيشيەكەش ئەمەيه : «والأكـراد بستـانيـون ممتازون فهم ينصرفون في جبالهم مثل جميع الجبليين اللبنانيين الى بناء . . . » وەرگێر تەنيا ئەمــەی له باتی دانـاوه : «ئـەمانيش له شاخەكاندا زەوێی كشتـوكـالی چاك ئامـاده ئەكەن» ئەمەش بێ گومان مانای ئەو عبـارەتـه ومـەخسەدی تومابوا جێ به جێ ناكه چونكه مەخســەدی ئەوەيه كه كورد وەكـو لوبنـانيـه كان شارەزاو زيـرەكـن له باغــەوانیدا له دروستكـــردنی (بــاغــه به تەلانــەكـان)دا كه ئەوجێگـايـانـەی لێـژن وكـەم خوڵن وبەكەڵكی چاندن نايەن ديواری لێ ئەكەن به وشكەبەردو بەخـوڵی پری ئەكـەنـەوه (وهنـدەك جار كوردەكان بەشان خوڵـی بۆدێنن و تەختی دەكــەن وئيتـر شتی لێ ئەچينن مەخسـەدی دانـەر بەو عبارەتەی خۆی ئەم جۆره شتەيه كه بەكرمانجی خواروو پێ ئەڵێن (تەلان)و بەكرمانجی ژورو پێ ئەڵێن (لاتك) . ئەم جۆره باغه به تەلانه قات قات دەر ئەچـێ كه به عەرەبـی به (مــدرجـــات) وەسفی ئەدرێ . دروستكـــردنی ئەم جۆره باغ زەويیـه هەردەم به هونـەری كشتـــوكــاڵی ئەژ مێـــررێ . كەچی ئەم خاڵـه جوانـه له تەرجەمەی كورديدا بزر بوه .

33 ـ له ل 65 دا تومـــابـــوا ئەڵێ : هێنـــدەك له سەرداره كوردەكـان له سەدەی دەيـەمـدا لۆكـه چانـدنيان هێناوەته سوريا . من ئەم قسەيه بەراست نازانم چونكه ئەگەر چی له سەدەكانی زايينیدا يانی له پێش ئيسلام چاندنی لۆكه گەيشتــوتــه كوردستـــان ئەوەش به ئەســل له هينـــدەوه وبــەرێگــەی عيـراق و ئيـرانـەوه بەلام (حمدانی) يەكانی عەرەب له سەدەی دەيـەمدا له وەلاتی ( الجزيرة)و سوريا چاندنی لۆكەيان فره كرد نەك سەردارێكی كورد تەماشای ئەم سەرچـاوانـه بكه : آدم متر / الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجری ب 2 ل 35 وەرگێرانی محمد عبد الهـادی 1947 . وجاك ريسلر الحضارة العربية ل 115 وەرگێری غنيم عبدول هەروها كتێبەكەمان (حضارة الدولة الروستكية في كردستان الوسطی ـ الجزء الثاني ل 292) مەوزوعی ( الزراعة) .

34 ـ ل 84 دانەر گوتووه دەربارێ عەشيرەته كوردەكان كه له كوردستانی توركيه دايه : له توركيا عەشيرەتی هەكاری ، هەرتــوشی . . . هەيــه . ئەوەی راستـه عەشيـرەتێكی تايبــەتی به ناوی هەكــاری يەوه نيــه بەڵكـو كۆمـەڵێـك

عەشیـرەت هەیـە کە لە ناوچـەی هەکـاری‌دا دەژین ، گەورەترینیان ئەرتوشی یە. دوورنیە (زیریکان)یش (ژیرکان)بێ .

35 ـ دانەر ئەڵێ ناوی «ئاغا» لە کوردستان دا ئەگەڕێتەوە سەدەی هەڤـدەهـەم . بەلام ئەمـە ڕاست نیـە چونکـە لە سەدەی شازدەهەمیشدا ئەم وشەیە بەکار ئەهێنرا هەروەکو لە (شەرەفنامە) دا هاتووە سیدی آغا ، عبدالرحمن آغا ، شیخی آغـا تەمـاشـەی ل (520 ـ 521) بکـە لە چاپی قاهـرە بە زمـانی فارسی . ( ئاغـا)ش لە ووشـەی (ئـاقا ـ ئاقـای)ێ مەغـولی‌یـەوە هاتـوە. تەمـاشـای : د. محمد التونجي (المعجم الذهبي فارسي ـ عربی) بکە هەروەها ( فرهنگ عمید : ووشەی «آقا» جا ئیتر ئێمە نازانین پاش هاتنی مەغـۆڵـەکـان لە سەدەی سێزدەهەمدا بەچ ماوەیێك ووشـەی «ئـاغـا» لە کوردستـان دا بە کارهێنـراوە بەلام دوریش نیە پاش شەری چالدیران (1514 زا) لە ڕیگەی تورکە عوسمانیەکانەوە لە کوردستان بلاو بووبێ .

36 ـ ل 91 . دانـەر (تـومـابوا) ئەڵی : مافي ئاغایەتی لە زەکـات دایـە . یانی کورد زەکـاتی ئەدەنە ئاغا . من ئەمە بەراست نازانم . ئەگـەر رووشی دابێ زۆر کەمـە ولێرەش دا ئەبـایـە وەرگێـری کوردی ووشی «یـاخود» زیاد نەکات چونکـە زەکـات «دەیـەك لە دەست کەوتی گەنم و جۆیە» ئیتر (یاخود)ی پێناوی.

37 ـ لە ل 91 (= 43 عەرەبـی)دا لە باسی باجـەکـانی ئاغـایـەتی‌دا وەرگێـرا ووشـەی (میرانی) فرێداوە کە ناوی ئەوبـاجـەیـە کە مقـدارەکـەی هێنـاوە کە لە (50) سەر مر مەرێکـە . ئەمـەش خەلەتە چونکە نیازی دانەر دیارکردنی ناوی باجـەکـانـە لەگـەل مقـدارەکـانی ودیارکردنی ناوی باجەکە پێویستە بەلام ئەبێ لەبیرمان نەچێ کە دورنیە ئەم جۆرە هەلەیە چاپی بن .

38 ـ ل 92 وەرگێر ووشەی «بەرتیل» لە خۆیەوە زیاد کردوە وبـەخـەلەت چووە چونکە ئەو (5) مەجیدی‌یە باجی هەر (300 ـ 500) داری سپینداره نەك بەرتیل .

39 ـ ل 92 ل 44 عەرەبـی دا هاتـوە : «وقـد فرضـت الضـرائب . . . عن كل رأس خروف وكـل شحنـة من الـزبـد وكـل جزة مباعة» وەرگێر «کل جزة مباعة» لە دێری کردووتە 22 دا «هەموو شتێك فرۆشراو» ئەمە ڕاست نی‌یە راستی‌یـەکـەی ئەوەیـە کە (بـارێـك یان وجبـە خورێیك) بفـرۆشـرێ ئاغا باجی لێ وەرئەگرێ ، دیارە لێرەدا وەرگێر «جـزە»ی بە «جـزء» زانیـوە یان سەهـوو لە خوێندنەکەیدا کردوە لە بەر ئەمـە کردوویەتی بە «شتێك» بەلکو «جزة» لە عەرەبیـدا بەمـانـای (برینی خوری) بەکار هاتووە . وابێ دچی کەوەرگێـر مـانـای «جـزة» نەزانیبێ چونکـە لە ل 93 دیـری 4 دابـە (بـزنێك) مانای لێ‌داوەتەوە چونکە لە پێش ئەوە (خـروف) هاتـوە وهـەروکـو لە ل 61 خۆی لە «جـزالخـرفـان» لاداوە وفـرێیـداوە ووەکـو خالی (28) وا باسمان کردو پێویست بوو تەماشای قاموس بکات .

40 ـ لە ل 46 عەرەبیـەکـەیـدا هاتـوە : «قلّت سلطـان الـرئيس في الـوقتُ الـراهن بالتأكيـد» وەرگێر لە ل 95 دا وهـای کردووە بە کوردی : «لـە کاتی ناخۆشیدا دەسەلاتە کانـی سەرۆك بە تەواوی کەم ئەبـێتـەوە کە ئەتـوانـرێ بەربەرەکانی بکرێ» .

بی گومـان ئەمـە دووره لە مەبەستی دانەر چونکە ئەڵێ دەسەلاتی سەروکی عەشیرەت ئێستا لەم کاتەدا کەم بووە وهـەروکـو جاران نەمـاوە ئەمـەش شتێکی ئاشکرایە کە لە کاتی دانـانی کتێبـەکەیدا تەواوبونی ئاغایەتی زۆر کزبووە لە کوردستـان دا وکـتێبـەکـەش پێش سالی (1962) تەواونـەبـوو چونکـە ئەم مێژ ووە لە لاپەری (278)دا دێ ئەگـەر چی ئێمـە نازانین کەی تەواو کردوویـان کەی لە چاپی داوە چونکە خوشکە ئاواز ئەمەی بەبێ نرخ زانیوە تا باسی سالی چاپکـردنی کتێبـەش کە ئە بێ لە سەر پشتی هەبێ ـ نەکـردوە کەئێستـا پێـویستی‌مـان پێیـەتی لەمەش سەیـرتـر ئەمـەیـە کە باسی ئەوەشی نەکردوە کە کتێبەکە بە چی زمـانی دانـراوە ولـەچی زمانێکەوە وەری‌گیراوەتە سەر عەرەبـی بەلام زۆر باش بووکە وەرگـێـری کوردی کاك حەمە سەعید ئەمەی ساغ کردوتەوە کە لەفرنسی یەوەکتێبە

که کراوەتـە عەرەبی (ئـەگەرچی ناوی دانەر لەسەر بەرگی دەرەوەی کوردیەکەنیە) ئایا پێویست نەبوو لەسەر وەرگێری عەرەبی کە پێشـەکی یەك بنـووسێت ویـان هەرلـە (کلمة الختام)دا باسی ئەوەی کردبایە کە توما بواخەڵکی کوێیەو بەچ زمانێك کتێبەکەی داناوەو کەی تەواوی کردووە ؟ ویان کەی بڵاوی کردووتـەوە؟ دوورنییـە ئەم شتانە روون ببوایە هەر لە پێشــەکیـەکـەی دانـەر خۆیدا بەڵام ئێستـا هیـچ پێشـەکی یـەك لەگـەل تەرجـەمـەی عەرەبی دانییە ئایا هەر لەبنـەڕەتدا نەبووە؟ ئەمەش إحتماڵێکی دوورە یان هەبووە وخوشکە ئاواز فرێیداوە لێرەدا ئەمەوێ بڵێم کە پێویستیمان هەیە بە خۆماندوکردن ووردو فراوان بون لە بەحس وقوڵ بوون لە لێکـۆڵینـەوە وڕێــك وپێکی کتێب بە گوێــرەی (منهـج البحث العلمی) بۆنمونە باتەماشای بەڕێز (سامی بن السیـد خمـاس الصفار) بکەین کە چۆن پارچەێیك لە دەستنــووسی (تــاریـخ أربـل) ی (ابن المستـوفی)ێ هەولـێــری لە دووبــەرگی گەورە دا ساغ کردوەتــەوە کە (1744) لاپــەڕەیــەو تەنیـا (429) لاپـەڕەیێ هی (ابن المستـوفی)یـە باقیـەکـەی (1315) تەحقیقاتی خۆیەتی لەسەر ئەو پارچە دەستنووسەی مێژ ووی شاری هەولێرە .

بەرگی دوەم کە (988) لاپــەڕەیـە یەکسـەر هەمـووی تحقیقـاتی خۆیەتی تا ئەیتوانی‌یە ئەم تەحقیقە فراوانە بکە تەنیـا ئەوسەرچاوانـەی کە سود لێیـان وەرگـرتـوە (524) سەرچــاوەیــە . هەر لە ڕێــگــەی ساغ کردنــەوەی ئەم دەستنـوسـەدا لە دەیـان نامەخانەکان چەند ولاتێك گەراوە وەکو بریطانیا و ایرلندە و تورکیە وچەند ولاتێکی عەرەبیش .

خۆزگا ئێمەش (نوسەر ودانەرانی کورد) کەئەم جۆرە کتێبە ئەبینین دەرسیـان لێ وەربگـرین وبـۆخۆمان بمان کردبانە سەرمــەشـق بۆوورد بونــەوە پەل هاویـشـتن لە باس و لێکـۆڵینـەوەدا ، ئێـمـەش ئەم جۆرە ڕێبـازەمـان گرتبایە لە بەرهەمەکانمان دا . زۆربەی ئێمە کە دەست بە دانان یان لێکـۆڵینـەوەی کتێبێـك ئەکـەین هەوڵ ئەدەین بە زووترین کات وبـە کەمتـرین رەنج و لێکۆڵینەوە تەواوی بکەین وبە پەلە پەل بیخەینە ژ یر چاپ .

پەراویز :

1 ـ گارزان ناوچەی (غەزان)ە کە ناوچەیەکی کشت کالی وبـەنـاو بانگـە لە قەزایی (قـوتەلان) لە ولایەتی (سێرت ـ سعـرد) لە کوردستانی تورکیە . شاری غەرزان کە لە سەر چاوەکـــانی دا بە ئەرزەن (أرزن) ناوی هاتـــووە شارێکی کۆنی کوردستان بووە لە پێش ئیسلام دا تا سەدەی یازدەیێ زایـیـنی هەبـــووەو زەردەشتی لێ هەبـــوون وتـــا سەدەی سێـــزدەش ئەم شارە هەر لە سەرخـــۆ بوویـــە تا نەخوشخانەیەکیشی لێ هەبووە بەڵام بە داخەوە ئەم شارە وێـران بووە تەنانەت جێگەی لە زۆر مێژ ونوسان بزربوە لە هاویـنـی 1977 کە چوم بودیـتنی جێگــەی ئەم شارە لە پشت دێ (شیخ یونس) ـ سەر سام مام کە لە جێگاکەیدا ئێستـا گەنم ئەچینـرێ وبەردەکـانیـان نیـان هەڵ قەنیوە بۆ ڕێگـای شەمـەنـدفـەر وشتێکی کەم لە قەلاتەکەی لە سەر روبـاری غەرزان (سـربط) ماوەوپێ ئەڵێن (خراپ باژار) باسـی ئەم شارەم نوسیــوە لە کتیبــەم دا : (گەشتــەکی ئەرکیولوجی د کوردستان باکوری دا ل 599 ـ 624) .

2 ـ وێنـەیێــك لە وێنــەکــانی هەلکـەنـدراوی شاخی (نـەمـرود)مـان لە کتێبـەکـەماندا ( الدولة الروستكية في كردستـان الـوسطى ب 1 ل 25) دا بڵاوکـردوە هەروەهـا وێنەیێکی تریش لە گوتارەکەماندا «جسر زاخو الاثري» لە گوڤاری (بين النهرين) ژمارە 28 سالی 1979 .

3 ـ دێ (بێنات) دکەوێ باکورێ (فنك) بەماوەی 20 کم ویــازیــاتــر بەلام نیـزیکی (فنـدك)ە لەلای باشـووری رۆژهــەلاتــەوە لە سەرچــاوە کلێســەیی یــەکـان کان و ئیسـلامیـەکـانـدا بە «باعيناثا» ناوی هاتوە لە سەدەی دەی زانیینی دا (مقــدسی) گووتـویـەتی : باعینـاثـا لە (25) گەڕەك پێك دێ باغ ئەکەونە نێو بەینیان وئەڵێ جێگەیەکی

وا خوش له عیراق نییه تەماشای کتێبەکەی بکە : (أحسن التقاسیم في معرفة الأقالیم ل 139) هەروها ابن حوقل وعماد الدین الاصبهانی ویاقوت الحموی ش ناویان هێناوە بەلام باسی دارستانە سنەوبەرەکەیان نەکردووە هەروەها باسی زەیتوونەکانیش چونکە زەیتوونێکی زۆری لێ هەیە . لە مانگی تموزی 1977 چووم بو بێنات بۆ دیتنی ئاساری مزگەوت ومەدرەسە کۆنەکەی وئێستا دێیەکی دەوری (20) تا (30) ماڵەیە لەگەل «عەوینا» کە سەر چاوەی روباری بێنات (روباری باعەیناثا ـ باعیناثا) لەوێ هەڵدەقولێ . ئەوا بابەتی گوتنە تائێستا نەزانراوە درەختی سنەوبەر لەم جێگایانەدا سروشتی یە ویان دەست چێنە کەمن لەو باروەرەدام کە دەست چێن بێ .

4 ـ وکو :

NUZI PESONAL NAME :

ERNIST R. LACHEMAN . g 4 g

ژمارەی لە کتێبخانەی موسسەسەی ئاسار 12573 / 49 . 4 . 6

5 ـ ئەم باسەی خوارەوە زور گرنگە دەقی برێك کلیشە مسماریەکانی گردی (شمشارە) تێدایەو 94 لاپەرە وشایانی وەرگێراندنە بو کوردی : THE SHEMSHARA TABLETS JQRGEN LAESSQE

کوبنهاگین 1959 ژمارەی لە کتێبخانەی موئەسسەسەی ئاسار 28000 / 59 . 11 . 24 .

6 ـ محمد مردۆخ / مێژوی کوردو کوردستان ل 20 وەرگێراندنی محمد فدا .

7 ـ جورج کونتینو / الحیاة الیومیة في بلاد بابل وآشور ل 263 .

8 ـ هەر سەرچاوەی پێشو ل 168 .

## سەرچاوەکانی لێکولینەکە :


1 ـ المقدسی / أحسن التقاسیم في معرفة الأقالیم چاپی لیدن 1906

2 ـ داودا الأنطاکی / تذکرة أولی الألباب والجامع للعجب العجاب چاپی مصر 1952 .

3 ـ شرفخان البدلیسی / شرفنامه چاپی قاهرة

4 ـ محمد آمین زکی / تاریخ الکرد وکردستان چاپی 1961 .

5 ـ آدم متز / الحضارة الاسلامیه في القرن الرابع الهجری چاپی دووەم 1947

6 ـ جاك ریسلر / الحضارة العربیة .

7 ـ دائرة المعارف الاسلامیه

8 ـ احمد سوسه / فیضانات بغداد في التاریخ : القسم الأول 1963

9 ـ محمود الأمین / الکاشیون 1963 .

10 ـ هی سنتان في کردستان بغداد 1973

11 ـ ادمونرز / کرد ترك عرب طبع سنة 1971.

12 ـ طه باقر وفؤاد سفر / المرشد الی مواطن الآثار والحضارة

13 ـ زینفون / مسیرة العشرة آلاف عبر کردستان صلاح سعدالله کردوەتە بەعەرەبی 1973

14 ـ دیارکونوف / میدیا تەرجەمەی کوردی 1978 .

15 ـ جورج کونتینو / الحیاة الیومیة في بلاد بابل وآشور چاپی بغداد 1979

16 ـ سیتون لوید / آثار بلاد الرافدین چاپی بغداد 1980

17 ـ فرهنگ عمید چاپی تهران .

18 ـ محمد التونجي / المعجم الذهبي الطبعة الثانیة 1969

19 ـ HUSEYIN SARACOGLU: DOGU ANADOLU. ISTanbuL 1956

20 ـ HAYAT : TURKIYE FENSIKLOPEDISI استانبول 1970 .

21 ـ محمد مردۆخ / مێژوی کوردو کوردستان بە زمانی کوردی گوڕینی محمد فدا چاپی بەغدا 1958 .

# ڤێدا چۆنەك لسەر کتێبا



* عبدالرحمن نقشبندی *

# داب و نەرێتی کوردەکان

* لڤێ دویماهیێ (دکتور شوکریا رەسول)ێ کتێبا (مەلا مەحمودێ بایەزیدی) (رسومات نامەی ئەکرادیە) ژرۆسی وەرگێرایە سەر زاراڤێ کرمانجیا ژێری لبن ناڤێ (داب و نەرێتی کوردەکان)و دەزگەها رەوشەنبیری و بەلاڤ کرنا کوردی چاپ کری یە.

ئەڤ کتێبا (مەلا مەحمودی) دانای بزاراڤێ کرمانجیا ژوری ، لسەر تورو رەوشت و هزرو بیرێن مروڤێ کوردن ، ژبلی چەند گوتنەکێن ئابوری و دیروکی و ... هتد ددەمێ خودا قونسلێ روسی (ئەلکسەندەر ژاپا)ی ئەڤ کتێبە ژکوردستانا تورکییای دگەل خو بری یە ناڤ ئویرساتێ ، پاشی (رۆدینکو)یا ژن وەرگێرایە سەر زمانێ روسی و بەراهیەك بو نڤیسی یە دگەڵ چەند ژێدەرەکا .

پشتی من کتێبا (دکتورێ) خاندی کو ڤەرێژەکا باشە نەخاسمە وەکی دەسنڤیسەکێ کوردی هاتە ساخکرن ڤە ، من بباش زانی چەند تێبینیەکا لسەر ناڤەروکا کتێبێ خویاکەم و بێخمە بەرێك دگەل دەسنڤیا (مەلا مەحمودی) بخو ، هیڤیا من ئەوە ئەز ژ راستیێ دەرنەکەڤم لێ ژ رێڤە من دڤێ ئەز سەربورێن خو دگەل وێ کتێبێ خویاکەم دا خوینەڤانێن هێژا پتر ئاگەهداری مەسەلێ ببن .

* درێکا سەیدایەکێ زانکۆیێ را نوسخا کوردی - دەسنڤیس - کەتە دەستێن من و من بوخو دڤلوب کر ، کو وی سەیدای ژی بوخو دڤلوب کربوو ژناڤ ئویرساتێ بوخو ئینابو. من کتێب خاندو خاندەڤە دسەر هەمی کێم و کورتی یا نەخاسمە ئەو خەلەتێن دیروکی کو نڤیسەرێ کتێبێ (مەلا مەحمودی) بخو کرینە ، هندی بێژی کتێب ڤەرێژەکا هێژا یە نەخاسمە بو زانایێن فولکلوری و ئەنثرو پولوجی ، پشتی ڤێ چەندێ من بریارا هندێ دا کو ئەز ڤێ کتێبێ ساغ کەمەڤە و بەرهەڤ کەم بو چاپێ ، ژ بەرکو دێ وەجەکا باش ژێ هێتە دێتن و وەکی کەرەسەکێ دیروکی دێ ژێ بێتەڤە . باوەر بکەن من سێ جار ئەڤ کتێبە یانڤیسی یەڤەو هەر جار ژی من پەیڤێن وێ راڤەکرینەو ژێدەر بو دروست کرینەو برێنڤیسا نهو نڤیسی یەڤەو نهو

يابــەر هەڤــە بوچاپــیْ و نیّــزیــك دیْ كەڤیتــە دەستیّن خوینــدەڤــانیّن هیّژا . لیْ دسەرڤیْ هەمیْ را دلّی من تەنا نەدبــو ومن دڤیــا باشترو چیّتر بیت ، نەخاسمە لوی دەمی چەند پەیڤەك هەبون بدروستی من نەدشیا راڤەكەم .

لڤیْ دەمی هاتــە گوهیّن من كو (د . شوكــریا) یاڤیْ كتیّبیْ ژ روسی وەردگیّرتە سەر زاراڤیْ كرمانجیا ژیری ، براستی ئەڤیْ ئاخڤتنیْ دل خوشیەك دا بەر دلیْ ، ژ بەركو من بوخو گوت هەبیت نەبیت (د) دیْ وان پەیڤا راڤەكەت ئەویّن من نەشیــای راڤــەكــەم نەخــاسمە ئەو دیْ تیّكستا روسی بوخو كەتــە سەروكـــانیو بیْخش دیْ بهــایــەكی ژ ژیّــدەریّن (رودینكو)ی بینیت ،

ئەز دڤـان هزرادا مام و گوهیْ من هەر مابكەلەكیْ ڤە كانیْ دیْ كەنگی ئەڤ كتیّبــە گەهتە ناڤ دەستیّت خویندەڤانا ، لیْ پشتی كتیّبــا (د) كەتیــە دەستیّن من و خوینــدەڤــانــا هیّڤــدكــەمیْ ئالوزیا (د) نەكو هەرچەند پەیڤەكن لیْ گەلە پتــرو كویــرترو بەرفرهە ترن ، لەورا چ بمن نەما شوینا ئەز دەستان بدەمە كیّلەكا ئەڤ ڤیّدا چونە من نڤیسی‌یە . پشتی من كتیّبــا (د) ریّــزك ریّــزك خانــدیو ئیّخستی‌یــە بەر كتیّبا (مــەلا مەحمــودی) پرسیارەك بو من راست بو ، گەلوْ ئەڤ خەلـــەتیــە سویچــا (دكتــوریْ) نە یان ژی (رودینكــوْ)ی دبنەرەت دا كرینە ؟!

بەرسڤـا ڤیْ پرسیاریْ دڤیْ هوسا بدەینەڤە . گریمان هەكە هاتو (رودینكوْ)ی ئەڤ خەلەتیە كربن ، ماتیّكستا بنەرەت (دەسنڤیس) لبەر دەست نەبو كو هیّڤكەتیْ ؟!! ئەڤە ئیّك یادونیی ئەزیْ دو دلم كو (د) ئیّكسەر ژكتیّبا روسی وەرگیّرا بیت ، ئەڤیْ دودلییْ ژی ئەگەرا خو هەیە هەچكو دیْ بومە دیــار بیت لیْ بونمــونــە ئەزیْ لڤیّــری بیّــژم (د) نڤیسی‌یــە (دەوار) یانی رەشمــال . باشــە چەوا (رودینكــوْ) دیْ پەیڤا (دەوار) كەتـــە رەشـــمـــال ؟! ژ بـــەركـــو (دەوار) دزاراڤیْ سلیّمـــانییْ دا (رەشمـــالّــــە) لیْ بزاراڤیْ كرمــانجی یانی (وولاّخ)و گەلــە پەیڤیّن دی یّین هوســا هاتینە كو دودلیا مە جهگیــردكەن و دیسا بەری دەست بدەین كتیّبا (د)و دگەل تیّكستا بنەرەت بدەین بەریّك من دڤیْ چەند خەلەتیەكیّن كتیّبا (د) بخودیاركەم كوچ تیّكەلی دگەل تیّكستا بنەرەت دا نینە .

\- 1 -

ل بەرپــەریْ (88)یْ لبن ناڤیْ (پیّــرستی ناوە جوگــرافیو بنچینەكان (دكتوریْ نڤیسی‌یە :

1 ـ **عەبــاسی ل 11** . بــەریْخــوبــدە كتیّبــا (دكتــوریْ) بەرپەریْ (11)یْ پەیڤا (عەباسی) نەهاتی‌یە .

2 ـ **عمــادیــە ، ئامیّدی ل 54** . هیّڤكە بەرپەریْ (54)یْ ژكتیّبــا (د)یْ پەیڤــا عمادیە ئان ئامیّدی نەهاتی بە ، ڤیّجا ڤیّــدا هەرە هەمی وەســا گەلو دڤیْ سویچا ڤیْ خەلەتییْ چ بیت ؟! لنــك من دچــاپا روسی‌دا پەیڤا (عەباسی) راستە دڤیْ لبەرپەریْ (11)یْ بیت و (ئامیّدی) لبەرپەریْ (54) بیت لیْ دەمیْ (د) ئەڤ كتیّبە كری‌یە كوردی بیْخش ئەڤ پەیڤە لجهیْ خو نەماینە ، یّین هاتین وەیین چوین ، ژ بەر هنــدیْ هیّڤكیْ (پــەیڤــا) عەبــاسی دكتیّبا (د)یْ دا یاچویە بەپــەریْ (21)یْو (د)یْ هەكو ئەولیستە [ئیندیّكس] كریە كوردی سەریْ خو بهندیْڤە گیّیژ نەكری‌یە كانیْ ئەوپەیڤ چوینــە كیش بەرپــەری هەر ئیّــك سەر چەوا نڤیسیــە وەسا (ویْ) وەرگیّرایە . ئەڤە ژی نەتشتەكیْ زانسی‌یە .

\- 2 -

وەرە بەرپــەریْ (90) یْ ژكتیّبا (د)یْ. لبن ناڤیْ (پیّرستی زاراوەكـــان) هنـــدی من هزریّـــن خوكرن كو (د)یْ ئەڤ لیســتــە بوچ نڤیسی‌یـــە من نەزانی ، هەكـــە رامـــان ژ (زاراوەكان) ئیدیوم بیت یانی ()مصطلح)یْ عەرەبی گەلە پەیڤ تیّدا هەنە ئیدیوم نینن ، بەلكی پەیڤن و وهند هەكە رامـــان ژیْ پەیڤیّن گران بیت دڤیــا مانــا وان بنڤیسیت ، هەكــە رامــان ژیْ پەیڤیّن كویــری‌وپەتی بیت ئان پەیڤیّن بیانی بیت دیارە كو ئەڤەژی نینە نزانم چرا نڤیسی‌یە

**عەبــا ، عەبــو ، ئاغــا ، ئازار ، بەران ، بەردان ، وار ، گەرەلاڤژە ، دەف ، زەكات ، زوزان ، قازی . . . هتد**

گەلــوْچ تیّكــەلی ئەڤان پەیڤان دگەللك دا هەیە ، نزانم !! هەكــە دچــاپــا روسی دا هوسا هاتبیت وخاندەڤانیْ روس

وەجەکێ بوخوژ ێ ببینیت ، بێخش خانەڤانێ کورد بڤی ئاوایی چ وەجێ ژ ێ نابینیت .
دیساوەرەڤە بەرپەرێ (90)ێ ژمارا (٠)ێ (د)ێ نڤیسییە(هەیکرن) یانی (رێکەوتن = پەیمان دان)هەرچەندە ل چاپێ پەیڤا (هەیکرن) باش دەرنەکەفتییە ، لێ هەکە هەیکرن بیت دڤێ مانا وێ ببیتە (ئازاکرن) (بەردان) (بەرەڵلاکرن)و پتر بو دەوارا دهێت .
هەکە وەرگریت (هەی کرن) یانی (زەنگین کرن) (دەولەمەندکرن) هەکە نە ئەڤە بیت نە ئەواهە وەرن دا ژمانا وێ پەیڤێ (رێکەوتن = پەیمان دان) پەیڤا دروست بینینە دەرڤە کو دێ بیتە (هەرێکرن) یانی (قەبویل کرن)(گوتێ باشە) (بەڵێن دان) .

- 3 -

مێزکە بەرپەرێ (95)ێ ژ کتێبا (د)ێ لبن ناڤێ (پێرستی بابەتەکان) نڤیسییە .
1 - نوشتە ل 20 ، 50 پەیڤا نڤشتی ئان مانەاوێ دبەرپەرێ (20 و 50)ێ دا نەهاتیە . ڤێجا ڤێدا هەرە گەلەك ژوان پەیڤان وەسانە بناس ژ ی هەچکو مەگوتیو ل خالا ئێکێ راڤەکری .
دیسا (د)ێ لدویماهیا کتێبێ بەرپەرێ (87)ێ ناڤێ خو نڤیسییە وەکو وەسا دیاردبیت وێ کتێب نڤیسییە و ئەڤە راست نینەو باشتر ئەو بو چەند بەرپەرەکێن تێکستا کوردی - دەستنڤیس - دگەل کتێبا خوچاپکربان دا بهایێ کتێبا وێ بلندتر لێهێت و دا پتر نێزیکی نڤیسینێت زانستی بیت

- 4 -

لدویماهیێ لنك من (رودینکوی)ژ ی هندەك خەلەتی کرینە هەکە وەسا بیت هەچکو (د)ێ نڤیسی . وەکو بەرپەرێ (24)ێ ژ یدەرێ (14)ێ (د.)ێ ژ زارنڤیسینا (رودینکوی) نڤیسییە . (بەر بە کومەلە خێزانێك ئەووترێت کە ژمارەیان (10 - 20) خێزانێك بێ) (م . رودینکو) .

ل من وەرە (بەر) نینە لێ (برە) چنکو (بەر) بعەرەبی یانی (حجر) (بەرەك لسەری دا) و(بەر) یانی (ڤەرێژ) کو بعەرەبی (إنتاج) ، (بزنێ بەر نە گرتییە) (بەرێ دارێ) (بەرێ زەڤیێ)و (بەر) یانی (سرت) و بعەرەبی (اتجاه) (بەرێ هەسپی کەتە رێ (بەرێ وی لچیای بو) و (بەر) دیسا بعەرەبی دهیت (أمام) یاراست هەچکو مەگوتی (برە) (برەکا پەزا) (برەکا مروڤا) و (مەلا مەحمودی) بخوژ ی هوسا نڤیسییە (برەکی مالان) یانی (برەکا مالان) براماان (برەکا مروڤا) (کەسا) .

- 5 -

دیسا ژ یدەرێ (15)ێ هەر ژ بەر پەرێ (24)ێ نڤیسییە (زوما - کومەلێکی زور گەورە نیە . . . بریتییە لە چەند خێزانێك کە ژمارەیان لە 8 - 20 خێزانێك ئەبن) .
جارێ (زوم) یان (زومە) نەکو ناڤێ گروپەك ئان کومەك ئان پشکەك مروڤانە . زوم ناڤێ جهییە . زوم ئەوجهە ئەوی خودان پەزپەزێ خودبەنێ ودچنێ بێخش ژ ی زوم سارترە ژ وی جهی ئەوێ خودان پەز ژ ێ تێن . .
دیسا دبێژیت (لەکاتی دروست بوونی ئەم ژمارەیە (زوما) کوردەکان هەوڵ ئەدەن ژمارەی مەرەکانیان نەگەتە هەزار سەر) . جارەکادی دبێژمەڤە (زوم) نە ژمارەیە یانی نەکو ناڤێ وێ جڤاتا مروڤانە ئەوێن دچنە چیای . (زوم) ئەو جهە ئەوێ ئەو هژمارا مروڤان دچیتێ ولێ جڤات دبن وبو جودا کرنا وان دگەل ناڤێ (زومێ) ئەم دکارین بێژ ین (زومێ) دیسا کێم کرن و زێدە کرنا هژمارا پەزێ چ تێکەلی بزومێڤە نینە ئەڤێ مەسەلێ تێکەلیا بشیانا خودان پەزاڤە هەی ، چێدبیت بکەنە چەند برەك و هەر برەکێ شڤانەکی ئان پتر بودانن ئان ژ ی بکەنە کەروچەند کەرەکا دروست کەن و هەکە بونە گەلەك دبیت بنە دوو زوم ئان پتر و(کەر) ژ ی چەند برەکن
دیسا هەر لوی ژ یدەری دبێژیت (زوما کومەلێکی کاتییە . . تەنها لە بەهاردا دروست ئەبێو هەتا پایزێکی درەنگ ئەمینێتەوەو لە هاوینا کوچ ئەکەن ولە سەرەتای زستان ئەگەرێتەوە) . ئەڤەژ ی بڤی رەنگی هاتیە گوتن

راست نینه راسته زۆم جڤاتەکا وەختی یە لێ ل بوهارێ درست دبیت هەتا پاییزەکا درەنگ و هاڤینێ کۆچ دکەن . . . هتد ئەڤە راست نینە دڤێت بێژیت : زۆم جڤاتەکا وەختی یە (کاتی یە) سەرێ بوهارێ زۆمی باردکەن و دچنە زۆما هەتا پاییزەکا درەنگ دچینن پاشی دزڤرنە ڤە .

دیسا دوو رەنگێن زۆمیا هەنە هندەك سەرێ بهارێ دچنە زۆمێ و لجهێ خۆدمینن هەتا دبیتە پاییز پاشی دزڤرنەڤە گوندان و ئەڤە پتر ژ کوردێن خۆجهـ دگریت . یانی خودان گوند .

زۆمێن دی سەرێ بوهارێ دچنە زۆمەکێ دمیننە لوێرێ هەتا سلالتر خۆش دبیت ئان چەرا پەزێ وان نەمینیت دێ رابن بارکەن چنە زۆمەکا دی هۆسا دێ ڤیهەل چن لجهێن چەرا پەزی هەتا لێ دبیتە پاویز جارەکا دی دێ زڤرنەڤە جهێن گەرم کو دبێژنێ (کۆز) و ئەڤە پتر کوردێن کۆچەر (رەڤەند) دگریت .

لڤێرێ ئەم دێ ڤەبرین و هێینە سەر کتێبا (دکتورێ) و تێکستا بنەرەت کو کتێبا (مەلا مەحمودی)یەو هەردووکا دەینە بەرێك .

- 6 -

با ئاشکرا بێ لای بەرێزان قوتابیان و شارەزایان و بینەران ب 19 / ر3 . (دکتورە) .

● ئەما بەعدو مەعلومی جەنابێد تالب و نازران ببتن . (مەلا مەحمود) - لڤێرە (دکتورێ) پەیڤا (نازران) کو د تێکستا بنەرەتدا (ناظران) هاتیە یاکریە (بینەران) یانی بعەرەبی (مشاهد) ژ بەر کو (نازر) وەرگرتی یە (نظَرَ یَنْظُرُ) ئەڤەژی دروست نینە ، راما نا نڤیسەرێ کتێبێ ژ پەیڤا نازران (سەبدایە) یانی بعەرەبی (معلم) یان شەهرەزاو (نازر) بخۆژی عەرەبی یە (ناظر المدرسة) .

- 7 -

ئەگەر پەیوەندی خزمایەتی و گیانی خوشەویستیش لە نێوان کەسانی خێزاندا کەم بوایەتەوە ئەمانە لە کاتی شەرا یارمەتی یەکتریان ئەدا . ب 20 / ر12 . (د) .

● ئێجاری ئەو تایفەژی بحەسەب نێزوکی و براو پسمامی یا وی زەمانی غیرەتا یەکدو دکێشن و ئەگەر دورن لێکودو نابنە خوی (م) .

- ئەڤ گوتنە (د) ێ بەروڤاژی وەرگێرایە ژ بەرکو نڤیسەرێ کتێبێ گوتبە هەکە مرۆڤێن ئێك بن یانی ژ خوینێ ڤە بگەهنە ئێك ، دێ لێکودو بنە خوی و پشتا ئێك گرن ، لێ هەکە مرۆڤێن ئێك نەبن پشتا ئێك ودوو ناگرن و لێك نابنە خویی ، لێ (دکتورێ) نڤیسی یە هەکە مرۆڤێن ئێك ژی نەبن ل دەمێ شەری دێ پشتا ئێك گرن .

- 8 -

کاتێ هەردو منالە گەورە بوون ئەو کاتە جارێکی تر سەر لە نوێ خوازبێنی ئەکرێتەوەو شاییان بۆ ئەگێرن . ب 23 / ر 1 . (د) .

● هەتا کو ئەو کورو کچ بالغ دبن ئێدی مەنع و پوشمانی نابتن ئێجاری داوەتا وان هەر دووکان دکن . (م) .

- یانی دەمێ بچویك هێشتا ساڤا ددەنە ئێکودو وهەتاکو ئەو مەزن دبن ئێدی پێشەمانی دناڤبەرا وان دا نابیت و هەکو مەزن بۆن دێ داوەتا وان کەن و ڤەگوهێزن . لێ (دکتورێ) نڤیسی یە هەکو مەزن بۆن جارەکاری دێ خازنەڤە . .

- 9 -

لادێ وبەرەکەشیان بەناوی زۆمای فلان یاخود زۆمەی ئاغاوە بانگ ئەکەن . ب 24 / ر11 (د) .

● برێد وان ژی وەکو گوندان ناڤ هەن ، زۆما فلان کەسی و زۆما فلان ئاغای دبێژن . (م) .

- نڤیسەرێ کتێبێ گوتیە برێد وان ، زۆمێن وان وەکی گوندان ناڤ هەنە یانی هەر زۆمەك ناڤێ خۆ هەیە لێ (د)ێ گوتیە گوندو برێد وان بناڤێ زۆما گازی دکەن یانی دبێژنە گوندان زۆما فلان کەسێ ئەڤەژی نەدرستەو هەچکو بەری نهو مە گوتی (بەرەکەشیان) نینە بەلکو (برەکەشیان)ە

- 10 -

هەر بۆیــە لەنــاو کودەکــان ئەم پەنــدە باوە : شەری کوپکان لە سەر دیلانن ، ب 25 / ر. دیماهیێ (د) .

● لەورانێ دنیڤـا ئەکـرادان دا . . ئەڤـە مەسـەلـەکی مەشهورە کو شەرێ کوپەکان لسەر دیلانن . (م) .

- دیـارە (د)ێ نەشیـایـە پەیڤێن ڤێ مەتەلێ راڤەکەت - هەرچـەندە ئەو بخۆ مانا وێ ددەت و دبێژیت (واتەشەری پیـاوان لەسـەر ژنـانە) لێ دیارە ئەڤە ژ روسی وەرگرتی یە . لێ پەیڤێن مەتـەلێ بخـۆ نەکاری‌یە راڤەکەت ژ بەر هندێ نەشیـایـە بزوێنـا بۆدانیت چنکـو (مەلا مەحمودی) هۆسا نفیسی یـە (شری کوپکان لسەر دیلانن) ژ بڕ هندێ (د)ێ هەر وەکو خۆ نڤیسی یە بێکو بزوێنا بۆدانیت و دیسانەکاریە وەرگێـرتە سەر زاراڤێ کرمانجیا ژێری ژ بەر کو مانا پەیڤێن وێ مەتـەلێ هەچکـو مەگـوتی نەزانی یـە ، دڤیـا وێ گەلە بسـانـاهی مانـا وان پەیڤـان زانیبا ژ بەر کو پەیڤا (کوپەك) تورکی یـە و هەتـا نهوژی لهندە دەڤەرا لکوردستانێ دهێتە بکـار ئینـان و (دێـلان) پەیڤەکا کوردی‌یە و بزاراڤێ (د)ێ ژی هەر دبێنێ (دێ) یان (دەڵە) واتە (سەگی مێ) .

- 11 -

کوردەکان هەتا خویندار ، (حەقدار) نەبینن تۆڵەی خۆیان ناســەنن وحــەزیش لە کوشتـار ناکـەن لەشـەرو رێ‌گریدا خەڵك دەگرن وئازاری ئەدەن ، پاشان بەڕەڵلایشی دەکەن . ب 26 / ر26 (د.)

* تایفـەیێـد ئەکرادان وەکوخویندارێ نەبتن قەوی مایلی قەتلێ نینن ، دشــەرێــداو درێ برێدا مرۆڤــان دگـرن ودشەلینن و بەرددن . (م)

- نڤیســەرێ کتێبێ گوتی یـە ، هەکـە خوینـدارێ نەبینن گەلــەك حەژ کوشتنێ ناکــەن ، لێ (د.)ێ نڤیسی یــە کوردهـەتـا خوینـدارێ خو نەبینن تولاخـۆ قەناکەن وحەز کوشتنێ ناکــەن . دیســا نڤیســەرێ کتێبێ گۆتی یــە ، درێ‌برێ‌داو دشەرێدا مرۆڤان دگرن ، دشەلینن وبەرددن ، (د.)ێ نڤیسی یە دشەرێ‌داو درێ برێدا مروڤان دگرن ودئـێشینن و ئەزیــەت ددەن پاشی بەرددەن . یانی کورد مرۆڤـان ناگـرن داکـو بشـەلینن هەکـە بۆ هندێ دگرن کو ئەزیەت بدەن و هند .

- 12 -

هەتـا ئەسپی مێـردەکەی چاك ئەکاو نوی ئەرازێنێتەوە . ب 27 / ر9 (د.)

* هەتا هەسپێد مێرێد خوژی ژن خوی دکن (م.)

- نڤیســەرێ کتێبی گوتی‌یە ، هەتا هەسپێن مێرێن خوژی بخـودان دکـەن وماتی ژێ دکـەن ، براما‌نا هندێ کوژنا کورد هەمی کارەکی دکـەت هەتـا هەسپێن مێرێن خوژی بخودان دکەت . لێ (د.)ێ وە نەگوتی‌یە ، نڤیسی‌یە ژن هەسپێن مێرێن خوژی چێدکەن وبۆدخەملینن یانی زین دکەن وبەرهەڤ دکەن ، ژ بەرکو پەیڤا (ئەرازێنێتەوە) یانی دخـەملینیت وبەرهـەڤ دکـەت ئەڤـەژی گەلـە جودایە ژ (خویی) کرنێ ، یان بخودان کرنێ .

- 13 -

خۆ ئەگەر مردوکە پیاو بێت خاوەنی ئەسپ وچەك بێ ئەوە چەك و ئەسپـەکـەی لە بەردەم تەرمەکەی دائەنێت و . . . هند ب 29 / ر12 (د.)

* ئەگـەر ئەومری مێـرە خوی هەسپ وچەك وتاخومە ، هەسپێـد وی دخـەملینن وچەك وسیـلاحێـد - وی - لسەر هەسپـان گرێــدەن ئەوان هەسپـان لبـەرایکی جەنـازەی دکێشن . (م.) .

- نڤیسەرێ کتێبێ گوتی‌یە هەکە ئەومری مێربیت وخودان هەسـپ وچەك وتشـت بیـت دێ چەك وتشتێت وی ل هەسپێ وی کەن وخەملینن ولبەراهیا تەرمێ وی کێشن ، هەتـا دبـەنـە سەر گۆرێ لێ (د.)ێ گۆتیە هەکە ئەومری مێربیت خودان هەسپ وچەك بیت دێ هەسپ وچەکێن وی دانە دەڤ - بەر - تەرمێ وی .

- 14 -

ئەگـەر پیـاو بو ئەوجلە گرانـانـەی وەك یالـتـۆ ، شەروال ، عەبــای سەر شانی مردووەکــە ئەخنـە سەر تەرمـەکـەی‌و ئەبرێتە سەر قەبران . ب 30 / ر3 (د.)

* ئەومری ئەگـەر مێـرە لباسەکێ وی بەقیمەت مەسەلەن

قاپوت ، کورك ، یاخو شاللێ ببها داڤێژنه سەر جەنازەیا وی وئەگەر ژنە دیسانێ لباسەکێ وێ ذی قیمەت داڤێژنە سەر جەنازەیو . . . هتد (م.)

ـ نڤیسەرێ کتێبی گوتی یە ، قاپوت ، کورك ، شال ، لێ (د.)ێ نڤیسی یە پالتۆ (قاپوت) ، شەروال ، عەبای سەرشان (کورك) دیارە (د.)ێ پەیڤا شال کریە شەروال ئەڤەژی راست نینە . ژ بەرکو ئەوکوزدێن (مەلا مەحمودی) لسەر ئاخفتی ئەو (شەروالا) ناکەنە بەرخو ، ئەو شەل و شەپکا دکەنێ وشەلی بتنێ ژی بهایێ خۆ نینە ودیارە ژی ژنڤیسنێ (شال)ە نەك (شەروالە) . دیسا (د.)ێ رێزکا (ئەگەر ژن بیت . . هتد) بپشت گوهێ خۆ ڤە هاڤێژتی یە

ـ 15 ـ

مەلاش بەپارە قورئان لە سەر مردووەکە ئەخوێنێ ب 30 / ر دویماهیێ (د.) .

* مەلا بەئوجرەت قورئانێ دخونن و رۆژی دوو داهنانان زادو تەعامی دبنە خیڤەتێ ، ئەو مەلا دخۆن .

ـ رێزکا دویما هیێ (رۆژێ دو داهنان . . . هتد) (د.)ێ بشت گوهێ خۆڤە هاڤێژتی یە ، دیسا ئوجرەت مهانە نینە پارەبیت ، بەلکی دێ تشتەکێ دی دەنێ نەکو پارەی ،

ـ 16 ـ

ئەگەر دوژمنایەتیەکیان لەگەل کەسێکدا هەبو هەمیشە بەدوای هەلێکدا ئەگەرێن کە تۆلەی خۆیان بسێنن وحەز بە زەرەی دوژمن ئەکەن و رێگاو بان بەدوژمن ئەگرن و یەك دوو حەوت کەسی بۆی دەرئەچێ و بریندار یان ئەکات یاخود ئەی کوژن ب 31 / ر2 (د.)

* ئەگەر دوژمنی دگەل یەکی هەن دائیم لزەرەرا وی دگەرن و قەسدا خوسارا وی دکن ودچنە ریا یەکودوو هەڤدو بریندار دکن یان دکوژن ، (م.) .

ـ نڤیسەرێ کتێبی گۆتی یە ، هەکە دژمنایەتی دگەل ئێکی هەبیت بزاڤا زیانا وی دکەن و دچنە رێکا ئێکودو ، ئێکودو بریندار دکەن یان دکوژن ، یانی دچنە رێیا ئێك ، هەڤدو بریندار دکەن و دکوژن لێ (د.)ێ پەیڤا (هەڤدو) کریە

حەفت لەورا نڤیسی یە (یەك دوو حەوت) ئەڤەژی راست نینەو باوەرناکەم (رودینکو) پەیڤا (هەڤدو) بکەتە (حەفت) وئەڤە ئێك ژ بناسێن دو دلیا منەو هەما بەر عەقل نابێژن (یەك دوو حەفت) دڤێ بێژن (یەك دوو سێ) .

ـ 17 ـ

زۆر نەنگی یە کە باوك و برای کچە بە داخوازی کەر بلێ کچەکە (شوناکەم) ب 33 / ر1 (د.)

* دئەکرادان قەوی عەیبە کو باب و برا بدت ئەو ببێژە ئەم ناستینین . (م) .

ـ نڤیسەرێ کتێبێ دبێژیت ، گەلە شەرمە بابێ کچێ ئان برایێ وێ ، وێ کچێ بدەتە ئێکی ، ئەو ئێك بێژیت من نەڤێت ، ئان ئەم نابەین . برامانا هندی کومرۆڤاینا ئێکودو نەڤێت لێ (د.)ێ نڤیسی یە گەلە شەرمە باب ئان برایێ کچێ بێژتە داخازیکەرا کچا من شوێناکەت ئان کچا من یا دبێژیت شویناکەم ورستا (د.)ێ ژلایێ زمانی ڤە دروست نینە .

ـ 18 ـ

کوردەکان وەك ئەورپیەکان خۆیان لە نەخۆشی ساری ئەپارێزن و لێی دور ئەکەونەوە بەتایبەتی وەك نەخۆشی (گرانەتا) گۆکە رەشە (رشانەوە) . ب 34 / ر9 (د.) .

* ئەوژی وەکو ئەفرەنجەکان ئیحترازێ ژ ناخۆشی دکەن ، لاکن نە ژ هەمو ناخۆشیان . . بەلکو ژ وەباو کولێرەو حالی ئەڤنە کو ساری نە ، ئێدی ژ نا خوشێید مایی نارەڤن . (م.)

ـ نڤیسەرێ کتێبێ گوتی یە (وەبا) و (کولێرە) لێ (د.)ێ گوتی یە (گرانەتا) و (کوکەرەشە) ئەڤە ژی راست نینە چنکو (گرانەتا) (وەبا) نینە . . .

گرانەتا هەر تایەکا گران بیت و مهانە نینە کو یابڤەگربیت .

ـ 19 ـ

گوایە ئەگەر مرۆڤێك موی سەری سپی و چاوی شین بوو ئەوە لەو مرۆڤە دور ئەکەونەوە وگومانی چاوپیسی لێ ئەکەن . ب 36 / ر9 (د.)

* گویا مرۆڤێ کۆسەو موزەر وچاڤ شین ببە ، ژنەزەرا وی

ئەلبەتە دترسن . (م)
- نزانم بوچی (د.)ێ گوتی یە (موی سەری سپی و. . . )
باوەر ناکەم گەلە کێم نەبن - هەکە مویێن سەرێ هەمی یا
سپی دبن لەورا دڤێ ئەڤ خەلکە هەمی ژئێك ودوو
بترسن. . هەما بەر عەقل دڤیا (د.)ێ زانیبا ئەڤە هوسا
نینە.

نڤیسەرێ کتیبێ گوتی یە، (کوسە)یانی ئەوێ موی
ل رهێن وی نەهێن و (مـوی زەر)و (چـاڤ شین) ئەڤە
لکیرێو ئاخفتنا (د)ێ لکیرێ! ئەڤەژی ئێك ژ وان
بناسانە یێن کو ئەزدوودل کریم ژ بەر کو (رودینکو)
نانڤیسیت (کوسە)یانی (سەر سپی).

- 20 -

کوردەکان ئەسپی چاکیان هەیە. . ئەسپی سپی و
مایینی کەحێل یان هەیە.

ت 39 / ر4 (د.)

* هەسپێد سپەهی و جنس دنێڤ واندا هەن. (م)
- نڤیسەرێ کتێبێ گوتی یە (سپەهی)یان باش، رند،
چاك، ژێهاتی. (د.)ێ کریە سپی ژ بەرکو نەشیایە
پەیڤا (سپەهی) راڤەکەت. باوەرناکەم ژی (رودینکوی)
پەیڤا (سپەهی) بکەتە (سپی)وئەڤەژی ئێکا دی کوبۆیە
سویچا دو دلیا من.

- 21 -

هەمیشە ئەسپەکانیان تێر ئەکەن و خواردنیان ئەدەنێ بە
تایبەتی بەروجۆ. کوردەکان هەسپەکانیان نادەن بە
کەنجێکی ناشارەزا چونکە باوەری پێ ناکەن کەسوار
چاکە.

زۆر جار رووئەدا لە رۆژێك دا دوو سێ جار ترسی و
هاوار پەیدا بێ. کوردەکان بەدرێژایی بەهار شەوو رۆژ
چەکیان هەلگرتوە هەتا ئەگەر رەشماڵە کانیشیان بگوێزنەوە
هەر بەیەکەوە هەتا ئەگەرێنەوە بۆ خانووی زستانیان کە
(لادێ)یە.

ب 40 / 4 (د.)

* دایم ئەو هەسپێد خوی زینان، جەهـ ددن و قەنج
خوی دکن. یانی ئەو قەدەر ئیعتیبارێ ناکەن کو هەسپێد
خوی زینان بین و بطەولینن، بەلکو لبەر دەرێ کونی
گرێیدن و بهاران وەکو بدەرکەتنە کۆنان چیك و سیلاحێد-
وان - دائیم شەڤ و رۆژان هەتا دکەڤنە قشلاغی خانیان-
ڤێنە - لاکن دخانیاندا ئێدی راحەتن هەوار گازی نابن.
(م)
- نزانم (د.)ێ بەیڤا (بەروی) ژکیڤە ئانی یە؟ ژ بەرکو
نڤیسەرێ کتێبێ ناڤێ (بەروییا) نە ئانی یەو (بەرویا) نادەنە
هەسپان، لێ ددەنە حێوانا، چێل و گۆل و پەزی
نەخاسمە پەزێ رەش بزنێ، مشەتر ژی (بەروی-
ماسك)ن نەکو (بەروی).

دیسا وێ نڤیسی یە کورد هەسپێن خۆنادەنەڤ وان
لاوان ئەوێن نەشەهەرەزا، چنکو باوەری پێ ناهێت کو
سویار چاکن (پشت هەسپن) سەروبنێن کتێبا (مەلا
مەحمودی) من تێکڤەدان ئەڤ ئاخفتنە بەرچاڤێن من
نەکەفت و نینە.

لێ نڤیسەرێ کیتێبێ گوتی یە ئەو هەسپێن خو، یێن
سوییار، بونێ (خوی زینان) نەکوییێن باری، ئەوان
هەسپان (ناطەولیتن)، یانی داناکەن، نابەنە ئاخویرێ،
برامانا (ژ زین ناکەن) ئەڤ ئاخفتنە (د)ێ ببشت گوهێ
خوڤە هاڤێژتی بە.

- 22 -

کوردەکان بۆخۆیان دەڵێن ماڵ و سامانمان وەکو
لادێیەکی بێ زەوی و خواردنی بەیانیان بێ نرخەو پشتی
پێ نابەسترێ

ب 40 / 16 (د.)

* ئەکراد بخۆ دبێژن کو دەولەتا مەیا قشلق و قوشلاقە بێ
ئیعتبارە، یانی هەییامە. . هتد. (م).
- جارێ هەڤوکا (رستا) بەراهیێ (کوردەکان بۆ خۆیان
دەڵێن) کو (د.)ێ نڤیسی یە، راست نینە. دڤیا نڤیسیبا
(کوردەکان خۆیان دەڵێن) چنکو رامانا نڤیسەرێ کیتبێ ژ
پەیڤا (بخو) (ب خو)یە نەکو (بۆخۆ)یە، یانی (کورد ئەو
دبێژ ن) بۆ نموونە:

(ئەز بخۆچۆم کەسێ ئەز نەبرم) (ئەز بۆخو چوم نەکو بۆ کەسێ) دیسا نزانم (د.)ێ نموونێ (لادێیەکی بێ زەوی و خواردنی بەیانیان) ژکیڤە ئینایە!! ئەڤ مەتەلە ئان ئاخفتنە دبیت نهۆ لدەڤەرەکێ هەبیت لێ نفیسەرێ کتێبێ ئەڤە نەگوتی یەو من بخۆ گولێ نەبۆیە کورد بێژن خارنا سپێدەیا یاپویچە ئان یا بێ خێرە.

- 23 -

هەندێ سواریش لە پێش بووکەوە ئەڕۆن بە خۆشی یەوە گورانی بۆ بووك ئەڵێن. . ب 44 / 8 (د.)

* میقدارەکی سواران لبەرایکێ دلەیزن و بکەیف تینە مالا زاڤای. (م)

- لڤێرە (د.)ێ پەیڤا لەیزاندن یاکری یە (دسترن) (گوانی ووتن).

- 24 -

ئەگەر یەکێك براکەی بکوژ رێ، ئەوە ئەو کەسە ئەکوژنەوە پاشان باوکیان ئەکوژن بەم جۆرە یەکو دوو یەکتری ئەکوژن و بێ ئەوەی پەندێك لە میللەتانی ترەوە وەرگرن.

ب 51 / 19 (د.)

* برای دکوژ ی کورتێ ئورتەیەیێ، ئەوەی دکوژی باب تێتن، یانی ژ یەکودوو وەکو قەبایلێد مایی عیبرەتێ ناگرن. (م).

- نفیسەرێ کتێبێ گۆتی یە، هەکە برای بکوژ ی کورتێ ئورتێ قادێ - مەیدانێ براما نا (دهێنە جهێ وی) کوری دکوژی باب دهێتە جهێ وی. یانی رەڤینا وان تونەیە، نینە، دلێرن، ناترسن لێ (د.)ێ کۆنی یە هەکە برایێ ئێکی بهێنە کوشتن دێ وی کەسی کوژن پاشی دێ بابێ وی کوژن هێڤکە جودابیا هەر دوو ئاخفتنا.

دیسا نفیسەرێ کتێبێ گۆتی یە، ژ ئێکودوو وەکو ئێلێن دی (قەبایلێن) دی شیرەتێ بوخۆ وەرناگرن، یانی شیرەتێ وەکو (قەبایلێن) دی ژئێك ودوو وەرناگرن. لێ (د.)ێ نفیسی یە بێ کو شیرەتێ (عیبرەتەکێ) ژ میللەتێن دی وەرگرن، یانی شیرەتا ژ مللەتێن دی وەرناگرن ئەڤە لکیرێ و ئاخفتنا (مەلا مەحمودی) (بێ کو شیرەتەکێ وەکو مللەتێن دی بخۆ ژئێکودوو وەرگرن) لکیرێ!!

دیسا (د.)ێ نفیسی یە (بەم جۆرە یەکدو و یەکتری ئەکوژن) ئەڤە راست نینە، دڤێ بێژین (بەم جۆرە یەکتری ئەکوژن)یان (بەم جۆرە یەکودو ئەکوژن). لێ هەکە مەگوت (بەم جۆرە یەکودوو یەکتری ئەگوژن) دێ پەیڤا (یەکودو) بیتە (ئیدیوم) و مانا خۆگوهۆریت و دێ بیتە (دەمل دەست) (دنشکێدا) (هەر وێ گاڤێ) (لەپرا)و بعەرەبی (في الحال) بۆ نمونە (هێشتا نەگوتی یەکو دو ئەو رەڤی).

- 25 -

کوردەکان هەمیشە بەدوای ئەسپی رەسەندا ئەگەڕێن و ئەیکرن ئەم ئەسپانە لەگەڵ مەرەکانیاندا لە دوڵ و دەشت ئەبن و ڕێگای ئەسبی نارەسەن نادەن تێکەڵی مەرەکانیان بێت بارگیریان وەکو ئەسپەکان شەوو ڕۆژ لە سەرمای زستان لە دەرەوە ئەبەستنەوە.

ب 52 / 19 (د.)

* ئەکراد، دگەرن و هەسپێد جنس دکرن و تینن - بەرددن - نیڤا رەڤوییێد خوو دبن ژ بوی دولێ هەسپێد بێ جنس ناهلنە نیڤا رەڤوییێد خوو بارگیرێدوان ژ ی وەکو هەسپێد قازاغان زڤستانێ ژ ی شەڤ و رۆژ ی ژدەر ڤەنە، قەوی لبەر سەرمایێ موحەکەمن. (م).

- گەلوکێ گولێ بۆیە، هەسپان نەخاسمە هەسپێن سوییاربوونێ دگەل پەزا بخودان کەن ؟. دبیت هەسپ و هێستر و چێل و گول پێکڤەبن کو دبێژنێ (گاران). لێ هەسپ و پەزا پێکڤە نابەنە چەرێ و نفیسەرێ کتێبێ هۆ نەگوتیە، گوتی یە (بەرددەن نیڤا رەڤوییا) و (رەڤوی) بۆ هێستر و هەسپان دهێت بێخش (د.)ێ پەیڤا (رەڤوی) نەزانی یە راڤەکەت، ژ بەرهندێ کریە (پەز) (مەر) وئەڤە ئێك ژ وان بناسێن دوو دلیامنە دیسا (د.)ی نفیسی یە (ڕێگای ئەسپی نارەسەن نادەن تێکەڵی مەرەکانیان بیت) یانی هەسپێ باش نەبیت ریباوی نادەن ئان ناهێلن بچیتە

ناڤ پەزی!! ما چ تێکەلی هەسپان دگەل پەزا هەیە؟ ڤێجا هەکە هەسپێ باش بیت ئان باش نەبیت دڤیا وێ لڤێرێ زانیباو هەست پێ کربا کو (رەڤوی) نەکو (پەزە) ژ بەر نڤیسەرێ کتێبێ گاڤا گوتی هەسپێ باش نەبیت ناهێلنە دنیڤا رەڤوێت خودا، بێ خش سویچەك ژ بۆ هەیە.

ئەوژی ئەوە کو دا ماهینا باش ژ هەسپەکێ خراب ئاڤز نەبیت و کوریکەکا خراب ژێ نەبیت ژ بەرکو ئەو لهەسپێن جنس دکەرن، بعەرەی (تحسين النوعية وإنتقاء الأجود).

دیسا نڤیسەرێ کتێبێ گوتی یە، بارگیرێن وان وەکو هەسپێن قازاقان ـ قوزاق ـ بشەڤ و رۆژێ لبەر سەرمایێ نە، سەرما کاری تێ ناکەت. لێ (د.)ێ نڤیسی یە بارگیرێن وان وەکو هەسپێن وان . . . هتد

ـ 26 ـ

ئاغای کوردەکان حوشتریان هەیە هەر یەکێك لەمانە دوو یاخود سێ حوشتری چاکی هەیە. ب 53 / 1 (د.)

* ئاغایێد وان یێد مەزن خوی دوە دبن ئەلبەتە قطارگ و دووسێ دوو لازمە هەبتن. (م.).

ـ لڤێرێ بەری مرۆڤ ژنیشکێڤە بریارا خولسەر بدەت دڤێ هندەك هزرا خو بکەت پاشی باخڤیت لێ ژ بەر هندێ هەبون و نەبونا حێشترێ ئەم دێ ڤەدەینە رەخەکی و دێ هێینە سەر ئاخفتنا (د.)ێ وێ پەیڤا (دوە) کریە حێشتر ئەڤەژی راستە هەکە هاتو پەیڤا (دوە بکەینە (دەوە) یان (دەڤە) ژ بەرکو بزمانێ تورکی دبێژنە حێشترێ (دەڤە). لێ لنك من هەکە کوردا (حێشتر) هەبن، نەئەو حێشترن ئەوێن ئەم دزانین ولدەشتێ دبینین ژ بەر کو ئەو رەنگێ حێشترا ل ناڤ چیاو لبەر سەرمایێ ناژین. کوردا وەکی گەلە مللەتێن دی،

فارس و تورك و ئەفغان و تاجیك و قرغیزا رەنگەکێ حێشترێ بۆخۆ بکار ئینا بەکو پشتا وێ لدوو جها یا بلندە و بعەرەبی دبێژنێ (ذات السنامين) وکورد دبێژنێ (دلول).

دیسا هەر لوی جهی پەیڤا قطارگ هاتی یە کو دویر نینە ژ (قطارا) عەرەبی وەر گرتبیت. برامانا (قافلە)، دبێژن قطارگا فلان کەسێ هات و لڤێ دویماهیێ هەڤالان لئێکەتی یا تورڤانین دهوکێ گۆتنە من (قطارگ)یانی (هێستر) لێ (د.)ێ ئەڤ پەیڤە پشت گوهێ خوڤە هاڤێژتی یە.

ـ 27 ـ

ئەگەر پیاوکوژ یەك ماڵ و سامانێکی بوو ئەوە نیوەی خوێنەکە ئەداتە حەقدار و نیوەکەی تریش ئەداتە دراوسێ ئیتر یەك یارمەتی ئەویتر ئەدات و دوژمنایەتی نامێنێ. ب 55 / 14 (د.).

* ئەگەر خوندارێ هەیە ماڵ و قودرەت نیڤەکا خونێ خوندار ددەو نیڤەکا دن جیران، هەر کەسەك میقدارەکی ددن و یاری کاری دکن. ئەو خونێ تەمام دکن (م).

ـ (دکتورێ) نڤیسی یە هەکە خونیداری هەبی بیت، نیڤا خوینێ دێ دەتە خوینداری خۆ و نیڤا دی دێ دەتە هەڤدەران ـ جیران ـ باشە هەڤدەرێن وی چ تێکەلی دگەل هندێ هەیە کو خوینێ وەرگرن. !! بەروڤاژی دڤێ هەڤدەرێن وی بدەنێ، باشە هەکە بێژین بهزار دیناران ئەو هەڤدەرین خو هەچکو (د.)ێ گۆتی باشە (500) یێن خوینداری دێ کی دەت؟ نڤیسەرێ کتێبێ گوتی یە: نیڤا خوینێ خوندار دێ دەت و نیڤا دیتر هەڤدەرێن وی. برامانا عەشیرا وی. یانی عەشیراوی دێ نیڤا خوینێ دەت و هاریکاریا ویکەت ژ بەر کو خوینداریێ وی خوینداریێ هەمی عەشیرا وی یە (شیرکێشێن ئێکن).

هەکە رامان ژ، دانانا پارا بۆ هەڤدەران ئەو بیت کو گونەها خۆ ژ سەرخو هەلینیت دێ بوچی دەتە هەڤدەران، دێ دەتە ژاراو مشەتر دێ چیتە حەجێ.

لێ سویچا نەزانینا (د.)ێ ئەو بۆیە کووێ نەزانی یە پەیڤا (دن) راڤەکەت (نیڤەکا دن جیران) دکتورێ راڤەکریە (نیڤەکا ددن جیران یانی (نیڤەکا ددنە جیرانا). لێ راستیێ وێ هۆسایە (نیڤەکا دی جیران) یانی (د.)ێ پەیڤا (دن) کو (دی)یە یاکریە (ددنە) وئەڤەژی ئێکادی یە بۆیە بناسێن دوو دلیا من.

- 28 -

بو نموونه: مەرو رەشمال و پارەیان ب. 67/ ر9/ (د.)

* مەسەلەن پەزو دەوارو دراڤ (م.).

- (د.)ێ پەیڤا (دەوار) وەکو زاراڤێ سلێمانیێ راڤەکریە. ئەو دبێژنە (کوینا) (دەوار). ژ بەر هندێ پەیڤا دەوار کریە رەشمال و نەزانی یە کو بزاراڤێ کرمانجیا ژۆری (دەوار) یانی (وولاخ) ولگەلە جهێن دی پەیڤا (دەوار) هاتیە کو دیارە (رەشمال) (کوین) نینە. بونموونە (مەلا مەحمودی) گوتی یە:

ئەگەر زڤستانێ دەوارەکێ وان بنەمرێ خودێ تەلەف ببتن... هتد. (د.)ێ دیسا نڤیسی یە: ئەگەر لە زستان رەشمالەکەیان خراب بوو... هتد. باوەر ناکەم (رودینکو) پەیڤا دەوار بکەتە (رەشمال) ژ بەر چ نەبیت ئەو زاراڤێ سلێمانیێ نزانیت و ئەڤەژی دیسا یا بۆیە ئەگەرا دوو دلیا من کو چێدبیت - هەکە هەمی نەبیت - لگەلەك جها (د.)ێ ئێکسەر ژ ئێکستا کوردی وەرگرتی یە هەکە وەسا نەبیت دێ چەوا (دەوار) بیتە (رەشمال) (کوین). ؟

- 29 -

مێردەکانیان دەست ناخەنە کاروباری ژنەکانیانەوە..
ب 67/ 12 (د.)

* مێردوان تەڤی وان مالێد ژنان نابن و ناخون. (م.)

- رامانا نڤیسەرێ کتێبێ ئەوە کو مێرێن وان نێزیکی - نەختێ - ژنێن خۆ نابن و خۆ تێکەل ناکەن و ناخون، نەکو خۆ تێکەلی (کاروبارێ) ژنێن خۆ ناکەن هەچکو (د.)ێ نڤیسی ژ بەرکو پەیڤا (کاروبار) گەلە بەرفرەهیە یانی هەمی شۆلێ ژنان دگریت لێ (مەلا مەحمودی) گوتی یە (مال) و هند، نەکو (کاروبار).

- 30 -

لەهەندێ کاتدا ئەوزورداره ئەبێتە مەخسەرەوپێکەنینی خەڵکی.

ب 68/ 4 (د.)

* دهندەك وەقتیدا ئەوزالم بەر طەرەف وقەهر دبتن (م.)

- (دهندەك وقتیدا) چێدبیت مرۆڤ راڤەکەت (دهەیامەکێ کورت دا) و دبیت راڤەکەت (دهندەك جاران دا) وبەیڤا (مەخسەرە) کو (د.)ێ نڤیسی یە ئەو بخۆ عەرەبی یەو (مەسخەرە)یە، نەکو (مەخسەرە) و شوینا پەیڤا (بەرطەرەف و قەهر) کو (مەلا مەحمودی) نڤیسی یە، ناگریت. ژ بەر کو (بەرطەرەف و قەهر) یانی (بتنێ، تیرو دبیت، نامینیت، دشکێت، دەسەلات داریاوی دچیت). یانی بعەرەبی (یعزل، وحید، یهمل، یبتعد، یقصی) لێ (د.)ێ هەچکو مەگوتی کریە (مەسخەرە یانی (پێ ترانك) جهێ پێکەنینێ و ئاخفتنا وێ گەلەکا دویرە ژ یا (مەلا مەحمودی) هەر چەندە - تحصیل حاصل - دێ بیتە پێ ترانك لێ (قەهرو بەرطەرەف) (مەسخەرە)نینە.

- 31 -

پیرانیش سەلاوات بلاو ئەکەنەوە... ب 71، ر13 (د.).

* پەران سەدەقە بەلاڤ دکنە ژاران... (م.).

- پەران یانی (پاران) (پارە) نەکو پیران هەچکو(د.)ێ نڤیسی یە کێ گولێ بویە بێژن پیر سەلاواتا بەلاڤ دکەن !! یاراست پاران سەدەقە - بۆخێر - لسەر ژاران بەلاڤ دکن. ئەڤەژی ئێك ژ وان سویچانە کو ئەز دودل بویم ژ بەر کو (رودینکو) پەیڤا (پەران) ناکەتە (پیران)

- 32 -

ئەم تایبەتی یە هەر فەلەکانی نەگرتۆتەوە بەڵکو کوردە دەوار نشینەکانیش گرتۆتەوە کاتێ ئەچنە دێی مسلمانە کوچەریەکان هەمان دەستوریان هەیە. ب 73/ 2. (د.)

* ئەڤە خاس بفەلان نینە، بەلکو وەکو ئەکرادێد خیمە نشین دبنە قشلاغێ مسلمانێد گوندی خوجهی، پیرلو، دیسانی ئەکراد ئەڤێ معاملەیێ دگەل وی مسلمانێ پیریو ژی دکتن (م.)

- لبەراهیێ هێڤکە ئاخفتنا (د.)ێ کو دبێژیت، (ئەڤ تایبەتی یە هەر فەلان بنێ ناگریت بەلکو کوردێن کوچەر-

رەڤەند ـ ژ ی دگریت، دەمێ دچنە گوندێن موسلمانێن کوچەر هەر ئەو رەوشت بی هەی). باشە مروڤ تشتەکی ژڤی ئاخفتنێ شەدکەت؟ ئان تێدگەهیت؟.

هێڤکێ، کتێبا (مەلا مەحمودی) دبێژ یت: کوردێن کوچەر زوٚرداریێ لڤەلان دکەن، لێ ئەڤ زوٚرداریە تایبەت نینە بڤەلان ڤە بەلکو دەمێ ئەو کوچەر دبنە میهڤانێن موسلمانێن گونداژی هەر وێ موعاملێ دگەل دکەن.

ـ 33 ـ

هەتان ئەگەر بوٚ ئاو هێنانیش بێت بێ دەمانچە ناروٚن.

ب 82/ 2 (د.).

* بێ شەشخانە ناچنە سەر ئاڤێ ژ ی (م.).

ـ لبەراهیێ (شەشخانە) (دەمانچە) نینە لێ تڤەنگە و وەرگێریێ بخوٚ دبەرپەرێ (82) ێدا رێزکا (8)ێ کوتی یە (تفەنگی شەشخانە ئەکرن.... هتد). دیسا (بوٚ ئاو هێنان) یان (بوٚ ئاڤ ئینانێ)نینە ژ بەرکو پەیڤا (سەر ئاڤێ) (ئاڤ ئینان نینە).

جارێ مێرە تڤەنگێ هەلدگریت و مێر ئاڤێ نائینیت. دیسا مهانە نینە (سەرئاڤ) (ئاڤ ئینان بیت) بوگەلە تشتا مروٚڤ دچیتە سەر ئاڤێ. لێ رامانا نڤیسەری لڤێرێ ژ پەیڤا (سەرئاڤێ) (دەست ئاڤە) یانی (مێزتنە) ژ بەرکو نڤیسەری ئەڤ نمونە ئینایە ژ بو خویا کرنا هوشیاری و چاڤ ڤەکرنا مروڤێ کوردو نهو ژی دبێژن، هەتا کو بچیت بمیزێت فلان تشتێ ڤێ، لێ ژ بەر کو پەیڤا (میزتن) جوان نینە بوٚ ئاخڤتنێ لەورا دبێژن (سەر ئاڤێ).

ـ 34 ـ

ئینجا ئەو بووکە دێننە دەرەوەو ئەیخەنە ناو شایی یەکەوەو دوای توٚزێ هەلپەرکێ ئەبێت گورانی بلێت. ئەگینا هیچ چارە نی یەو هەر ئەبێت گورانی بلێت.

ب 84/ ر3 (د.).

* پاشی ئەوێ بووکێ دبن و دئێخیننە گوڤەندێ، ئەلبەتە بوك ژی دێ چەند گرکان بلەیزتن چارە نینە. (م.)

ـ گەلوکێ گولێ بوٚیە، بهیستی یە، نوکەو بەری سەدەها سالاو لهەمی دەڤەرێن کوردستانێ بویك لداوەتا خو بسترە، یانی سترانا بێژیت؟. بویك بهزار حالا هەتا دهێت گەرەکا داوەتێ دکەت.. پاشی نزانم پەیڤا (گورانی) یانی ستران ژکیڤە هاتی یە!! هەما چ نەبیت وەکی رەوشتەکێ فولکلوری کەنگی دفولکلورێ کوردیدا هاتی یە بویك سترانا بێژیت. (مەلا مەحمودی) گوتی یە: بویك چەند گەرا دێ بلەیزیتن چارە نینە ئەڤە راستەو نهو ژی هەیە. لێ (د.)ێ شوینا لەیزاندنێ کریە (ستران). باوەرناکەم (رودینکو)ی هوٚ گوتبیت.

ـ 35 ـ

خو ئەگەر زاوا گرێدرابوو نەبوبەزاوا ئەوە گەنجەکان زاواکە ئەبەن و پال بوك و پێکەوە ئەیانوسێنن.

ب 84/ 8 (د.).

* شاید ئەگەر زاڤا گرێدایی بتن وگردك نەبتن ئەولاوێد داوەتێ ئەوی زاڤای دبن و دئێخنە چەمێ ئاڤا سار پاشی تینن زاڤای فرێدکن نك بویکێ گردکی. (م.)

ـ بەرێ خوٚبدێ (د.)ێ پەیڤا (فرێدکن) کریە (ئەبەن) کو دڤیا بێژیت (ئەنێرن). لەورامانا ئاخفتنا وێ دروست نەهاتی یە ژ بەرکو (فرێکر) یانی گوتێ هەرە، هنارت، ئەو بخودێ چیت کەس نابەت. لێ پەیڤا (برن) یانی دگەل خوٚبر، بنێ ناچیت. هێڤکێ (مەلا مەحمودی) گوتی یە: هەکە زاڤا نەشیا چ بکەت لاوێن داوەتێ دێ زاڤای بەن کەنە دچەمەکێ ئاڤا ساردا پاشی دێ ئینن (ڤریکەنە نك بویکێ). لێ (د.)ێ نڤیسی یە هەکە زاڤا نەکاری چ بکەت لاوێن داوەتێ دێ زاڤای بەن کەنە دچەمەکێ ساردا، پاشی دێ بەنە نك بویکێ و دێ پێکڤە نویسینن.

# پێك هاتنی ووشه له شێوەی سلێمانیدا

نووسینی : دەیڤەد مەکەنزی

وەرگێرانی: غازی فاتح وەیس

ووشەی لێکدراو

1 ـ ووشەی لێکدراو سێ جۆرە :

أ ـ ووشەی لێکداروی ئاسایی و باو

بریتیە لەدوو ناوی هاوبەش وەیا دوو ئاوەڵناو وبەهۆی ئامـرازی پەیوەستەی «و» و نیمچە ڤاوڵی «و» (1) لێك ئەدرێن و هەیکەلێکی ستیتاکسی تەواو پێك دێنن ، بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| بەژن و باڵا | دەم و چاو |
| دەنگ و باس | درۆو دەلەسە |
| دەست و پل | هات و چۆ |
| هات و نەهات | نەرم و شل |
| ڕێگاو بان | تەنگ و چەڵەمە |

جۆرێکی دیکە کە کەمتر باو بێ ئەوەیە کە دوا دەنگی بەشێکی ووشە لێکدراوەکە وەکو . ، دوادەنگی ئەو بەشەکەی تر ئەبێ ، واتە جۆرە سەروایەك لەنێوان دوا دەنگی هەردوو بەشی ووشە لێکدراوەکە پەیدا ئەبێ ، بۆ نموونە :

ئێسك و پروسك
چاو وڕوو
جێ و ڕێ
ڕێك و پێك
شل و مل

ب ـ دووبەش بەهۆی پرپیۆزشنێکی سادەوە ، وەیا بەهۆی مۆرفیمێکی هاوچەشنەوە کە هیچ پێناسەیەکی جودای نەبێ لێك ئەدرێن و ووشەیەکی لێك دراو پێك دێنن لەئەنجامی ئەم لێکدانەدا ناوێك وەیا ئاوەڵناوێك وەیا ئاوەلکارێك دروست ئەبێ بۆ نموونە :

دەمەو نوخوون
دەستەو ئەژنۆ
پاشە وپاش

ـ او
چەشناوچەشن
گۆشاوگۆش
پێچاوپێچ
ڕەنگاوڕەنگ

ـ بە
دەس بەجێ

هەپروون بەهەپروون
جێ بەجێ
- بەرەو
سەر بەرەو خوار

ج - دووبەشی جودا ، بەتایبەتی رەگی فرمان ، ناوێکی لێکدراو وەیا ئاوەڵناوێکی لێکدراو وەیا ئاوڵکارێکی لێکدراو پێك دێنن ، بۆ نموونە

| | |
|---|---|
| ئەنجن | ئەنجن |
| بچڕ | بچڕ |
| تك | تك |

بەشێکی گرنگی ئەم جۆرە بەهۆی مۆرفیمی « دەنگە دەنگ »ەوە دروست ئەبێ بۆ نموونە :

جروە جرو
قاسپە قاسپ
خرتە خرت

ڤاوڵی کۆتای بەشی یەکەم (5) ڤاوڵی لێکدان نییە ، بەڵکو بەشی یەکەم بەجیا دەرئەکەوێ و هەمان واتا ئەبەخشێ کە وشە لێکدراوەکە ئەیبەخشێ و ئەم ڤاوڵەشی لەگەڵدایە ، بۆ نموونە :

جروە ، قاسپە

2 - ووشەی لێکدراوی دەستنیشان کردن لەوەیە یا سەربەخۆبێ وەیا وەسفی .

أ - ووشەی لێکدراوی سەربەخۆ دووجۆرە .

1 - ناوێك بەناوێکی دیکە دیارخرابێ و لەهەندێ حاڵە تیشدا پێوەندی لەگەڵدا هەبێ و بەشێوەیەکی گشتی ئەبێتە ئیزافە - ئەم ووشە لێکدراوانە لەگەڵ دیارخەردا دەرئەکەوون و پێشی دیارخراو ئەکەوون وەیا بەپێچەوانەوەو لەهەردوو حاڵەتەکەدا بەهۆی ڤاوڵی لێکدانی (5)ەوە ، وەیا بەبێ ئەم ڤاوڵە دروست ئەبن ، بۆ نموونە

وەستاژن
براژن
چێشتەنگاو
دێوجامە
مەرزەجاڕ

هەروەها لەگەڵ ڤاوڵی لێکدانی (5)دا :

بوومەلەرزە
هەورە برووسکە
نرگسە جاڕ

هەروەها هەڵەوگەڕاو وبێ ڤاوڵی لێکدان ، وەکو

چالاو
هیزەرۆن
کلافە دەزوو
کوورە هەنگ

ولەگەڵ ڤاوڵی لێکدانی (5)دا بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| چەپکە گوڵ | چەرمەگا |
| دەنکەجۆ | گوڵەباخ |
| گوڵە گەنم | کلکەبێڵ |
| کونەلووت | |

2 - رەگی فرمانی کاتی ئێستا وەیا ڕابوور دووبەهۆی بەرکاری پێشیەوە ، وەیا تەواوکەرەوە کورت ئەکرێتەوە . بۆ نموونە :

ڕەگی فرمانی کاتی ئێستا :

باوەشێن بەرگ دروو
بزن مژ دار فرۆش
مۆرهەڵکەن پیاو کوژ
سەرتاش خوێن ڕێژ
زۆرزان

تێبینی : لەگەڵ ڕەگی فرمانی کاتی ئێستای نائاسایی « لێ »دا ئەفیکس مەرجی « بێ »ی تێدایە وەکو « زۆر بلێ »
ڕەگی فرمانی دابوور دوو : (2)
دەست کرد
دەست کەووت
سوورەوە کراو

ب ـ ووشـــەی لێکـــدراوی وەسفی بریتییـە لە ناوێـك کە بەهـۆی ناوێکی تری بەرانبەر ، وەیا بەهۆی ئاوەڵناوێکەوە دیـارئـەخـرێ . ئەگـەر دیـارخەر ناوێکی بەرانبەربێ ئەوا پێشی ناوە دیارخراوەکە ئەکەوێ ، بۆ نموونە :

چڵکاو
شارەگ
شاهەنگ

و لەگەڵ ڤاوڵی لێکداندا ، بۆ نموونە :

ساڵەو وەخت

بەڵام بەشێوەیەکی ئاسایی دوای ناوە دیارخراوەکە دێت ، وەکو :
بووکە شووشە
دارە بان

ئەگـــەر دیـــار خەرە کە ئاوەڵنـــاو بێت ئەوا لێکـــدانـــەکـە بەپێچەوانەوە هەڵ ئەگێرێتەوەو بەجۆری « کراوە » ئەدرێتە قەڵەم ، بۆ نموونە :

بزنە کێوی
قارچکە مارانە

هەروەهـا چەند ووشەیەکی لێکدراوی هەڵ نەگۆڕاو بەدی ئەکرێ ، بۆ نموونە :

فەریکە نۆك
کۆنە فاحیشە
مزرە سێو
نەرمە زین
(شێوەی موکری)
گەرمە شین
ناسکە تیر

3 ـ ووشـــەی لێکـدراوی ئاوەڵنـاوی یا ئەبێتـە خاوەنێتی « تملك وەیا ئەبێتە ئامرازی .
أ ـ بەشێـوەیـەکی گشتی ووشـەی لێکـدراوی خاوەنێتی ، ووشـەیـەکی لێکـدراوی وەسفیەو واتاکەشی ئاوەڵناوییە بۆ نموونە :

بەدکار
دوو ڕوو
گەردن بلوور
گران با
کەوە ڕۆژ

وە لەگەڵ ڤاوڵی لێکدانی (5)دا ، بۆ نموونە :

کورتە باڵا

هەروەهـا بەشێوەیەکی گشتی هەڵ ئەگێررێتەوە بێ ئەوەی قاوڵی لێکدانی تێدابێ ، بۆ نموونە :

ئێسك سووك
ئێسك قورس
باڵابەرز
چاوشین
دڵ تەنگ
دڵ تەڕ
داوێن پیس
هەناسە سارد
کەیف خۆش
سەرگەرم

ب ـ پریبۆزیشنی «بە» و «بێ» ژمارەیەکی زۆری ووشەی لێکدراوی ئاوەڵناوی پێك دێنن . بۆ نموونە :
بە :

بەگوێ
بەجێ
بەکار
بەووەنەوز

بێ :
بێ گوێ
بێ هۆش
بێ قەزا

**« پاشگر »**

4 ـ ئەم پاشگرانەی خوارەوە ناو پێك دێنن
أ ـ ناوی مەعنەوی (مجرد)

(ی) : ئەم پاشگرە ناوی مەعنەوی لەئاوەڵناو دروست ئەکا ، بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| ئاگاداری | ئاسانی |
| ئاشکرای | بۆشی |
| چۆڵی | گەورەی |
| کورتی | خۆشی |

لەگەڵ ئاوەڵناودا بۆ پێوانە کردن و لەگەڵ (ای)و(آیەتی) دا ئەگۆررێتەوە ، بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| ئەستووری | ئەستوورایی |
| بەرزی | بەرزایی |
| درێژی | درێژایی |
| گەرمی | گەرمایی |
| قووڵی | قووڵایی |
| بڵندی | بڵندایەتی |

لەگـەڵ ئاوەڵنـاوی دیکـەدا ، ئەگـۆڕدرێنەوە بە « یەتی » و «ێتی »، بۆ نموونە :

| | | |
|---|---|---|
| ئازای | ئازایەتی | |
| بەندەی | بەندایەتی | |
| کەمی | کەمێتی | |
| پانی | پانای | پانێتی |

هەروەهـا (ەتـی) ، یەتـی و(یـاتـی) ، (ێـتـی) ـ ناوی مەعنەوی لەناو وڕاناو ، وەیا ئاوەڵناودائەرێژی ، بۆنموونە :

ئاغایەتی
برایەتی
دۆستایەتی

دوژمنایەتی
حاکمایەتی
پیاوەتی
شارستانیەتی
خزمایەتی
چۆنیەتی
کێیەتی
برسێتی
چاکیەتی
تینوێتی

| | |
|---|---|
| یەکیەتی | یەکێتی |

( ێنی )

ئەم پاشگـــرە زۆر کەم تر ناوی مەعنـەوی پێـك دێنێ ، بۆ نموونە :

بووکێنی
چاوێنی
کچێنی
کورێنی

ب ـ بچووك کردنەوە ـ

پاشگـری (ـ چ ـ)و(ـ ك ـ)و(ـ ل ـ) و(ـ ڵ ـ) بەجـۆرەهـا لێك ـ دان ناوی دارێژ راو پێك دێنن وجارجاریش ئاوەڵناو ، کە ئەتـوانـرێ بەشێـوەیـەکی گشتی ناوی بچـووك کردنەوەیان لەبنرێ وبەم جۆرەی خوارەوە :(3)

| | |
|---|---|
| ـ چە | باخچە ، ناوچە |
| ـ چکە | رێچکە ، خانووچکە |
| ـ ەك | دەستەك ، رانەك |
| ـ(IK) | دەسك ، جووجك |
| ـ کە | دۆڵکە ، لووتکە ، ملوانکە |
| ـ ەکە | پوولەکە ، توورەکە |
| ـ ۆك | تیرۆك |
| ـ ۆکە | بارۆکە ، فرفرۆکە ، جنۆکە |
| ـ کەلە | خرکەلە |
| ـ لە | مێروولە ، پشیلە ، قوتیلە |
| ـ لەکە | جوولەکە |
| ـ یلە | ئەمووستیلە ، گورچیلە ، کەرێڵە |
| ـ وولە | دانوولە ، جاشوولە ، مێشوولە |
| ـ وولکە | داسوولکە ، پاچوولکە |
| ـ ڵە | گۆزەڵە ، جووجەڵە |
| ـ ەڵە | گردەڵە ، سەوزەڵە |
| ـ ۆڵە | کچۆڵە ، بچکۆڵە |
| ـ ۆڵکە | دیزۆڵکە ، گردۆڵکە ، تەپۆڵکە |

ج ـ ناوی تەواو

پاشگری ( ـ گا ) ناوی شوێن پێك دێنێ .

ئۆردووگا
کۆگا
رێگا
سەیرانگا
تاڤگە

ـ ەڵان (لە بنگرد وپشدەر ـ ەڵێن) جۆرە ناوێك پێك دێنێ و واتای دەشتایو پان و بەرین ئەگەیەنێ ، بۆ نموونە :

بەردەڵان
قامیشەڵان (لەبنگرد قامیشەڵێن)
سەوزەڵان

نەرمەڵان
زیەڵان (لەپشدەر زیەڵێن)
زیخەڵان

ـ ستـان ناوپێـك دێنێ بەواتای شوێن وەیا وولاتی . . . ،
بۆ نموونە :

دارستان
جەنگەڵستان
کوردستان
کوێستان
قەبرسان
شارستان

ـ ەوان ، ـ چی ، ـ گەر ، ناوپێك دێنن بەواتای پیشەوەیا
کار ، بۆ نموونە :

ئاشەوان
باخەوان
کەشتیوان
مەلەوان
پاسەوان
شاخەوان
تۆرەوان
بۆیاخ چی
چایچی
قاچاغچی
راوچی
تەنەکەچی
ئاسنگەر
چەقۆگەر
مسگەر

ـ دان : ناو دروست ئەکا بەواتای شت هەڵگر ، بۆ نموونە

چرادان
دەرزیدان
فیشەکدان
جزدان
مۆمدان
مناڵدان
میزڵدان

ـ دار : ناوو ئاوەڵناو دروست ئەکا بە واتای خاوەنی . . . ،
بۆ نموونە :

ئەمیندار
بەیداخدار
بەشدار
دوکاندار
دڵدار
دەردەدار
میواندار
ئاگادار
ئەستێرەدار
باڵدار
داندار
زیاندار

ـ کەر ، کار : زۆرکەم ئەبنە (گار ، یار)و ناوو ئاوەڵناو پێك
دێنن بەواتای دروست کەرو پێك هێنەر ، بۆ نموونە :

چێشت کەر
نان کەر
راوێژکەر
کارەکەر
سواڵکەر
شەرکەر
ئارەزووکەر

ئیشکەر
نوێژکەر
هەرزەکار
کرێکار
پارێزگار
جووتیار
کریار

ـ باز : ناودروست ئەکا بەواتـای خووگـرتن وەیا فێربوون بەکردنی شتێك بۆ نموونە :

هەتیوباز
قومارباز

ـ ێن : (هــەولێــری (انێ)) ناوی یاری پێــك دێنێ ، بۆ نموونە :

هەلووکێن
هەڵماتێن
موشێن
فتبۆڵێن
شەترەنجێن
تۆپێن (هەولێری (تۆپانێ))
زۆران (هەولێری زۆرانێ)

د ـ فرمانی
ـ ۆك
ـ نۆك

ناوو ئاوەڵنــاو لەڕەگی فرمــان پێــك دێنن وواتـای کردنی پیشەیەك ئەگەیەنن ، بۆ نموونە :

گەڕۆك
گرینۆك
ترسنۆك

ـ ەر
ناوی کردار لە رەگی فرمان پێك دێنێت ، بۆ نموونە : (4)

کوژەر
نووسەر

ـ ەمەنی
ناوی کەرەسـە لەڕەگی فرمـانی رابووردوو دائەڕێژێ ، بۆ نموونە :

سووتەمەنی
خواردەمەنی

ـ ە
ناوی دەنــگ لە مۆرفیمی سەربـەخـۆی فرمـانی تێپـەڕی داڕێژ راو پێك دێنێ بەزیاد کردنی مۆرفیمی سەبەبی ، بۆ نموونە

بۆڵە : بۆڵانن
بارە : بارانن
فیکە : فیکانن
حیلە : حیلانن

هەروەهـا ئەم جۆرە ناوانـە جووتـە ووشـەی لێکـدراو پێك دێنن ، بۆ نموونە :

گیڤەگیڤ
قرچە قرچ
ڤیژە قیژ

4 ـ ئەم پاشگرانەی خوارەوە ئاوەڵناو دروست ئەکەن

ـ ی

ئاوەڵناوی جۆر وەیا شوێن پێك دێنێ ، بۆ نموونە :

بازاڕی
کوێستانی
لادێی
مشکی
قاوەیی
هەولێری
هەورامی

ـ ین

ـ اوی

ئاوەڵناو لە ناو دائەڕێژن و بەشێوەیەکی سەرەکی واتای کەرەسە ئەبەخشن ، بۆ نموونە

ئاگرین
ئاسنین
ڕەنگین
ئارداوی
بەفراوی
قوراوی
خۆڵاوی
خوێناوی

ـ ین

ئاوەڵناوی چۆنیەتی لەناو دائەڕێژێ ، بۆ نموونە :

ئەسپێون
چڵکن
گۆشتن
کوڵکن
کرمن
لیکن
قژن
تووکن
وورگن

ـ مەن :

ـ مەنگ :

ئاوەڵناو دروست ئەکەن و واتای خاوەنی شتێك ئەگەیەنن ، بۆ نموونە :

ئاقلمەن
فەرەزوومەن
دادمەن
دەوڵەمەن
دەردمەن
هونەرمەن

ـ دار :

ئاوەڵناو پێك دێنێ بەواتای بدەرێ شتێك ، بۆ نموونە :

ئاگادار
فەرماندەر

ـ کار :

ـ باو :

ئاوەڵناوی ڕەنگ دیار ئەخا ، بۆ نموونە :

ڕەشکار
سپیکار
سوور باو
شینکار
شینباو

ـ انه :

ئاوەڵناو پێك دێنیّ و زۆر ئاوەڵكار ، بۆ نموونه :

مارانه
مانگانه
سالانه
ئانمایانه
ئازایانه
برایانه
پیاوانه
شێرانه

5 ـ له شێوەی سلێمانی و سۆرانی و موكریدا فرمانی تێنەپەڕ ، نیشـانـەی كۆتـای ڕەگی فرمـانی رابـووردووی (1) و نیشانەی (ان)ی جاووگی لەگەڵدایه ، بۆ نموونه :

برژان ، كولان ، سووتان ، شكان هەروەها لەگەڵ چەند فرمـانێكی دیكـەدا (آ)ی ڕەگی فرمـانی رابـووردوو ئەبێته (ی) بۆ نموونه :

| | |
|---|---|
| قەوما | قەومین |
| رما | رمین |
| رزا | رزین |
| تۆقا | تۆقین |
| خورا | خورین |

فرمـانی تێپـەری هاوچـەشن له تێنـەپەرەوە دروست ئەبیّ و ئەبێته شێوەی سەبەبەن ، بۆ نموونه :

برژانن
كولانن
سووتانن
شكانن

تۆقانن
خورانن

لەنـاوچەی (وەرماوەی هەڵەبجه) فرمانی تێنەپەری ئاسایی نیشانەكەی (یا) و (یان)ی كۆتای ڕەگی فرمانی رابووردووه ، بۆ نموونه : (5)

برژ یان
كولیان
سووتیان
شكیان

(هێشـووه كوننانتی سەرەتای ووشه لەشێوەی سلێمانیدا ، زۆره وەكو «شكان» . )

پەراوێزەكان :

1 ـ «و» ئەبێتـه نیمچـه ڤاول ئەگـەر بەشی دووەمی ووشـه لێكدراوەكه به ڤاول كۆتای هاتبیّ . (وەرگێر)

2 ـ «سوورەوەكراو» له سووركردنەوەوه دارێژ راوه لكاندنی پاشگـری (ەوە)ی كۆتـای فرمـان به ووشـەكـەی پێش فرمانەكەوه یەكێكه له تایبەتیەكانی ناوچەی (سنه) و زۆر له شێوەكانی خوارووی زمانی كوردی .

3 ـ ئەم ناوانه هەموویان واتای بچووك ـ كردنەوه ناگەیەنن بۆ نموونه «جوولەكه» و «پشیله» و «لووتكه» . . . هتد

4 ـ ووشـەی نویّ بەهـۆی لێكچـوانـدنـەوه لەگەڵ ناودا دروست ئەكـریّ هەروەكـو لەبـەشی پاشگـری (ـ كەر) دا باس كرا : كردن : (كـه) ، (دەر) كه لەبـەشی داهاتوودا باس ئەكریّ و (دان) و (دە) و (بەر) وەكو (بردن) و (بە) وەكو ووشەی (باربەر) و «رەنجبەر» دا

تێبینی : ئەم ووتاره له كتێبی :
( Kurdish Dialect Studies ) ی
( D. Macanzie ) یەوه وەرگێرراوه .

# طاووس گێران



خزنەلرەحمان ل مەرگەها شێخال بەعەدرێ طاووس و نیشانێد ئێزدیا چاخێ ژ گەرێ ڤەدگەریێن ل ڤێ خزنێ دادنێن

خدرێ پیر سلێمان

پەیڤا طاوس ژ چی هاتی‌یە؟ وژکەنگی وەرە ب کار دئینن؟ طاوسی مەلەك کی‌یە؟ لدوو بیر ولێکدان وئۆل وتێگەهشتنا ئێزدیا، دچی سەرکێ تەرازووێ دایە؟

ئێزدی دبێژن طاوسی مەلەك ئێکە ژ هەر هەفت ملیاکەتێت خودێ کوعزراییل وجبراییل ومیکاییل ودردراییل وشەمقاییل وعەزازیل وئیسرافیل، ئەون هەر هەفت مەلەکێت کبیر بەری خاسا چەندی بەدیل، چۆن وحزرەتا وان مەلکێ جەلیل. عەزازیل ژی ئێکە ژ وان هەفتا وئەوە یێ شیرەتا خودێ تەعالا ژ بیر نەکری وچاخێ گۆتی‌یە وان سوجدێ بۆ ئادەم ببەن ئەوی گۆتێ سوجدە بۆ تە ب تنێ یە فەرە عەزیزێ من ڤێجا خودێ تەعالا، کرە سەرۆکێ ملیاکەتا وناڤێ وی ژ حنگی وپێڤە بووە طاوسی مەلەك؛

ئێزدیا هەفت طاوس وێ دهەین هەر سال لناڤ ملەتی دگێرین هەر شەڤ ل گوندەکی دبنە مێڤان هەر طاوسەك یا دەڤەرەکە ئێزید خانێ‌یە، خۆئێزدی وەکی ژێ دبێژ ن بەرێ گەلەك دبۆش بوون ب طاوسەکێ نەهاتنە سەرراستکرن مەقلوبێ شێخا ـ کوچیایەکە دسەر مووسل را ل پشتا باشك وبەحزانێ ـ لنیڤەکا ئێزیدخانێ بوو هەر ژدەشتا حەریرێ هەتا حەلەبێ هەتا ناڤ خالتیا ل تورکیا بگرە پێلا وان گەهشتی‌یە ئەرمینیا ژی ئێزدی هند دبۆش بوون ڤێجار هەر دەڤەرەکێ طاوسەك ژێرا هەبوو:

1 ـ طاوسا ئێزی (عەنزەل) کول گوندێت مەرگەها شێخا دگێرینن هند گوند هەبوون سالەکا دەراندەر هەتا گەرا وێ تەمام دبوو نهۆ سالێ سێ گەرا ڤێ طاوسێ لناڤ گوندێت مەرگەهێ دگێرینن. .

2 ـ طاوسا شنگارێ پشتی رۆژ یێت خدرلیاس ب چەند رۆژەکا سالێ جارەکێ لدەڤەرا شنگارێ دگێرینن.

3 ـ طاوسا حەلەبێ سالێ جارەکێ دبەنە ناڤ ئێزدەیێت سوریا.

4 ـ طاوسا خالتیا: لناڤ گوندێت ئێزدیا ل تورکیا دگێرینن.

5 ـ طاوسا مسقۆف: لناڤ ئێزدیێت ئەرمینیا،

6 ـ طاوسا تەورێزی: لناڤ ئێزدیێت رەخا رۆژهلاتێ.

7 ـ طاوسا زۆزانا لدەڤەرا هەکاریا.

رەحمەتی بابێ شێخ حەجی کورێ شێخ سمایل دگۆ رێبەرێت دینێ ئێزدیا ل لالشێ چاخێ دەستە قەولزانێت ئێزدیا دهنارتنە ناڤ گوندا هەر دەستەیەك بۆ دەڤەرەکێ دا رێیا ئۆلێ وشیرەت وخێرخوازیێ لناڤ وان بەلاڤ ورۆن کەن وخێراتێ خرکەن وبزانن چی لناڤ ملەتی هەیە چی نینە؟ سەروبەرێ وان چی؟ دڤیا نیشانەك ژ جەم میرێ ئێزدیا دگەل خۆ ببانە یا ئێکێ دا باور بکەن کو ئەڤ مرۆڤنە ژ مەرگەهێ ژ جەم رێبەرێت ئێزدیا ومیری هاتینە. ڤێجا ئێزدیا ژی قەدرێ وان قەولزان ومێڤانا دگرت و

ل دوورێ دهـاتنـە ئێك پشتی نیشانا میرێ ئێزدیا لجهم وان ددیت هەرهـۆسـا ئەو نیشـانە لبەر چاڤا دادنان وملەتی رێز وحـورمـەت وقـەدر لنیشـانـا میـرێ دادنا چاوا ئەم نهۆرێز وقـەدرێ ئالایـا وەلاتێ خۆدگرین ئەوژ ی هۆسا بوو، هەر چەند مخابن هندەك نفیسەڤانێت بیانی ب هەلە چۆینە کو دبێـژ ن ئێـزدی طاوسێت خۆدپەرێسن . ڤێجا ئەڤ نیشانە هەر هەفت مینـا وێنـەیێ بالنـدەیـانـە دشکلێ جوانتـرین تەیرایە کو تەیرێ طاوسە . . چیرۆکا ڤان طاوسا و کەڤنی‌یا وان گەلـەکـە کوور ودرێـژە خۆ هنـدەك عیـراقیێت کەڤن نەخـاسمە شوێنەوارێت بابلی وئاشوری ل حەضەر هاتینە دۆزین وێنـەیێ تەیـرطـاوس هەیـە کوئالایـا وان بووو سۆزەخانەیا عیراقێ ل شارێ بەغدایێ ئێل ژ وان ئالایێت حەضـەرێ یی چکـانـدی‌یە ووەلاتی‌یەك وێ سەربرەکێ پێش کێش ئالایا طاوسێ دکەت ب ئامادە بوونا مجێوری ودسـەر وانـرا شکلێ فریشتەیەکی ب چەنگ وباسکە یی راوستـایـە . . ڤێجا طاوسێت ئێزدیا سەردکێشنە وی دەمی وێڤـەتـر هێـرڤـەتـر مرۆڤ نەشێت ب پشت راست وێ چەنـدێ ڤەبـرت لێ چاوا بتن.ئێزدی دبێژ ن ئەڤ نیشانێت طاوسێت مە گەلـەك دکـەڤنن و ل درێـژ یـا مێـژ ووێدا چەندەها کارەسات وشەلاندن وڤەبراندن ب سەرێ ئێزدیا ونەخاسمە قەوالێن طاوسێ دگێریینن هاتی‌یە . . چەندەها چیا وگەلی ل شنگارێ وهندەك دەڤەرێد ب ناڤێ گەلی‌ێ قەوالا هاتینـە ب ناڤ کرنـە کوجەردە کەفتینـە درێکـا قەوالادا وقـەوال هاتینـە شەلانـدن لێ ئێزدیا هەولەکا زۆر دایـە کوبیـانی ڤان تاوسێـد وان نەبینن هەتا هۆلێ هاتی‌یە خەلکێ بیانی چەند جارا شەر بەرپا کرینە وڤیاینە ب چی رەنگی بت ب کۆتـەکی ونـە کۆتـەیێ ڤان طاوسـا ببینن وهنـدەك جارا ب دەست وانڤـە هاتی‌یە وقەت ژ بیرا ئێزدیا ناچت چاخێ پاشایێ ئۆصمانلی [عمر وهبی] فریق پاشا ل سالا 1982ز. فرمانا ئێزدیا راکری (1)

وهـەرهـەفت طاوس وچـەنـدەهـا نیشـانێد وان هەینە رێ ستـانـدین پشتی ئێـزدێ ڤەبـرانـدین نەخـاسـمە ئێـزدیێد مەرگـەهـا شێخـا وئەوژ ێ ڤەرەسیاین یێ دچیا وشکەفتادا ماین وطـاوس ونیشـانێـد وان برنـە مۆزەخـانا عەسکەری ل بەغـدایێ هۆسـا ئێـزدی دلشکـەستی وشـەپـرزە بوون وسـەرێـد رێکـا لبـەر وان بەرزە بوون هەتا پاشایەکی دی ب ناڤێ (سلێمان نەزیف پاشا ) ل سالا 1895ز. دبێژ ن یی‌کورد بوو دەیکا وی ئێزدی بووژ ئێلا خالتی‌یا بوو-(2) سلێمـان نەزیف پاشـا هاتـە ئێسفنێ وچۆبەعـەدرێ- میرگەها ئێزدیا - وچۆ لالشێ من ب خۆژچەند پیرەمێر و پیرەژنێد

**لاپەرە (228)**

**1)برێنە (الیزیدیە سەعید دیوەچی)**

**2) برێنـە (امـارة بهـدینـان الکردیة) لاپەرە (98) ژدانانا صەدیق دەملوجی**

ئێسفنی‌یا بهیستی‌یە (1) چاوا هاتە ئێسفنێ وڤیا دلێ ئێزدیا بکـرت وگـۆت : وە چی دڤێت؟ چی تشتێ وە، مالی وە، چوێ؟. گۆتنێ بەس تو نیشـان وطـاوسێـد مە ب زڤرینەڤە . . ئەوچۆبەغدایێ ونیشان وطاوسێد ئێزدیا ئینان ، دبێژ ن هنـدەك تشت ژ ێ دکێم بوون ، سلێمـان نەزیف پاشا ل رۆژا (21) مەهـا شبـاتێ ل سالا 1895ز. (2) هاتـە ئێسفنێ ڤـە وچـادرێـد عەسـکـەرێ خۆل بێـدەرێد رۆژئاڤای گوندی ڤەدان وهاتە نك بابێ شێخ وجوابا میرێ شێخـا (عـەلی بەگێ) هنارت، وگۆت : وەرن ئەڤە نیشان وطاوسێد وە .

**(1) ئێك ژوان پیرەمێرا پیر مەرعان کو مجێورێ ئێسفنێ بووی ب خۆ دیتبـوو چاخێ سلێمـان نەزیف پاشـا هاتی‌یـە ئێسفنێ وهـەر جار دکرە حکیات. مخابن بەری دوو سالا پیـر مەرعـان عەمـرێ خودێ کر لێ‌خدر بتانا کو هێشتـای ساغـە ژیێ وی ژ صەد [illegible] سالا وێ بۆری دیسان بەحسا وێ چەندێ دکر**

**(2) هەتـا نوکـە ژی ئێـزدی، نەخـاسمە یێت ئێسفنێ، ل رۆژا (21) سبـاتێ هەر سال جەژنـا نیشـانـا دکـەت ب بۆنـا ڤەگـەراندنا نیشان وطاوسێد ئێزدیا ل وێ رۆژێ**

ئێزديـا ژ ى هنـدى كەيفـا وان هات هەرمـال وسـەربرەك كۆشت وتـەبلى يـەكـە گرارێ برنە بن چادرێد عەسكەرێ سلێمـان پاشـا ئەوى ژ ى ئەمر كربوو كوچووزعەسكەرێ وى نەئێتـە ناڤ گونـدى چونكـە دزانى چاڤێ ئێـزديـا ب عەسكـەرێ ئۆصمـانلى رانـابت سبـەيكێ هەر مالەك وجـۆ تەبلى يێـد خۆيێد ڤالا بينت ژگۆتنا داپيرا من وباپيرێ من، خۆتوبێـژ ى كەفچكێ ئێكى، تەبلى يـا ئێكى بچت ئەو نەبـوو هەچكو نە عەسكەرێ رۆمێ ئۆصمانلى بوو. .

سلێمـان نەزيف پاشـا گۆ: برێنن چى كێمـە ژنيشـان وطـاوسێـد وە؟ چى نەى كێمـە؟ بێـژنـە من عەلى بەگێ وئـەختيـارێ مەرگـەهێ بخـۆ گۆتن ڤى جواميـرى گەلەك قەنجى ب مەكـر ئەم بترسـەرێ وى گێـژ ناكـەين ئانكـو ل رووێ وان نەهات بێژ ن سێ طاوسێدمە وهندەك نيشان وێ دمـاين ئەوى ژ ى ديـارە هەر هنـد د مۆزەخـانێ دا ديتبـوون . . لێ هەتـا نهـۆژ ى ئەم ژسـالـۆغێـد وان سێ طاوسـا دبێ خەبـەرين سالا 1972ز. دكتۆرەكى ئەلمان وێنـەيێ ئێكێ ژ وان طاوسا كويىَ د مۆزەخانەكا ئەلمانى دا وچيـرۆكـا ديتنـا وێ وفرۆتنا وێ ژمنرا نڤيسى ووێنەك لبەر گرتبـوو، ئەوژ ى ژمنـرا شانـد . . دڤـان دووسـەد سالێد بۆرى دا نەخـاسمـە لهـەردوو فرمانێد دژ واريا ميرێ كۆرد سالا 1832ز. ويـا فريق (عـومـەر وەهبى) پاشـا لسـالا 1892ز. ئێـزدى هند كوڤى ودوور پارێز بوون وحەدوسە تێـد خۆب دزيڤـە دكـرن خەلكێ دۆروبـەرى وان وهەتا بيـانى ورۆژهلاناسا ژ ى گەلەك بەئەشق ڤيان حەدوسەتێد وان بزانن ئەخـاسمـە ئالا وطـاوسێد وان ببينن، لێ ئێزديا نەدهێلا هەتا هۆلێ هات بووە جهێ شانازيێ هەكە ئێكى بيـانى سالـۆغـا تشتـەكێ ئێزديا زانى يا ڤێجا دبينين ئێكى وەكى (لايـەرد)ى دبێـژت . . سەمايا ئۆلا ئێزديا دگەلى ێ لاشێ پرسلف وهەيبەت وسەرسامى يە (1).

دەمـەلـوجى دبێژت: ئەز يەكەم كەسم ژخەلكێ نەى ئێـزدى سەمـايـا وان من ديت بت . . ئەوژ ى پشتـى دەستوورى ژميرێ ئێزديا خواستى هندەك وێنەيێد خەيالى ژ ئاليێـد (طـاوسێـد) ئێـزديـارا سازكـرينـە ودكتێبێد خۆدا بەلاڤكـرينـە . . لێ هەتـا نهـۆژ ى ڤان نڤيسەڤانا عەسەيا ڤان نيشـان وئـالايـا ب دورستى نزانى يـە وحـەدوسـەتێـد ل طاوس گێـرانێ ل ناڤ گونـدێد ئێزديا تێنەكرن تەديتى يە ونەزانى يە . .

بەرى ئەز بەحـسـێ طاوس گێـرانێ بكـەم، كوَچاوا ميـرێ ئێـزديـا هەر طاوسـەك دگـەل دەستـەيـەكى قەوالا دهنارتە دەڤەرەكا ئێزدييد دبێژم: نهۆل طاوسا عەنزەل سالێ سێ جـارا لنـاڤ ئێزدييد عيراقێ - ژ بلى چيابێ شنگارێ - دگێـرينن وب شێـوەيـەكى سەربـەستى و سەرفـەرازى بێ ىئێك ئەكلەمەكەت يان

**1 - برێنـە كتێبـا [اليـزيـريـە بقايا دين قديم] لاپەرە ژدانا جورج حەبيب،**

ئالـۆزى ودل ئێشيا ژ وانرا پەيداكەت، هەرهۆسا سال ب سال بەلێ نەحـەمـوو سالا هنـدەك قەوال طاوس حەلەبێ ويـا خالتى يـا دبـەنـە ناڤ ئێـزدييد سوريا وتوركيا وطاوسا شنگـارێ ژ ى سالێ جارەكێ. ل گونـدێد جيابێ شنگارێ دگێـرينن. لێ طاوسـا مسقوبا هەوە سالا 1914ز. ناچتە ناڤ ئێزدييد ئەرمينيا چونكو ل پێ ى دستورێ وێدەر رێكێ نادەن ڤان تەرزە حەدوسـەتا بكەن وسەرهاتى يا ب سەرێ قەوالا هاتى چاخێ چۆينە وێدەر وەكى لسەر زمانێ قەوال [حسێن] هاتى وبۆدەمەلوجى ڤەگێراى دێ (خووندە ڤانێد هێژا نڤيسم . .

يا من ژ ئێـزديـا بهيستى بەرێ طاوسێد ئێزديا ل لاشێ دخـزنێ دكـرن، چاخێ زگـەرێ ڤەدگـەريان، لێ پشتى ميـرێد ئێزديا ل گوندێ بەعەدرێ ئاكنجى بووين ل وێدەر خزنـەت رەحمـان ئاڤـاكـرن وخانى ێ طاوسـا ل ئاڤـايـا خزنـەت رەحمـانـە . . هەكـە بەرێ سالێ جارەكێ هەر طاوسـەك ل دەڤـەرەكـا ئێـزدخـانێ دگێراندن، نهۆطاوسا عەنـزەل (ئێـزى) سالێ سێ جارا دگێـرينن پشتى جەژنـا سەريـالێ كودكـەڤتـە يەكـەم چارشەمبووا نيسانا شەرقى وجـارا دووێ پشتى وجـارا سێ ێ پشتى جەژنـا جەمـايێ طاوسا شنگارێ پشتى جەژنا خدر لياس ب چەند رۆژەكا،

هەمـا ڤیـان بچنـە ناڤ ئێـزدیا میرێ شێخا دهنێرتە پێ مەزنێ قەوالا كو ل گونـدێ بەحـزانێ دئاكنجینە وهێڤاری دەستكـەكـا سمـاقێ دنمینن وسبەیكێ طاوس . . تێرەگد وجـامێ ئێـزدی ب ئاڤـا سمـاقێ جوان دكـەن هەتـا ب برسـقت، ودهـەكبـا طاوس دكـەن كویە ژ هرییێ چێكـریـە وژ بەعـەدرێ دبـەنە بەحزانێ دگەلییێ ناوسكا دسەر بەحزانێرا سوار دكەن ودەف وشبابا لێ‌ددەن وقەول وبـەیت ودرۆزا دبێـژ ن وبـەحـزانی ب كچـك ومـەزنەڤە ب پیچكێـد پێخـواس تێنـە پێشیـا قەوالا ول طاوسێ زیـارەتی دبن وكـابـانی ژ ی ب طاوێـد بغـودێ تێتە پێشیا طاوس وپێكڤـە تێنـە ناڤ گونـدی وقەوال ل بەحزانێ دبنە مێڤـان . . . وشـەڤـا دی ل باشیكێ وبـاش تێنـە باسكێ شێخ كەندالی، موسەكا، موقبلێ ، مەحمودا ، مەهەتێ ، ماحـرەشـا، جەروانـا، ببتنـارێ، وبـاقـەسرێ وپاش ئێسڤنێ، ئێسیا ، جەراحییێ بن كەندی، لحفا قایدیا ، ناڤ دنـا ، گونـدێت بەربنی ، ملا چەپـەرا ولـدمـایكێ ل گوندێ بەعەدرێ كی ل گەل طاوس دگەرێت . .

1 ـ دەستـەكێ قەوالا ، هنـدەك دەفێ لێ ددەن وهنـدەك شبابێ ویەكی زانا وقەولزان وبدەڤ وزمان.

2 ـ نەقیب ، ژ بنـەمـالا پیرێد هاجیالە، ئەو طاوسێ سوار دكـەت وهـل دگرت و ل تەنشتا راستییا طاوس روودنێت سواركـر ن . . ئەو بنكێ طاوسێ پاش هەر جار گۆیكەكێ ل دمـایكـێ سەركێ طاوس مینـا تەیـرێ طاوس یە، سێ بالگیا دادنێتە بەر پالا طاوسێ ودوو بالگیا ل ڤی ئالی و دووا ل ئالییێ دی یێ طاوسێ

3 ـ سەر دەرێ كانییا سپی.

4 ـ سەردەرێ مالا شیخادی.

5 ـ وەكیلێ مالا میرا.

6 ـ قەهوەچییێ قەوالا.

چاوا قەوال دگـەرێن ول گونـدا چی دكـەن؟ . . بەری طاوس بێتـە گونـدەكی، پێشـرەو ب رۆژەكێ دووا دپێشیا قەوالادا دچتە گوندی بەراتا طاوسێ كو ژئاخا لالشێ وئافا كانیا سپییە ڤەسترابە ددەتە مجێورێ گوندی و دبێژتە گوندییا:

فلان رۆژ ێ قەوال مێڤـانێـد وەنـە . . ئێزدی ژ ی چەند ب ئەشق چاڤـەرێی وێ رۆژێنـە هەر مال وسـەربـرەك وا بەرهـەڤ كری، سبـەیكا قەوال بێن هەموو جلك وسەرێ خۆدشـۆن، وەكی لوولكـا پەمبـووی تێكـدا جلكێت وان دسپینە، سەربرێت خۆدكوژ ن ، دگروێن وهوور دكەن. هەر چاڤێ وان وێ ل رەخـا گونـدی . . هنـد دبینن یان گوهـداریـا گزیـرێ گونـدی دكەن، كو قەوال هاتن وەرنە پێشـیێ. قەوال ژ ی عەول تێنـە بەر خاسـێ گونـدی زیـارەتی دبن وهـەكبـا طاوسێ دادنێن وبێهنـا خۆتینن، چاڤـەرێی مجێـوری وگوندیانن . . هندی بێژ ی ئێكودوو گونـدی حەمـوو ب ژ ن ومێـرڤە ب كچ وكورڤە ب زارۆك ساڤـاڤـە حەموو تێنە بەر قوبێ ودووریزكی هەر ژ بەر قوبێ وهەتا گوندی ب رێز دبن قەوال درۆزێ لبەر قوبێ دبێژ ن ومەكبا طاوسێ یەدانایە قەوال دەف و شبابا لێ ددەن، ژ ن دهلهلینن قەوال ونـەقیب سەردەرێ كانییـا سپی ب رێز ئێكـۆ ئێكـۆ دناڤ كۆلانا مرۆڤارا دبۆرن وخەلك ل دوو وان طاوا بغـورێ كابـانییا مجێورێ گوندی وائینایە پێشیا وان گونـدی وێ رۆژ ێ هەمـوو پێخـواس دگـەرێن . . ئەو گونـدییـە هەكبـا طاوس دستـۆیێ خۆدكەت یێ طاوسێ ل مالا دبتـە مێڤـان وبتـر فتۆدای خۆلێك زێدە دكەن . . هەمـا قەوال گەهشتنە مالا لێ‌دبنە مێڤان دیسان درۆزێ د بێـژ ن وطـاوسێ ڤەدنێن ، وەكی بەری نوكـە من ب رێـز كری چاوا نەقـیب طاوسێ ڤەدنێت و ل تەنشت راستییـا ئالایا ئێزدخانێ روودنیت و لتەنشتا چەپی مەزنێ قەوالا . .

چرایێ كانیـا سپی ژ ی دبـەنەمالا بەری ڤێ گەرێ قۆناغە لێ ول وێـدەر گوری وهلدكـەن . . قەهـوە چییێ هەی دگەل قەوالا دگەرێت گوند ب گوند گوندی ژ ی دەست ژ حەمـوو شۆل و كارێت خۆبەرددەن ودەستە دەستە جارتێنە مال وجـار دزڤـرنە نك قەوالا فراڤینێ وشیڤێ ل مالێت خۆ ناخـۆن، بەلـكـو ل قۆنـاغێ دخـۆن ، بەلێ هەر مال وتەبلییەكە گرارێ وگۆشتی دئینتە بەر قەوالا وطاوس هەر

چەنــد مالخـوّیێ طاوس ل مالا وی دیسـان سەربـرەکـا
كوشتی وخوارنەكە زاڤ دكەن . .

ئەرێ قەوال بوّچی طاوسێ لنـاڤ گونـدێت ئێـزدیـا
دگێـرینن؟ هەر بوٚخێـرخركرنێ وەكی نوٚكە دڤان سالا دا؟
نەخێـر !! قەوال ونـەقـیب وسـەردەرێ كانی یا سپی
وسـەردەربێ مالا شیـخـادی، نوێنـەرێت رێبـەرێت
ئێزدیـانن . . دئێن ل حال وسەروبەرو دەستوداریێ ملەتی
دپـرسن، دبێـژ ن گەلی جوامێـرا حالێ وەچی یـە؟ خێـر
وشـەرێ وە دخلودانێ وە لەپـەژ ینـا وە یەچـاوایـە؟ خودێ
نەكەت هەكە هندەك لەپەژ ینا وە یەچاوایە؟ خودێ نەكەت
هەكە هندەك گوندی لێك كەفتبن وژێك دلمای بن، لڤێ
روٚژ ێ چوكین وكەرب نامینن هەمـوو دچنـە بەر طاوسێ و
لسەر خاترا مێڤانێن ئێزیوطاوس مەلەك لگەل ئێك دەنگ
ناكەن نەهەر ئەڤە بەلكو قەوال وئەو مێڤاننە بەهرا بترژ جارا
دلمـایـا پێك دئینن وهەر ئێكی بەراتەكێ (1) ددەنێ وئەو
دلماینە بەراتێت خوٚ

(1) بەرات : پچەكە ژ ئاخا لالشێ ب ئاڤاكانی‌یا دبێژنێ
بەرات سپی قەدسترێن وەكی مازیەكێ خرڤەدبت

پێـك دگهـوٚرن ئانكو پێك هاتن، وهەتا بەراتێت وان لنگ
ئێك بمینن كەس چوحەیفا لهەڤالێ خوٚ ناكەت وزیانا وی
ناكەت ، هەكـە هات ئەوژی كێم جارایە، پێك نەهاتن
بەراتا ب ئاشكرایی ڤەدگێریننەڤە ئانكو لێك كەفتنەڤە . .

پیـر عەلـی‌یێ مالا مجێـورێت ئێسڤنێ كوسەردەرێی
كانـی‌یـا سپی‌یـە ل لالش ودگـەل طاوسێ دگـەرێت
گوٚتی . . ل ڤان گەرێت ڤەوالا ، ب سەدا دلمای وگوندی
مەپێك ئینانە ودلێ وان لێك خوٚش كریە ب سەدا كێشە و
ئالوٚزییێت ژ ن ئینان ومەسەلێت هوّسا هاتینە سەرراستكرنە
ودەرێ زیـانێ گرتی‌یـە . . بەرێ هاتن وچـوٚن هوٚسا نەیە
تەنـا بوو ، ئێـزگـە ، تلفـزێـون وتلفـون نەبـوون قەوال
دگـەریـان چێ دەنگـوبـاسێ نووچی رووداووخـەبـەر
وسـالوٚغێت تەعل وشرین دبن چەنگێ وان دابوون، ئەڤە
نوێنـەرێت میـرێ ئێـزدیـانە هاتینە سەراملەتێ خوٚبدەن و
رێـكـا ئوٚل وئـاینی نیشـاملەتی بكـەن وڤەژ وێـرن .
خێـرخـوازیێ ، بەلاڤ كەن واخـوازی وهێڤییێت گوندی‌یا
بگـەهیننە مەرگەهێ لجەم رێبەرێت ملەتی ل لالشێ . .
عەسـرێ بەیتـا هێڤـاری دبێـژ ن ، هێڤـاری پشتی شیڤێ
دخـوٚن دروٚزا سفـرێ دبێـژ ن بشتی هنگی هەموو گوندی
ب كچـك ومـەزنڤە لدوٚرا مێڤانێت خوٚدرونشتینە، مجێور
، مختـار وكەتخوداییێت گوندی وریسپی دنێزیكن ولدوٚرا
وان ژ ی خوٚرت ولاوول پشـت وان ژ ن وكـچ وهـەكـە
حەوشێ رێ تێدا نەما دچنە سەربانی ژ ی . .

چی ئێـزدی‌یێ بێت عەولی ل طاوسێ زیارەتی دبت خوٚ
ب ئاڤـا كانی‌یـا سپی‌یـە موٚركـریـە ئالایـا ئێـزیـدخانێ‌یە
ولجـامێ ئێـزی زیـارەتی دبت وژنـووپـاش دچتە دەستێ
نەقیبی طاوسێ وسـەردەرێ كانی‌یا سپی وسەردەرێ مالا
شیـخـادی وقــەوالا ومجێــوری وهــەر چی‌یێ دوو ناڤ
ل جڤاتێ هەكە شێخ وهەكە پیر . . پاش پشتوپشت دچتە
وی جهی جهێ بڤێت لێ روونێت دسـەكنت هەتـا قەوال
بێـژتێ دوعایە ژنوو پاش دەستورە رونێت هەموو زەلامێت
گونـدی ب ڤی تەرزی پشتی هەموو زیارەتی دبن، جهێ
خوٚ ل جڤـانێ دگـرن مجێـورێ گونـدی رادبتـە ژ پێـرڤـە
ودەستـەكی لسـەر دەستێ دی دانێت وبێـژت . . بابێ
قەوال، ئەڤــە ئوونـن سەردەرییێت كانی‌یـا سپی ودەرێ
شیخـادی ونەقیبێ طاوسێ میرێ شێخا وبابێ شێخ ئوون
وێدهنـارتین سەروگـوهـا لـمـەبكـەن ول سەروبـەرێ مە
بپرسن، رێكـا ئوٚلێ ژمەرا ڤەژ وێرن ئەزب زمانێ گوندیا
وڤـان جوامێـرێت حازر دبێـژم ئوون گەلـەك ب خێرهاتن
لسـەرچـاڤـا هاتنـاوە خێـرو بەرەكـەتە ئەم ژ ی وێدهاتین
گوهــداریـا پەیڤـەكـە خێـرخـوازی‌یێ ، قەول وبـەیت و
قەسیـدێت مەدحـا ئێـزی وطـاوس مەلەك وخاسێت ئێزدیا
دكـەن ببهیسین مەزنێ قەوالا دێبێـژت . . ئوون تێكـدا
جوامێـرن، خودان مەعـریفـەتن لسـەرسـەرا ولسـەرچاڤا
كەرەمكە روونێ مجێور . . مجێور ژ جهێ خوٚرادبت وتێتە
نیڤەكا دیوانا بەرامبەرێ قەوالا وطاوسێ روودنێت، مەزنێ

قەوالا دێ بێـژت مجێـور مجێور دێ بێژت . . بەلێ بابێ قەوال دێ بێـژت بەلێ یا تە ل دنێ ، خودێ مەعریفەتا تەو حازرو گوهــدێـرا زێـدەبکـەت ، ژنـوو مەزنێ قەوالا دێ دەست ب ئاخفتنـاکەت دبێژنێ مسحابەت ، مسحابەت ئەوە رێکـا ئۆلێ ، دان و ستاندن ، شیرەت وپەیڤا ب خێر دێ بێژ ن هەر باسەکی ب سەبەقەکێ یان چەند سەبەقەکا ژقـەولـەکـا قەسیـدەکێ بەیتـەکـا ئێـزدیـا پشتـەڤان کەت ل دمـایکـا ووتارێ دێ هندەکا ژ قەول وبەیت ومسحابەتا نڤیسم دا بابەت باش رۆن بت .

دپێشێ دا قەوال دێ بێــژت مجێــور ، گەلی جوامێـرا تشتێ مەهەی قەول وقەسیدە وبەیتێت ئێزدیانن . مەئیمانە ژعلمە علمێ خودێ یە بەحرە نەسەر هەیە ونەبن هەیە ئەم ژی ئووشی چنین ل پرێــزێت جوامێــرا رەحمــە ل دای وبابێت وان جوامێرا بابچاکایێ ئەڤ قەول وقەسیدە ژمەرا هێلاین رێکا ئێزدیاتی یێ ژمەرا رۆشەنکری . . بەهرا بترژ بابـەتێت قەوال بڤێن چارەسـەرکـەن وەکی مەگـۆتی رێکا ئێـزدیـاتی یێ [ خودێ ناسی ، ستایشا هەر هەفت ملیاکەتا وخــاس بابچــاکێت ئێــزدیــا خۆپاراستن ژ دەرەوێ بێ بەختی یێ ودوور بوون ژکــۆتـەکی یێ وزۆرداریێ ومـرۆڤ نەی تەمــابت ، دڤێت خودان خێـربت نەی زگـرەش بت رۆژا ئاخـرەتێ ژ بیـرنەکەت ، مرن هەیە ول دوورا حەق و حســابــە تەرازووا حەقــی یێ وا هەی هەر ئێــك وکــارو عەمـەلێت خۆ لوێ رۆژ ێ نەکـەسێ کەسـان دبی نەپسێ پســان دبی ، قازی ب خۆجـابـار دبی . . پشتی بێهنەکە خۆشی مسحـابـەتـا بۆوان دبێژ یت و هەر بچەکێ مجێور دێ بێــژ یت بەلێ . . بابێ قەوال قەوال دێ بێــژ یت . . خودێ مەعریفەتا وحازراو گوهدێرا زێدە بکەت . .

هەتـا قەوال مسحـابـەتـا تەمـام نەکـەت چێ نابت کەس جگـارا بکێشیت یان ژی ئاڤێ ڤەخـۆت یا دلـوپا بکەت و بئاخفیت . . هەما قەوالی گۆت : ئەم دکێمین ، خودێ تەمـامـە رەحمـەل دایی و بابێت گوهداراو ئێزدێیت شەرق وشامێ و چی کەسەکێ خێرخوازژ مرۆڤاتیێ را . . هنگی دەستــوری هەیــە؟ یا شیفێ دئینن [یـاشیڤ : یا پێکهـاتی یـە ژ تەبلی یەکـا گراری لبـەر قەوالی ومجیوری دادنێن] پشێ یاشیڤێ درۆزا سفرێ دبێژ ن و مەزنێ قەوالا یان ئە مسحابەت دگۆتن خو ددەتە پاش دی دەف و شبابا ئینن و هەموو رابنە سەرپێ یاو قەوالێت دەف هە ئێك شبابا خۆپاك وسازکـەت پف دکـەتێ یێ دەفاژ ی دەفاخو ددەنە بەر ئاگری دا گەرم بت و باش گرەگر ژ یبێت هەموو هۆسا دراوستاینە قەوال دێ بێژتە مجێوری ئەڤە تو مختار ، فلان شێـخ [نـاڤێ هنـدەك ری سپی یـا دێ بێـژت] کەرەمکەن بخوازن چی قەولی چی قەسیدێ ژ وەرا بێژ ین؟

مجێور دێ بێژتە قەوالی خودان مەعریفەتی ، بەلێ ئەم وێ ل مالا فلان جوامیـری ـ ناڤێ یێ طاوس ل مالێ دێ بێژت ـ هەکە ب خێرا ئێزی وطاوس مەلەك ژمەرا بچەکێ مەدحا خودانێ ڤی جوامێری یان شێخ وپیریت وی بکەن . .

جارنە شوونا قەوال بێژتە مجێوری دێ بێژتە مالخۆیێ مالا طاوس لێ قۆناغ . .

دەف : چەنگ .

شباب : شمشال .

هەر خاسـەکی ئێـزدیـا چەنـد قەول وبـەیت لسـەر هەینە بەحسـا دەروێشی وخودێ ناسی یا وی دکەن . . قەوالێت شبـاب دگـەل پڤ دکـەنە شبابێت خۆ ودچنە ئاوازا قەولێ مجێــوری خواستی وقـەوالێت دەف دگـەل ئەوژ ی دەفـا دخـرخـرینن ودگـرگـرینن ودبتـە هۆل هۆلا گونـدیـا هۆلا ئێــزی یــە ، هۆلا طاوس مەلــەکــە ، هۆلا هەر هەفــت ملیـاکـەتـایـە . . ژ ن دهلهلینن باورکە مرۆڤ چەند ژ بیرا میسـالی یی دوور بت وبـاوری یێ ب ڤان مەسەلا نەئینت لێ هێشتـا موویێت لەشێ مرۆڤی زیق وگـرژ دبن وسـەرێ مرۆڤی دچتە دنیایەکا دی لوێ شەڤە رەشێ لبەر رۆناهی یا فتیـل وشـەمـالکـا خۆ لایـەردێ ئنگلیزی ل سالا 1846 ل جەمـایـا لالشێ ژ دوورڤـە گوهدرایا دەف وشبابا کربوو وشــاقی مابــوو(1) ب وێ چەنـدێ هەم قەولا ب دەف دبێژ ن وهەم ئاوازا وان ب شبابا ژ ی دبێژ ن بێهنەکە خۆش

هەتـا قەول خلاس دبت . . جارنـە بتر ژ قەولەكى دبێژ ن هەتا

**برێتە كتێبا [اليزيديه بقايا دين قديم] ژدانا جورج حەبيب**

نێــزيكى نيشــەڤ دمينن ژنــوو پاش دبێـژ ن : خودێ ى تەمـامـە، كەرەمكـەن روونێن و هەر كەسـەك ل جهێ خوّ روودنێت سەردەرێ شيخـادى دێبێــژت : كا ئاڤـەكێ [هــەرچىێ بدەتــە من ئاڤــەكێ، خودێ بدەتێ بەژ ن زراڤەكێ گەردەن گازەكێ، خودان ئيمانەكێ] سەد خوّزما وى خوّرتــى نەى زەوجـى جەركـێ ئاڤێ بەرى هنـگـى بەردەست كريت ئێكسەر ددەتە فەقيرێ سەردەرى ئەوژ ى جامێ ئێـزى دئينتەدەر وئاڤێ ژجەركى دجامى دكەت وب سەرجڤــاتێ ڤەدكـەت ئێكـوّ ئێكـوّ بەرێ نەقيبى وقـەوالا ومجێـورى وكەتخودايا ورىسپى يا وپاشى خوّرت و لاو و ژ ن و كێـژكـا ودبـەر را دبێژت [گەلى ئێزديا ؛ ئاڤا كانى يا سپى يـەە، جامێ ئێـزى يـە، چوو بەهـايێ عانـەكى دووا نى يــە . ] كەس ژ وێــدەر ناچت هەتــا ئاڤــا وى جامى ب سەرڤـە نەكـەن و هەرئێـك وخێـرا خوّعانـەكى پێـنج فلسـەكى دەرهــەمەكى ددەتە يێ جامێ ئێزى ب سەر وان ڤە دكەن .

پاش گونـدى، دەستـە دەستـە كتوّكتوّدچنە مالێت خوّ لێ هنـدەك پيـرەمێـر و دلخـوازێت سالـوّغ و خەبەرا هەتا دەرەنـگـى شەڤێ لجــەم قەوالا دمينن . پرســا ميــرىو بابێ‌شێـخ وملەتى ژ وان دكـەن بەحسـا دنيـايێ و هات و نەهــاتێ دكـەن . . ديسان هندەك لاو وخورت نوّبەدارێ ل مالا قوّناغا طاوسێ دگر ن .

هێشتـا روّژ نەهـلاتى بەيتا جندى دبێژ ن، بەيتا شێشمس دبێژ ن هەموو رادبنە ژ پێرڤە .

سبــەيكێ ديسـا هنـدەك مالێت گونـدى تێشتـا قەوالا دئـينن و هنــدەك گونـدىو حازرو قەوال تێشتێ دگــەل ئێك دخوّن وگوندى، مالخوّيێت مالا هەرئێك وچى خێر كەفتىيـە دلى يە دەتە مجێورێ گوندىو ئەوژ پيروانڤە وێ خێـــرى دسپێـرتـە مەزنێ قەوالا و دبێـژت گەلى نەقيب و سەردەرىو قەوالا ئەڤــە خێـــرا گونـدێ‌مـەيـە دروّزەكێ لێ‌بـكــەن و دلێ خوّلمــە خوّش كەن . ئەوژ ى دەست ب دوعايا دكەن :

[هێڤێنێ وە ژكــانيــا سپى بت خودێو طاوسى مەلــەك و خاسێت ئێـزديـا وە ژڤـەدا و بەلا دووربكـەت وئوّلا وەيەل جىبت، رووێ وەى سپى بت، دەولەتا وەيە دايم بت . .

پشتى هنگى بەرى نيڤروّ ديسا دەست ب قەول و

ب) سەبـارەت ناوەروّكێ بەيتـا جندى برێنە كتێبا ئێزدياتى ژچــابكــرييێت كوّرى زانيــارى كورد سالا 1979ز . و قەسيــدا دكــەن، پشتى لحــال و سەرو بەرێ گونـــدى پرسين وريّكـا ئێـزديـاتىێ ژ وانڤـەژ وارتين وگوهـداريـا هيڤىو داخــوازيێت گونــديـا كرين، خاتـريـاخـوّژ وان دخـوازن قەستـا گونـدەكى لاى دكـەن . گونـدى ژ ى ب كچك و مەزنڤە ب ژ ن و زەلامڤە هەتا رەخا گوندى رەوان دكـەن مجێـورێ كانى يـا سپى سبەيك زوورادبت جامێ ئێزى مال ب مال لناڤ گوندى دگێرينت نەكوحەرمەتەك، ئێكى ساڤـا، پيرەمێرەكى ژكيس وكەرەم كەفتى نەشيابت بێتە قوّناغێ . دائاڤێ ب جامى ب سەر ڤان كەسێت مايى ڤەكەت . .

هەوە سالا 1914ز جەنگــا جيهــانێ يائێكى ئێـزديـا طاوس نە هنـارتينـە ناڤ ئێـزدبێت ئورسـاتێ ـ ل ئەرمينيـا سوّڤيــەتى ـ ژ بەر كوميـرىيـا وێـدەر ئاستـەنگى دريّكـا قەوالێت ئێـزديـا دكـرن وئەوب چاڤـەكێ دى درێننە دنيا دارێ كيـژ وان دەستودار گونجاوترە ئەم ل پێ وێ‌چەندێ ناچين يا من بڤێت لهێــرە بنڤيسم ئەوچاڤپێكـەفتنـەيـە يا صەديق دەملوجى لروّژا 13 خزيــرانـا سالا 1930ز . ى لەگـەل قەوال حسێن كرى ودكتێبـا خوّدا ژلايـەرە 310 ـ هەتــا 314 ب عەرەبى بەلاڤكــرىێ ئەڤـە ژ ى دەڤێ وێ نڤيساندنێ‌يە ب كوردى :

[ژكـەڤنـدا ميـرێ شێخـا هەر سال طاوسەك دهنارتە ناڤ ئێـزدييێت ئورسـاتێ (1)دا خێـروخێـراتێ ژنـاڤ ئێزدييێت وێـدەر كوّم كەن وجارا دمـايكێ بەرى جەنگا جيهانێ ب مەددهـەكێ، دەستـەيـەكى قەوالا دگـەل طاوسەكێ هنارتە

# سەیرانگەی دورگەی بەغدا



● سەیرانگەی دورگەی بەغدا، یەکێکە لەو سەیرانگا گەورانەی سەرکردایەتی حزب و شۆڕشی بەخشیویەتی بە خێزانی شکۆداری عیراق و بەرپرسیاری پارێزگاری جوانیی و پاك و تەمیزی ورێك وپێکی بەرپرسیاری یەکی هاوکاریانەی نێوان ئەو کاربەدەستانەی بەرێوەبەرانی ئەو دورگەیەن و ئەو هاوولاتیانەن کە ئەوپەری پشوو بێ کاری لەناو ئەو کەژاوەو ئەو شوێنە جوانانەی ئەم دورگەیەدا بەسەری ئەبەن ..

● بەرێوەبەرایەتی سەیرانگای دورگەی بەغدا پێخۆشحاڵە بەوەی کە مژدە بدا بەوەی کە ئەچێتە تەقەزی ئاڵتونی . کەشوێنی حەوانەوەی لەدورگەی بەغدا بۆ کراوەتەوە و بریتیە لە دە هیلانەی بچوك و زلوانی و شوێنی گونجاو بۆ نوێنەرانی وەزارەت و رێکخراوە جەماوەری و پیشەیەکانی ئەمە لەگەڵ بوونی چەند هۆڵێکدا بۆ کۆبوونەوەو چەند گەرماوێکی هەڵمی و مەلەگەو یاری تێنس و چێشتخانەو گازینۆو شانۆکە هەموو شەوێکی پێنج شەممەو هەینی و یەك شەممەوان ئاهەنگی هونەری لەسەر ئەکرێ . ئەوانەی سەر لە دورگەی بەغدا ئەدەن فلیمی هەفتانە ئەبینن کە لەسەر شاشەی سینەمای جێی حەوانەوەی دورگەکە نیشان ئەدرێ

● یانەکەواز بۆ هەمووهاوولاتی یەکە ئەوانەی حەز لە یاری بولنگ ئەکەن سەر لە یانەی بۆڵنگ بدەن بۆ ئەوەی بەشداری ساڵانە بکەن و بە نرخیکی گونجاو بشەو یاری لەگەڵ تیپە جۆربەجۆرەکانا رێکخەن.

● لە شاری یاری یەکانی دورگەی بەغدا کاتێکی خۆشی لە دەزگاری رۆلەر کوستەر و کالیسۆ ئەنتیرایس و یاری جوانی منداڵانە بەسەربەرن و یادگاریکی جوانتان بۆ ئەمێنێتەوە.

● مەیدانی فراوان و سەوزی بۆ یاری تۆپی سەبەتەو تێنس و باڵە تێدایە.

● لەچێشتخانەی دورگەکەو چێشتخانەی خزمەتگوزاری خۆیی و چێشتخانەی ماسی وچێشتخانەی یانەی رووبار خواردنی ئەوپەری بەچێژی لێ بەو خواست و خوان لەسەر ئاوازی مۆسیقای شاعیری و خۆشی بای دجلە ئەبێ و کە لە هەموو لایەکەوە چوارئەوری دورگەی بەغدایان داوە.

● سەیرانگەی دورگەی بەغدا دورگەی هەموو عیراقی یەکی شکۆمەندە .. تەنیا رۆژی شەممەوان نەبێ ، ئەویش رۆژی پشووی ئەوانەیە کە لە دورگەکەدا کارئەکەن هەموو رۆژەکانی تری هەفتە دەرگا کراوەیە ..



روشنبيرى نوێ
مجلة ثقافية فصلية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والأعلام
بغداد

Roshinbiry Nwe
General Cultural Magazine
Issued by: Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and Information
Baghdad - Iraq

رئيس التحرير
مصلح الجلالى

سكرتير التحرير
مختار فائق

رقم الأيداع في المكتبة الوطنية ببغداد 112 لسنة 1979
مسجلة بدائرة البريد برقم 119

نرخى 200 فلسه
دار الحرية للطباعة - بغداد